# جواهر سنن الترمذي

بەکوردی



ئامادەکردنی

سیروان کاکە أحمد

وەرگێڕانی

ستافی پیت





پرۆژەی پیت

بۆ وەرگێڕانی سەرجەم کتێبەکانی فەرموودە




# جواهر سنن الترمذي

## بەکوردی



ئامادەکردنی: سیروان کاکە أحمد

وەرگێڕانی: ستافی پیت

هەڵەچن و ڕێنووس: بڕیار هێرۆیی

دیزاینی ناوەوە: بڕیار هێرۆیی

دیزاینی بەرگ: إخلاص دیزاین

چاپی یەکەم: ١٤٤٥ك - ٢٠٢٤ز

٥٠٠ لاپەڕە

٢٤ × ١٧ سم

بابەت: ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی (٢٩٦)ی ساڵی (٢٠٢٤)ی پێ دراوە









جواهر كتب الستة بەکوردی (٢)

# جواهر سنن الترمذي

## بەکوردی






ئامادەکردنی

**سیروان کاکە أحمد**

وەرگێڕانی

**ستافی پیت**


پێشکەش بێت
بە هەر کەسێک
هەوڵدەدات هاوەڵی
پێغەمبەر ﷺ بێت
لە بەهەشت



## سیفەتەکانی و شکۆ و گەورەیی ﷺ

ئەگەر هەر یەکێک لە ئێمە بەهۆی سیفەتێک یاخود دوو سیفەت و ڕەوشتی جوان ڕێز و پێگەیەک لە دڵی خەڵک پەیدا بکات، ئەو یەک دوو سیفەتە ڕێزداری بکات، ئایا بۆچوونت چۆن دەبێت بەرانبەر ڕێز و پێگە و گەورەیی پێغەمبەری خوا ﷺ، کە هەرچی سیفەتی شکۆ و مەزنی و گەورەیی هەیە، لە زاتی ئەودا کۆ بۆتەوە، وەک:

پلەوپایەی پەیام و پەیامبەری، خوللەت و مەحەببەت، پاڵفتەیی، شەوڕۆیی، مەقامی قورب، شەفاعەت، وەسیلە و فەزیلە، مەقامی مەحموود، بوڕاق، بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان، ڕەوانەکرانی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی، بەرنوێژیکردنی بۆ پێغەمبەران، شایەتی بۆ درانی لەلایەن پێغەمبەران و ئوممەتانیان، گەورەی هەموو وەچەی ئادەم، هەڵگری ئاڵای حەمد، ڕەوانەکرانی بەڕەحمەت بۆ هەموو جیهانییان، ڕازیکرانی لە قیامەت لەلایەن خواوە، حەوزی کەوسەر، نیعمەت و بەخشش بۆ تەواوکرانی[1]، چاوپۆشی لێکران و لێخۆشبوونی لەوەی پێشتر کردوویەتی و ئەوەیشی لە داهاتوودا دەیکات[2]، سینە فراوانکرانی[3]، ناو بەرزکرانەوە و شۆرەت پەیداکرانی، پشتیوانی لێکرانی بە فریشتەکان، حیکمەت و شەریعەت و فاتیحە و قورئان پێدرانی، صەڵاوات لەسەر درانی لەلایەن خوا و فریشتەکان، سوێندخواردن بە تەمەنی موبارەکی،



١ ئاماژەیە بۆ ئایەتی: {وَيُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ} يوسف: ٦.

٢ ئاماژەیە بۆ ئایەتی: {لِّيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ} الفتح: ٢.

٣ ئاماژەیە بۆ سوورەتی (إنشراح).

وەڵامدرانەوەی داواکانی، قسەکردنی لەگەڵ بێگیان و گیانداران، هەڵقوڵینی ئاو لە نێوان کەلێنی پەنجەکانی، مانگ بۆ شەق کرانی، سەرخرانی بەترس خرانە نێو دڵی دوژمنانی، سێبەر بۆ کرانی لەلایەن هەورەکانەوە، تەسبیحاتکردنی چەو و وردەبەرد لەنێو لەپی دەستە موبارەکەکانی، پاراستنی لە زیانپێگەیاندنی لەلایەن خەڵکەوە ... شکۆ و مەزنی و گەورەییەکەی لە ئاستێکە هیچ کەسێک ناتوانێت وەک ئەوەی شایستەیە ئاماژەیان پێ بکا و یەک لەدوای یەک باسیان بکات. بەدەر لەو خوایە تاکوو تەنهایەی  پێی بەخشیوە و فەزڵی لەگەڵ کردووە، هیچ مرۆڤێک ناتوانێت پەی بە خەسڵەتە مەزنەکانی ببات و بەئاسانی درکیان بکات.



# چەند ڕێنماییەکی پێویست بۆ خوێنەری خۆشەویست

خوێنەری بەڕێز:

١. کاتێك فەرموودەکانی نێو ئەم پەرتووکە دەخوێنیتەوە بەخێرایی بەسەریدا گوزەر مەکە و بچیە سەر خوێندنەوەی فەرموودەیەکی دیکە، وە بیر لە مانای فەرموودەکان بکەوە و لە کاتی تێنەگەیشتن یان ناڕوونییەك بگەڕێوە بۆ سەرچاوەکانی ڕوونکردنەوەی فەرموودە، چونکە فەرموودە هەیە مانای ناڕوونە لە شوێنی دیکە ڕوون کراوەتەوە، فەرموودە هەیە بەکورت و پوختی هاتووە لە شوێنێکی دیکە تەفصیلی پێ دراوە، کە ئەم کتێبەت خوێندەوە بەجوانی لەو قسانە تێدەگەیت.

٢. پاشان بزانە فەرموودەکان بەزۆری وەك شیفا و چارەسەر وان بۆ نەخۆش یان بۆ هەر کەسێك پێویستی بەو دەرمان و چارەسەرانە هەیە، بێگومان چارەسەریش دەبێت کەسێکی پسپۆڕ لەو بوارەدا بۆ کەسی پێویست دیاری بکات، ئەگەرنا بەکارهێنانی فەرموودەکان بەبێ ئاگاداربوون لە زانستە شەرعییەکان، یان بەبێ پرس و ڕاوبۆچوونی کەسانی شارەزا، لەوانەیە خاوەنەکەی تووشی هەڵە بکات و سەرەنجام تووشی پەشیمانی ببێتەوە لە هەندێك کردار و گوفتار کە ئەنجامی داون بەهۆی هەڵە تێگەیشتن لە فەرموودەکان.

٣. تکایە بە هیچ جۆرێك فەتوا و بۆچوونی خۆت لەسەر ڕواڵەتی فەرموودەکان دەرمەبڕە، چونکە دڵنیات دەکەینەوە، بەبێ هەبوونی بنچینەکی تۆکمە لە زانستی شەرعی و گەڕانەوە بۆ زانایانی فەرموودە تووشی هەڵەی گەورە دەبیت.

لەگەڵ ڕێزدا

ستافی پیت

# پێشەکی

بێگومان سوننەت وەك سەرچاوەی دووەمی شەریعەتی ئیسلام زۆر جێگای بایەخ و گرینگیپێدانی موسوڵمانانە، گەیشتن بە سەرچاوەکانی سوننەتیش کە لە سەرچاوە سەرەکییەکانی کتێبەکانی فەرمووده بەرجەستەیە، کارێکی ئاسان نییە، لە سۆنگەی هەستکردن بە بەرپرسیارییەتی و گرتنبەری ڕێگایەکی ئاسان بۆئەوەی موسوڵمانان لە هەر شوێنێکی دونیا بتوانن بەسانایی دەستیان بگات بە فەرموووەکانی خۆشەویستمان ﷺ و سوودی لێ وەربگرن و لە ژیانی ڕۆژانەیان کاری پێ بکەن، هەڵسام بە خوێندنەوە و کورتکردنەوەی هەر شەش کتێبی شەش زانا ناودارەکانی فەرمووده، بەڕێزان و پێشەوایانمان:

پێشەوا بوخاری و پێشەوا موسلیم و پێشەوا ئەبو داود و پێشەوا تیرمیزی و پێشەوا نەسائی و پێشەوا ئیبن ماجە (ڕەحمەتی خوای میهرەبانیان لەسەر بێت).

لەسەرخۆم کردە مەرج جگە لە فەرموودەی (صحيح) نەهێنم و تەنانەت خۆم پاراست لە فەرموودەی (حسن)یش، کە بێگومان لەلای زانایان کاری پێ دەکرێت (مقبولە)، بەڵام خۆپاراستنم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە نەکەومە نێو کێشە و ڕاجیایی زانایان لەسەر حوکمی زانایانی فەرموودەناس بۆ پلەی فەرموودەکە.

پاشان ناوم لێ نا (جواهر)، واتە: گەوهەرەکان، بۆ ئەوەی بواری ڕەخنە کەمتر ببێتەوە لە بەندە و لە کارەکەی، ئێمە بانگەشەی ئەوە ناکەین خوێندنەوەی هەر یەکێك لەو کتێبانە جێگرەوەی کتێبە بنەڕەتییەکە بێت، بەڵام دەتوانین بڵێین زۆرترین فەرموودەی (صحيح)ـی ناو ئەو کتێبانە دەرهێنراون بە شێوەیەك ئاسان بێت بۆ خوێندنەوە و لەبەرکردن و ئاسانکردنی دەستاودەست پێکردنی کتێبەکان لەنێو خەڵکدا.

ئەوەی توانراوە هەوڵ دراوە و کراوە، ئەوەی نەکراوە داواکارم بە پشتیوانی خوا لە چاپەکانی داهاتوو بە پێشنیاری دڵسۆزانەی موسوڵمانان بتوانین پڕۆژەکە باشتر و جوانتر بکەین و بەرەو پێشتری ببەین، کارێك بکەین شایستە بێت بە بێژە و پیت و وشە و ڕستانێك کە تێکهەڵکێشی هەناسەکانی ئەم زاتە پاکە موبارەکەن ﷺ.

لە کۆتاییدا دەمەوێت لە ناخی دڵمەوە سوپاس و پێزانینی خۆم ئاڕاستەی ستافی پڕۆژەی (پیت) بکەم بۆ ئەو هەوڵ و کۆششە بەردەوامەیان لە خزمەتکردن و سەرخستنی ئەم پڕۆژە موبارەکە و لە ناخەوە سوپاسی ئەو (محسن) و چاکەکار و سەربازە ونانەش دەکەم هاوکارمان بوون بۆ بەچاپگەیاندنی ئەم کتێبە ناوازانە و خوا بەباشترین شێوە پاداشتی هەمووومان بداتەوە و هەر خۆی وەرگری کردەوە چاکەکانە و پاداشتیش دەداتەوە، چونکە دڵنیاین کردەوەی باشی چاکەکاران زایە ناکات.



سیروان کاکە أحمد

هەولێر

٢٠٢٤\٢\٢ ز

# بەرنامەی کارکردنمان لەم پڕۆژەیە:

١. بۆ دەرهێنانی دەقی فەرموودەکان و ناونیشانەکان پشتمان بەستووە بە باشترین ئەو چاپ و نوسخانەی لەبەر دەست بوون.

٢. لە هەر شەش کتێب دەستکاری (کتاب) نەکراوە نە بە دەستکاریکردن و نە بە لابردن (حذف)، هەر پێشەوایەك لە نووسراوەکەی چەند (کتاب)ی وەك عینوان هێناوە دامانناوەتەوە وەك خۆی.

٣. سەرجەم فەرموودە (ضعیف) و (حسن)ەکانمان لابردوون، سەرباری لابردنی کۆی فەرموودە دووبارەکانی نێو کتێبەکان.

٤. هەر فەرموودەیەك (سبب ورود)ی لەگەڵ بووبێت هێناومانە، ئەمەش لەپێناو باشتر تێگەیشتن لە فەرموودەکە و زووتر گەیشتن بە مەبەستی گوترانەکەی یان ئەنجامدرانەکەی، جا فەرموودەکە (مرسل) بووبێت، یان (موقوف) بووبێت، یان (مرفوع).

٥. بۆ وەرگێڕانی کوردییەکە سوودمان بینیوە لە کۆی کتێبەکانی پڕۆژەی پیت، بەڵام بەهۆی دەستکاریکردنی زۆری وەرگێڕانەکەوە نەمانتوانی ناوی هیچ وەرگێڕێك بنووسین، بۆیە لێرەوە زۆر سوپاس و پێزانینیان ئاڕاستە دەکەین و ئەوانیش خاوەنی ئەم پاداشتە نەبڕاوەن (إن شاء الله).

٦. لە دەقی عەرەبیدا هەر فەرمایشتێکی پێغەمبەر ﷺ بە ڕەنگی سوور نووسراوە و خراوەتە نێو دوو جووت کەوانەی بچووکەوە - « » -، بەهەمان شێوە لە واتا کوردییەکەشیدا خراوەتە نێو دوو جووت کەوانەوە و هەر بە ڕەنگی ڕەش نووسراوە.

٧. لەنێو وەرگێڕانە کوردییەکەدا لە هەر شوێنێك پێویست بە ڕوونکردنەوەی کورتی وەرگێڕ بووبێت، لەنێو دوو کەوانەی - ( ) - ڕەشدا ڕوونکردنەوە و شەرح نووسراوە.

٨. لە هەندێك شوێن ڕوونكردنەوەی زیاتر پێویست بووە نووسراوە (تێبینی:) و لە خوارەوە ڕوونكردنەوەكەی نووسراوە.



# پوختەی ژیانی پێشەوا تیرمیزی رحمه الله

**ناسنامە:**

سوارچاکی ئیسلام، پارێزەری سوننەتی خۆشەویست ﷺ، خواناس و زاهید، عەللامەی سەردەمی زێڕین، کونیە و ناوی تەواوی: ئەبو عیسا، موحەممەدی کوڕی عیسای کوڕی سیوەڕەی کوڕی مووسای کوڕی زەححاکی سەلەمی تیرمیزییە.
پێشەوا تیرمیزی رحمه الله لە ساڵی (٢٠٩)ی کۆچی لەدایک بووە، لە گوندی (بوغ) کە سەر بە شارۆچکەی تیرمیز بووە، دەکەوێتە وڵاتی ئەفغانستان.
تیرمیز: بە سێ جۆر دەخوێنرێتەوە (تورمیز ـ تیرمیز ـ تەرمیز).



**پێگەیشتن و نەشونما و گەشت بۆ پەیداکردنی زانست:**

پێشەوا شافیعی رحمه الله دەربارەی گەشتکردن بۆ زانست و زانیاری بە جوانترین شێوە وەسفێکمان بۆ دەکات و دەڵێت:

تَغَرَّبْ عَنِ الأَوْطَانِ في طَلَبِ الْعُلى
وَسَافِرْ فَفِي الأَسْفَارِ خَمْسُ فَوَائِدِ
تَفَرُّجُ هَمّ، وَاكْتِسابُ مَعِيشَةٍ
وَعِلْمٌ، وَآدَابٌ، وَصُحْبَةُ مَاجِد

واتە: بڕۆ لە وڵات و شوێنی خۆت مەمێنە، گەشت بکە بۆ وڵاتان بۆ بەدەستهێنانی پێگەی بەرز، چونکە گەشت پێنج سوودی سەرەکی هەیە:

١. دڵتەنگی و غەمت نامێنێت.
٢. ماڵ و سامانت دەست دەکەوێت.
٣. فێردە بیت و زانست پەیدا دەکەیت.

٤. فێری دابونەریتی خەڵکی دیکە دەبیت.
٥. هاوڕێی چاک و بەسوودت دەست دەکەوێت.

**مامۆستاکانی:**

سەردەمی پێشەوا تیرمیزی ﷬ سەردەمی زانست بوو، هەر کەسێک ئەهلی فەرموودە بووایە دەچووە لای و فەرموودەی لێ وەردەگرت، ئەگەر هەرچەندە شوێنی ئەو کەسە دووریش بووایە، جا پێشەوا تیرمیزی ﷬ درێخی نەکرد، هەر زانایەک فەرموودەی لابووایە، دەچووە خزمەتیان و فەرموودەی لێ وەردەگرتن، بۆیە مامۆستایەکانی ئەوەندە زۆرن هەر خۆی دەزانێت، لە هەموویان بەناوبانگتر و گەورەتر ئەوانەن:

١. پێشەوا قوتەیبەی کوڕی سەعید.
٢. پێشەوا ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی.
٣. پێشەوا موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی بوخاری.
٤. پێشەوا موحەممەدی کوڕی عەمری بەڵخی.
٥. پێشەوا مەحمودی کوڕی غەیلان.
٦. پێشەوا ئیسماعیلی کوڕی مووسای فەزاری.
٧. پێشەوا ئەحمەدی کوڕی مەنیع.
٨. پێشەوا سوەیدی کوڕی نەسری مەڕوزی.
٩. پێشەوا ئەبو موسعەب ئەحمەدی کوڕی ئەبو بەکری زوهری مەدەنی.
١٠. پێشەوا ئیبڕاهیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی حاتیمی هوڕەوی.

هەروەها زۆرێکی دیکە لەوانەی فەرموودە و زانستە شەرعییەکانی لەلا خوێندوون ﷬.

**قوتابیەکانی:**

١. پێشەوا ئەبو بەکر ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی سەمەڕقەندی.
٢. پێشەوا ئەبو حامید ئەحمەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی داودی مەڕوزی.
٣. پێشەوا ئەحمەدی کوڕی یوسوفی نەسەفی.

٤. پێشەوا ئەسەدی کوڕی حەمدەوەیهی نەسەفی.
٥. پێشەوا حوسەینی کوڕی یوسوف.
٦. پێشەوا حەمادی کوڕی شاکیری وەڕاق.
٧. پێشەوا عەلی کوڕی عومەری کوڕی کەلسومی سەمەرقەندی.
هەروەها زۆرێکی دیکە لە قوتابییەکانی ﷺ.

**پەرتوکەکانی پێشەوا تیرمیزی ﷺ:**

پێشەوا تیرمیزی ﷺ پەرتوکەکانی زۆرن کە زانایان باسیان کردوون، هەندێکیان لەبن دەستمانن و هەندێکیش تەنها زانایان بینیویانە، بەڵام بە ئێمە نەگەیشتوون، ئەوانەی ماون ئەوانەن:

١. الجامع الصحيح، سونەنی تیرمیزی.
٢. الشمائل النبي ﷺ، بەناوبانگترین پەرتووک دەربارەی ئاکار و ڕەوشت و شێوەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ، پەرتووکێکە کە دەیخوێنیەوە، ئەوەندە بەتامە وا دەزانیت لەگەڵ هاوەڵان سەیری ئەو زاتە دەکەیت ﷺ.
٣. العلل الصغير، لە زانستی فەرموودە.
٤. العلل الكبير.
٥. الزهد، ئیبن نەدیم لە پەرتووکی (الفهرست) باسی کردووە.
٦. الأسماء والكنى.
٧. أسماء الصحابە، ئیبن کەسیر باسی دەکات کە پەرتووکی پێشەوا تیرمیزییە ﷺ.

**پێگەی سونەنەکەی لەلای زانایان:**

پێشەوا ئەبو عەلی مەنسوری کوڕی عەبدوڵڵای خالیدی، لە پێشەوا تیرمیزییەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، دەربارەی سونەنەکەی گوتوویەتی: ئەم پەرتووکەم دانا، پیشانی زانای حیجاز و عێراق و خوراسانم دا، هەموویان لێی ڕازی بوون، هەبوو دەیگوت: هەر کەسێک ئەو پەرتووکەی لەماڵدا هەبێت، وەک ئەوە وایە پێغەمبەرێکی لە ماڵدا بێت و قسەی بۆ بکات.

پێشەوا تاش کوبرا زادە دەڵێت: پێشەوا تیرمیزی ﷬ پەرتووکی زۆرن، لە هەموویان گرینگتر سونەنەکەیەتی، هەم لە ڕووی ڕیزبەندییەوە ڕێکوپێکە و دووبارەی کەمە، هەم شیکردنەوەی خۆی و بەراوردکردنی خۆی بۆ فەرموودە و سەنەدەکان هەیە، هەم صەحیح و زەعیف لەیەکدی جیا دەکاتەوە، ئەحکامی شەرعیشی لەخۆ گرتووە، جگە لەوەی زانستی پیاوناسی و عیلەلیش لەخۆ دەگرێت، هەر کەسێک ببینێت، دەزانێت چ کارێکی گەورەی کردووە.

پێشەوا ئەبو بەکر ئیبن ئەلعەڕەبی لە سەرەتای شەرحی سونەنەکەی ئیمامی تیرمیزیدا ﷬ دەڵێت: بزانن خوای گەورە دڵ و دەروونتان پڕ بکات لە نوور، کتێبەکەی پێشەوا بوخاری سەرچاوەی دووەمە، (موطأ)ـی پێشەوا مالیکیش یەکەمە، پەرتووکی وەک پێشەوا موسلیم و تیرمیزیش لەسەر ئەو پەرتووکانەی دیکە بونیاتنراون، هیچیشیان وەک پەرتووکەکەی پێشەوا ئەبو عیسای تیرمیزی نین، چونکە زۆر جوان بەش بەش کراوە، ئاسانە، زوو لە مەبەستەکەت دەگەیەنێت، چواردە زانستی فەرموودەی لەخۆ گرتووە:

١. شیکاری سەنەدی فەرموودە.

٢. دیاریکردنی صەحیح.

٣. دیاریکردنی لاواز.

٤. شێوازەکانی سەنەد و ناساندنی توڕوق.

٥. شایەتیدان و متمانەدان بە پیاوانی شیاوی سەنەد.

٦. دیاریکردنی لاوازی پیاوانی سەنەد.

٧. فرەناوی پیاوانی سەنەد و دۆزینەوەیان.

٨. دۆزینەوەی کونیەی پیاوانی سەنەد.

٩. دیاریکردنی سەنەدی پچڕاو (المنقطع).

١٠. دیاریکردنی سەنەدی نەپچڕاو (المتصل).

١١. ڕوونکردنەوەی کارکردن بە فەرموودە.

١٢. ڕوونکردنەوەی هۆکاری وازهێنان و کارنەکردن بە فەرموودەیەک.
١٣. ڕاجیایی زانایان لە وەرگرتن و وەرنەگرتنی فەرموودە.
١٤. وەرگرتنی حوکمی شەرعی لە فەرموودە.

**شەرحەکانی پەرتووکی سونەنی تیرمیزی ﷺ:**

١. عارضة الأحوذي في شرح الترمذي، پێشەوا ئیبن ئەلعەڕەبی مالیکی (ت: ٧٩٥هـ).
٢. قوت المغتذي على جامع الترمذي، پێشەوا جەلالەدینی سیوطی (ت: ٩١١هـ).
٣. العرف الشذي على جامع الترمذي، پێشەوا بەلقینی شافیعی (ت: ٨٠٥هـ).
٤. تحفة الأحوذي شرح جامع الترمذي، پێشەوا موحەممەد موباڕەکەفوری (ت: ١٣٥٥هـ).

لەگەڵ چەندێکی دیکە لە شەرحی گرینگ کە خاوەنەکانیان بەشێکیان کردووە و نەیانتوانیوە تەواوی بکەن.



**ستایشی زانایان بۆ پێشەوا تیرمیزی:**

ئیمامی سەمعانی دەڵێت: پێشەوای سەردەمی خۆی بوو، هاوشانی نەبوو.
ئەبو سەعد پێشەوا ئیدریسی دەڵێت: ئیمامی تیرمیزی ﷺ یەکێک بووە لەو ئیمامانەی کە لە زانستی فەرموودە زانایان شتیان لێ وەرگرتووە، پەرتووکی داناوە لەسەر فەرموودە و تاریخ و عیلەلی حەدیس، پیاوێکی زانا و لێهاتوو بووە.
ئیمامی حاکیم دەڵێت: گوێم لە عومەری کوڕی عەلک بوو دەیگوت: پێشەوا بوخاری وەفاتی کرد لە خوڕاسان کەسی لەدوای خۆی جێ نەهێشت وەک ئەبو عیسا، لە زانست و حیفز و تەقوا و خواپەرستی وەک ئەو، ئەوەندە گریا لە ترسی خوای گەورە تا چاوەکانی لەدەست دا، چەند ساڵ بەو جۆرە مایەوە.
پێشەوا ئیبن ئەسیر دەڵێت: پێشەوا تیرمیزی ﷺ ئیمام و حافیز بوو، چەندان دانراوی بەسوود و باشی هەیە، یەکێک لەوانە بریتییە لە (جامع الكبير).
هەروەها دەڵێت: یەکێک بووە لەو زانایانەی کە حافیز بوو لەنێو زانایان و ناوبانگی

هەبوو، لەڕووی فیقهیشەوە دەستێکی چاکی هەبووە، ئەو یەکێک بووە لە زانایانی فەرموودە لە سەردەمی خۆی.

پێشەوا ئیبن عەمادی حەنبەلی دەڵێت: پێشەوا تیرمیزی ﷬ دیار بوو لەنێو هەموو زانایانی هاوشانی خۆی، نیشانەیەک بوو لە نیشانەکانی خوای گەورە لە ئەزبەر (لەبەرکردن) و لە وردی.

حافیز و ئیمام ئەبو یەعلای قەزوینی دەڵێت: موحەممەدی کوڕی عیسا ﷬ زانایان کۆدەنگن لەسەری، خاوەنی پەرتووکە لە فەرموودە، خاوەنی بۆچوونی خۆی بووە لە جەرح و تەعدیل، ناوبانگی هەبووە لەنێو زانایان بە ئەمانەت و زانست.

**کۆچی دوایی ئیمام تیرمیزی ﷬:**

پاش ئەوەی پێشەوا تیرمیزی ﷬ خزمەتێکی شایستەی بە ئایینی ئیسلام بەگشتی و فەرموودەی خۆشەویست ﷺ بە تایبەتی کرد، خوای گەورە ئەمانەتەکەی لێ وەرگرتەوە، لە شارۆچکەی تیرمیز لە گوندەکەی خۆی (بوغ)، لە شەوی دووشەممە (١٣)ـی ڕەجەبی ساڵی (٢٧٩)ی کۆچی، لە تەمەنی حەفتا (٧٠) ساڵی کۆچی دوایی کرد.

خوای گەورە بە باشترین شێوە پاداشتی بداتەوە بۆ ئەو خزمەتەی کە پێشکەشی ئیسلام و موسوڵمانانی کرد.



بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَصَلَّى اللهُ عَلَى سَيِّدنَا مُحَمَّد وآلِهِ وَصَحْبهِ وَمُحِبِّيهِ

# أبْوَابُ الطَّهَارَةِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## كۆباسی پاك و خاوێنی له پێغەمبەری خواوە ﷺ



### بَابُ مَا جَاءَ لَا تُقْبَلُ صَلَاةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژێک بەبێ دەستنوێژ وەرناگیرێت

١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا تُقْبَلُ صَلَاةٌ بِغَيْرِ طُهُورٍ وَلَا صَدَقَةٌ مِنْ غُلُولٍ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هیچ نوێژێک وەرناگیرێت کە بەبێ دەستنوێژ ئەنجام درابێت، هیچ ماڵبەخشینێک وەرناگیرێت کە لە ماڵی دزراوی دەستکەوت (ی جەنگ) بێت».

### بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ مِفْتَاحَ الصَّلَاةِ الطُّهُور

### باسی ئەوەی هاتووە کە کلیلی نوێژ دەستنوێژە

٢. عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الطُّهُورُ، وَتَحْرِيمُهَا التَّكْبِيرُ،

وَتَحْلِيلُهَا التَّسْلِيمُ».

عەلی ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «کلیلی نوێژ دەستنوێژە، چوونە نێو نوێژیش بە گوتنی: (الله أكبر)ە، دەرچوون لە نوێژ بە سەلامدانەوەیە».

٣. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِفْتَاحُ الْجَنَّةِ الصَّلَاةُ، وَمِفْتَاحُ الصَّلَاةِ الْوُضُوءُ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر خوا ﷺ فەرموویەتی: «کلیلی بەهەشت نوێژکردنە، کلیلی نوێژیش دەستنوێژشوشتنە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي السِّوَاكِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سیواک



٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلَاةٍ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر قورس نەبووایە لەسەر ئوممەتەکەم، فەرمانم پێ دەکردن بە سیواککردن لە کاتی هەموو نوێژێك».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَخْلِيلِ اللِّحْيَةِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەست و پەنجەهێنان بەنێو ڕیشدا

٥. عَنْ حَسَّانَ بْنِ بِلَالٍ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ عَمَّارَ بْنَ يَاسِرٍ ﷺ تَوَضَّأَ فَخَلَّلَ لِحْيَتَهُ، فَقِيلَ لَهُ: أَوْ قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: أَتُخَلِّلُ لِحْيَتَكَ؟ قَالَ: وَمَا يَمْنَعُنِي؟ وَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُخَلِّلُ لِحْيَتَهُ.

حەسسانی کوڕی بیلال ﷺ دەڵێت: بینیم عەماری کوڕی یاسیر ﷺ دەستنوێژی دەشوشت، پەنجەی دەستی دەنێو ڕیشـی وەردەدا، جا پێی گوترا، یان گوتی: پێی گوتم: ئایا پەنجە بەنێو ڕیشتدا دەهێنیت و دەبەیت؟ گوتی: بۆ چ شتێک هەیە ڕێگریم لێ بکات؟ لە کاتێکدا من بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ پەنجەی بەنێو ڕیشیدا دەهێنا و دەیبرد.

٦. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُخَلِّلُ لِحْيَتَهُ.

عوسمانی کوڕی عەففان ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پەنجەی بەنێو ڕیشیدا دەهێنا (لە کاتی دەستنوێژشوشتن).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي مَسْحِ الرَّأْسِ أَنَّهُ يَبْدَأُ بِمُقَدَّمِ الرَّأْسِ إِلَى مُؤَخَّرِهِ



### باسی ئەوەی هاتووە کە مەسحکردن لە پێشی سەر دەست پێ دەکات بۆ دواوە

٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ، بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ، ثُمَّ ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا حَتَّى رَجَعَ إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ.

عەبدوڵڵای کوڕی زەید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ هەردوو دەستی بە سەری خۆیدا هێناوە، بە پێشەوەی سەری هەتا دواوەی برد، لە سەرەتا دەستی کرد بە پێشەوەی سەری، ئینجا هەردوو دەستەکانی بردەوە دواوەی هەتا پشت ملی، ئینجا هەردوو دەستی گەڕاندەوە ئەو شوێنەی کە لە سەرەتادا دەستی پێ کردبوو، ئینجا هەر دوو قاچەکانی شوشت.

## بَابُ مَسْحِ الْأُذُنَيْنِ ظَاهِرِهِمَا وَبَاطِنِهِمَا

### باسی دەستی تەڕهێنان بە هەردوو گوێچکەکان لای دەرەوە و نێوەوەیان

٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ، ظَاهِرِهِمَا وَبَاطِنِهِمَا.

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەستی تەڕی بە سەری خۆیدا هێناوە لەگەڵ هەردوو گوێچکەکانی، لای دەرەوەیان و نێوەوەیان.

## بَابُ فِي تَخْلِيلِ الْأَصَابِعِ

### باسێک دەربارەی پەنجەهێنان بەنێوان پەنجە (ی دەستەکان و پێیەکان)

٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَوَضَّأْتَ فَخَلِّلْ بَيْنَ أَصَابِعِ يَدَيْكَ وَرِجْلَيْكَ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر دەستنوێژت شوشت پەنجە بە نێوان پەنجەکانی هەر دوو دەست و هەر دوو قاچتدا بهێنە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْوُضُوءِ ثَلَاثًا ثَلَاثًا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی شۆردنی ئەندامەکان سێ جار سێ جار

١٠. عَنْ عَلِيٍّ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ تَوَضَّأَ ثَلَاثًا ثَلَاثًا.

عەلی ﵁ دەگێڕێتەوە: کە پێغەمبەر ﷺ ئەندامەکانی دەستنوێژی سێ جار سێ جار دەشوشت.

تێبینی:

شوشتنی ئەندامەکانی دەستنوێژ تەنها یەك جۆری نییە، پێغەمبەری خوا ﷺ جاری وا بووە یەك جاری شوشتووە، جاری وا بووە دوو جاری شوشتووە، جاری واش هەبووە سێ جاری شوشتووە.

## بَابُ فِي إِسْبَاغِ الْوُضُوءِ

## باسێك دەربارەی جوان دەستنوێژشوشتن

١١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى مَا يَمْحُو اللَّهُ بِهِ الخَطَايَا وَيَرْفَعُ بِهِ الدَّرَجَاتِ؟»، قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «إِسْبَاغُ الوُضُوءِ عَلَى المَكَارِهِ، وَكَثْرَةُ الخُطَا إِلَى المَسَاجِدِ، وَانْتِظَارُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الصَّلَاةِ، فَذَلِكُمُ الرِّبَاطُ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئایا ڕێنماییتان بکەم بۆ کارێك بەهۆیەوە خوا لە گوناهەکان دەسڕێتەوە و پلەکانیش بەرز دەکاتەوە؟»، گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: «دەستنوێژشوشتن لە کاتی سەغڵەتی، زۆر هەنگاونان بەرەو مزگەوت، چاوەڕوانبوونی نوێژ لەدوای نوێژ، ئا ئەوەیە سەنگەرگرتن و پاسەوانیکردن (بۆ خوای گەورە)».

## بَابُ مَا يُقَالُ بَعْدَ الوُضُوءِ

## باسی ئەو (زیکر)ەی دەگوترێت لەدوای دەستنوێژ

١٢. عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الوُضُوءَ ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ

وَرَسُولُهُ، اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنَ التَّوَّابِينَ، وَاجْعَلْنِي مِنَ الْمُتَطَهِّرِينَ، فُتِحَتْ لَهُ ثَمَانِيَةُ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ يَدْخُلُ مِنْ أَيِّهَا شَاءَ».

عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك دەستنوێژێکی جوان بشوات، پاشان گوتی: شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە شایەنی پەرستن بێت جگە لە خوا، خوا تاك و تەنهایە و بێهاوتایە، شایەتیش دەدەم کە موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە، خوایە بمگێڕە لە تەوبەکاران، بمگێڕە لە پاکبووەوان، هەر هەشت دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، لە هەر کامیانەوە ویستی لێ بێت، لەوێوە دەچێتە ژوورەوە».

## بَابُ الوُضُوءِ بِالمُدِّ

### باسی دەستنوێژشوشتن بە مستێک ئاو



١٣. عَنْ سَفِينَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَوَضَّأُ بِالمُدِّ، وَيَغْتَسِلُ بِالصَّاعِ.

سەفینە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی دەشوشت بە مستێک ئاو، خۆی دەشوشت بەئەندازەی ڕبەیەک (چوار مستە ئاو و هەندێک).

تێبینی:

پێشەوایان: شافیعی، ئەحمەد، ئیسحاق، گوتوویانە: واتای ئەم فەرموودەیە ئەوە ناگەیەنێت کە ئەندازەی بەکارهێنانی ئاو سنووردار بکرێت، کە نەکرێت لەمە زیاتر بێت، یاخو لەوە کەمتر بێت، با ئەو ئەندازەیە بێت کە بەش بکات، چونکە هەندێک لە زانایان لەژێر تێگەیشتن لەم فەرموودەیە، وای بۆ دەچن کە دەبێت ئەندازەی ئاوی دەستنوێژشوشتن مستێک بێت، خۆشوشتن صاعێک بێت (چوار مستە ئاو و هەندێک).

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّهُ يُصَلِّي الصَّلَوَاتِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چەند نوێژێك ئەنجام دەدرێت بە دەستنوێژێك

١٤. عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَوَضَّأُ لِكُلِّ صَلَاةٍ، فَلَمَّا كَانَ عَامُ الفَتْحِ صَلَّى الصَّلَوَاتِ كُلَّهَا بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ. فَقَالَ عُمَرُ: إِنَّكَ فَعَلْتَ شَيْئًا لَمْ تَكُنْ فَعَلْتَهُ، قَالَ: «عَمْدًا فَعَلْتُهُ».

سولەیمانی کوڕی بوڕەیدە، لە باوکیەوە ﵄ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی دەشوشت بۆ هەر نوێژێک (ی فەڕز)، جا کاتێک ساڵی فەتحی مەککە هات، ئەوکات هەموو نوێژەکانی بە یەک دەستنوێژەوە ئەنجام دا، مەسحی سەر خوففەکانیشی کرد، عومەر گوتی: (ئەی پێغەمبەری خوا) تۆ کارێکی وات کرد، قەت نەمبینیوە لەپێشدا ئەوەت کردبێت؟ فەرمووی: «بەئەنقەست وام کرد (بۆ شارەزابوونی خەڵک کە ئەوەش دەبێت)».



## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ المَاءَ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ

### باسی ئەوەی هاتووە کە هیچ شتێک ئاو پیس ناکات

١٥. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَتَتَوَضَّأُ مِنْ بِئْرِ بُضَاعَةَ، وَهِيَ بِئْرٌ يُلْقَى فِيهَا الحِيَضُ، وَلُحُومُ الكِلَابِ، وَالنَّتْنُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ المَاءَ طَهُورٌ لَا يُنَجِّسُهُ شَيْءٌ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێت: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا دەستنوێژ بگرین لە ئاوی بیری بوزاعە، (بیرێک بووە لە شاری مەدینەی پیرۆز)، کە بیرێک بوو شتی پیس فڕێ دەدرایە نێوی، وەک پەڕۆی بەخوێنی حەیز (ی ئافرەتان) و لاشەی سەگی تۆپیو و شتی بۆگەن؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بێگومان ئاو لە

بنەڕەتدا پاکە و هیچ شتێک پیسی ناکات».

## بَابُ التَّشْدِيدِ فِي الْبَوْلِ

## باسی هەڕەشەی توند دەربارەی (خۆپاکنەکردنەوە لە) میز

١٦. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ عَلَى قَبْرَيْنِ، فَقَالَ: «إِنَّهُمَا يُعَذَّبَانِ، وَمَا يُعَذَّبَانِ فِي كَبِيرٍ: أَمَّا هَذَا فَكَانَ لَا يَسْتَتِرُ مِنْ بَوْلِهِ، وَأَمَّا هَذَا فَكَانَ يَمْشِي بِالنَّمِيمَةِ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: جارێک پێغەمبەر ﷺ بەلای دوو گۆڕ تێپەڕ بوو، جا فەرمووی: «بەڕاستی هەردووکیان سزا دەدرێن، وا نەبێت سزادانیان بەهۆی تاوانی گەورە بووبێت، بەڵکوو ئەوەیان خۆی نەدەپاراست (پاک ڕانەدەگرت) لە میزی خۆی، ئەوەشیان لەنێو خەڵکیدا قسەی دەهێنا و دەبرد (بۆ تێکدانی نێوانیان)».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي نَضْحِ بَوْلِ الْغُلَامِ قَبْلَ أَنْ يُطْعَمَ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئاوپرژاندن بۆ میزی منداڵێکی کوڕ پێش ئەوەی خواردن بخوات

١٧. عَنْ أُمِّ قَيْسٍ بِنْتِ مِحْصَنٍ ﵂ قَالَتْ: دَخَلْتُ بِابْنٍ لِي عَلَى النَّبِيِّ ﷺ لَمْ يَأْكُلِ الطَّعَامَ فَبَالَ عَلَيْهِ فَدَعَا بِمَاءٍ فَرَشَّهُ عَلَيْهِ.

ئوم قەیسی کچی میحصەن ﵂ دەڵێت: کوڕێکی بچووکی خۆم برد بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە هێشتا خواردنی نەدەخوارد (شیرەخۆرە بوو)، منداڵەکەش میزی کرد بەسەر بەرگ و پۆشاکی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا داوای ئاوی کرد، پرژاندی بە شوێنی میزەکە لەسەر پۆشاکەکەی.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الوُضُوءِ مِنَ الرِّيحِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەستنوێژ شوشتنەوە بەهۆی (لێبەربوونی) با

١٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللهَ لا يَقْبَلُ صَلاَةَ أَحَدِكُمْ إِذَا أَحْدَثَ حَتَّى يَتَوَضَّأَ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «بەڕاستی خوا نوێژی هیچ کەسێک لە ئێوە وەرناگرێت ئەگەر دەستنوێژی بشکێت، هەتا دەستنوێژ دەشواتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي سُؤْرِ الكَلْبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەرماوەی سەگ

١٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «يُغْسَلُ الإِنَاءُ إِذَا وَلَغَ فِيهِ الكَلْبُ سَبْعَ مَرَّاتٍ: أُولَاهُنَّ أَوْ أُخْرَاهُنَّ بِالتُّرَابِ، وَإِذَا وَلَغَتْ فِيهِ الهِرَّةُ غُسِلَ مَرَّةً».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «قاپێك ئەگەر سەگ دەمی خستە نێوی، حەوت جار دەشۆردرێت، یەکەم جار، یان دوایین جار دەبێت بە گڵ بێت، ئەگەر پشیلە دەمی خستە نێو (قاپ و قاچاغ) یەك جار دەشۆردرێت».

## بَابُ المَسْحِ عَلَى الخُفَّيْنِ

### باسی مەسحکردن لەسەر خوففەکان

٢٠. عَنْ هَمَّامِ بْنِ الحَارِثِ قَالَ: بَالَ جَرِيرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنه ثُمَّ تَوَضَّأَ، وَمَسَحَ عَلَى

خُفَّيْهِ. فَقِيلَ لَهُ: أَتَفْعَلُ هَذَا؟ قَالَ: وَمَا يَمْنَعُنِي، وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُهُ.

هەمامی کوڕی حاریس دەڵێت: جەریری کوڕی عەبدوڵلا ﷛ میزی کرد، ئینجا دەستنوێژی شوشت، دەستی هێنا بەسەر خوففەکانیدا، پێی گوترا: ئایا وا دەکەیت؟ گوتی: بۆ چ شتێک هەیە لێم قەدەغە بکات، لە کاتێکدا بینیومە پێغەمبەری خوا ﷺ وای دەکرد.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي المَسْحِ عَلَى العِمَامَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی مەسحکردن لەسەر مێزەر

٢١. عَنْ ابْنِ المُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﷛ قَالَ: تَوَضَّأَ النَّبِيُّ ﷺ وَمَسَحَ عَلَى الخُفَّيْنِ وَالعِمَامَةِ.

ئیبن موغیرەی کوڕی شوعبە، لە باوکیەوە ﷛ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی شوشت، مەسحی کرد لەسەر خوففەکان و مێزەری سەری.

## بَابُ هَلْ تَنْقُضُ المَرْأَةُ شَعْرَهَا عِنْدَ الغُسْلِ؟

### باسی ئایا ئافرەت کەزیی قژی دەکاتەوە لە کاتی خۆشوشتن؟

٢٢. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﷝ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي امْرَأَةٌ أَشُدُّ ضَفْرَ رَأْسِي، أَفَأَنْقُضُهُ لِغُسْلِ الجَنَابَةِ؟ قَالَ: «لَا إِنَّمَا يَكْفِيكِ أَنْ تَحْثِي عَلَى رَأْسِكِ ثَلَاثَ حَثَيَاتٍ مِنْ مَاءٍ، ثُمَّ تُفِيضِي عَلَى سَائِرِ جَسَدِكِ المَاءَ، فَتَطْهُرِينَ».

ئوم سەلەمە ﷝ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، من ئافرەتێکم کەوا کەزیی قژی سەرم دەپێچمەوە، ئایا هەڵیوەشێنمەوە بۆ خۆشوشتنم لە لەشگرانی؟، فەرمووی: «نا، تەنیا ئەوەندەت بەسە سێ مشت ئاو بە سەرتدا بکەیت، ئینجا ئاو بەسەر هەموو

لاشەتدا بکە، کە ئەوەت کرد پاک دەبیتەوە».

## بَابُ فِي الوُضُوءِ بَعْدَ الغُسْلِ

### باسێک دەربارەی دەستنوێژ شوشتنەوە لەدوای خۆشوشتن

٢٣. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَا يَتَوَضَّأُ بَعْدَ الغُسْلِ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی نەدەشووشتەوە لەدوای خۆشوشتن.

تێبینی:

دایکمان عائیشە لە فەرموودەی دیکەدا درێژەی بەم بابەتە داوە و گوتوویەتی: خۆشەویستمان ﷺ لە کاتی خۆشوشتن دەستنوێژی دەشوشت وەك چۆن دەستنویژ بۆ نوێژ دەشۆردرێت، کەواتە: خوێنەر دەبێت ئاگادار بێت ئەو کەسەی دەیەوێت دوای خۆشوشتن نوێژ بکات، پێویستە لە کاتی خۆشوشتن دەستنوێژی شووشتبێت.



## بَابُ مَا جَاءَ إِذَا التَقَى الخِتَانَانِ وَجَبَ الغُسْلُ

### باسی ئەوەی هاتووە ئەگەر ئەندامی زاوزێ پێك گەیشتن خۆشوشتن پێویست دەبێت

٢٤. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِذَا جَاوَزَ الخِتَانُ الخِتَانَ وَجَبَ الغُسْلُ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر هاتوو ئەندامی زاوزێی نێرینە تێپەڕی دا لە ئەندامی زاوزێی مێیینە، ئەوە خۆشوشتن پێویست دەبێت».

## بَابٌ فِي الوُضُوءِ لِلْجُنُبِ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَنَامَ

### باسێک دەربارەی دەستنوێژشوشتنی لەشگران کە دەیەوێت بخەوێت

٢٥. **عَنْ عُمَرَ ﵁: أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ ﷺ أَيَنَامُ أَحَدُنَا وَهُوَ جُنُبٌ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِذَا تَوَضَّأَ».**

**عومەر ﵁ دەگێڕێتەوە: ئەو پرسیاری کردووە لە پێغەمبەر ﷺ ئایا دەکرێت کەسێکمان بخەوێت لە کاتێکدا لەشگرانە؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «بەڵێ، ئەگەر دەستنوێژی شوشتبێت».**

✎ تێبینی:

**وا باشە کەسی لەشگران یەکێك لەم دووکارە ئەنجام بدات، خۆی بشوات، یاخود دەستنوێژ بشوات، هیی دووەم لە کاتێکدا کە دەیەوێت خۆشوشتنەکەی دوا بخات بۆ کۆتایی شەو، دەستنوێژێك وەك چۆن بۆ نوێژ دەیشوات، بەڵام خەوتنی بەلەشگرانییەوە بەبێ ئەوەی هیچ یەکێك لەم دوو کارە بکات ناپەسندە.**



## بَابُ مَا جَاءَ فِي المَرْأَةِ تَرَى فِي المَنَامِ مِثْلَ مَا يَرَى الرَّجُلُ

### باسی ئەوەی ئافرەت ئەوە دەبینێت لە خەودا کە پیاو دەیبینێت

٢٦. **عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: جَاءَتْ أُمُّ سُلَيْمٍ بِنْتُ مِلْحَانَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ اللَّهَ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الحَقِّ، فَهَلْ عَلَى المَرْأَةِ -تَعْنِي غُسْلاً- إِذَا هِيَ رَأَتْ فِي المَنَامِ مِثْلَ مَا يَرَى الرَّجُلُ؟ قَالَ: «نَعَمْ، إِذَا هِيَ رَأَتِ المَاءَ فَلْتَغْتَسِلْ».**

**ئوم سەلەمە ﵂ دەڵێت: ئوم سولەیم کچی میلحان هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بێگومان خوا شەرم لە (گوتن و بیستنی) هەق ناکات، ئایا**

ئافرەت خۆشوشتنی لە سەر پێویستە ئەگەر هاتوو لە خەودا ئەوەی بینی کە پیاو دەیبینێت؟ (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «بەڵی، ئەگەر ئافرەتەکە ئاوی بینی، با خۆی بشوات».



# أَبْوَابُ الصَّلاةِ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ

## كۆباسی نوێژ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي مَوَاقِيتِ الصَّلَاةِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کاتەکانی نوێژ لە پێغەمبەرەوە ﷺ



٢٧. عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ، فَسَأَلَهُ عَنْ مَوَاقِيتِ الصَّلَاةِ؟ فَقَالَ: «أَقِمْ مَعَنَا إِنْ شَاءَ اللَّهُ»، فَأَمَرَ بِلَالًا فَأَقَامَ حِينَ طَلَعَ الفَجْرُ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ حِينَ زَالَتِ الشَّمْسُ، فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَقَامَ، فَصَلَّى العَصْرَ وَالشَّمْسُ بَيْضَاءُ مُرْتَفِعَةٌ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالمَغْرِبِ حِينَ وَقَعَ حَاجِبُ الشَّمْسِ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالعِشَاءِ فَأَقَامَ حِينَ غَابَ الشَّفَقُ، ثُمَّ أَمَرَهُ مِنَ الغَدِ فَنَوَّرَ بِالفَجْرِ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالظُّهْرِ، فَأَبْرَدَ وَأَنْعَمَ أَنْ يُبْرِدَ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالعَصْرِ فَأَقَامَ، وَالشَّمْسُ آخِرَ وَقْتِهَا فَوْقَ مَا كَانَتْ، ثُمَّ أَمَرَهُ فَأَخَّرَ المَغْرِبَ إِلَى قُبَيْلِ أَنْ يَغِيبَ الشَّفَقُ، ثُمَّ أَمَرَهُ بِالعِشَاءِ فَأَقَامَ حِينَ ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، ثُمَّ قَالَ: «أَيْنَ السَّائِلُ عَنْ مَوَاقِيتِ الصَّلَاةِ؟»، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَنَا، فَقَالَ: «مَوَاقِيتُ الصَّلَاةِ كَمَا بَيْنَ هَذَيْنِ».

سولەیانی کوڕی بوڕەیدە، لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پرسیاری کاتەکانی نوێژی لێ کرد؟ ئەویش فەرمووی:

«لەگەڵمان نوێژەکان بکە بە ویستی خوا (فێر دەبیت)»، کاتێک ڕووناکیی بەیانی دەرکەوت، فەرمانی بە بیلال کرد، ئەویش قامەتی کرد، پاشان کاتێک خۆر لایدا (لە ناوەندی ئاسمان)، فەرمانی پێ کرد بە قامەتکردن، جا نوێژی نیوەڕۆی کرد، پاشان فەرمانی کرد بە قامەتکردن (بۆ نوێژی عەسر)، نوێژی عەسری کرد لە کاتێکدا خۆر هێشتاکە ڕوون و بەرز بوو، پاشان فەرمانی کرد (بە قامەتکردن) بۆ مەغریب، کاتێک خۆر بەتەواوی ئاوا بوو (لە ئاسمان)، پاشان فەرمانی کرد (بە قامەتکردن) بۆ عیشا، جا قامەتی کرد کاتێک شەفەقی سوور بەتەواوی ئاوا بوو، پاشان بۆ ڕۆژی دواتر فەرمانی کرد (بە قامەتکردن بۆ نوێژی بەیانی)، کاتێک بەیانی ڕووناک بوویەوە، پاشان فەرمانی کرد بە (قامەتی) نیوەڕۆ، کاتێک فێنک بوو و فێنکبوونەوە درێژەی دا، پاشان فەرمانی کرد بە (قامەتکردنی) عەسر و قامەت کرا، لە کاتێکدا خۆر لە سەرووی دوا کاتەکانی خۆی بوو (بۆ ئاوابوون)، پاشان فەرمانی کرد بە دواخستنی مەغریب تا پێش ئاوابوونی سوورایی کەناری ئاسمان، پاشان فەرمانی کرد بە (قامەتکردن بۆ) عیشا و قامەتی کرد، لە کاتێکدا سێیەکی شەو بەسەر چووبوو، پاشان فەرمووی: «کوا ئەو کەسەی پرسیاری کرد دەربارەی کاتەکانی نوێژ؟»، پیاوەکە گوتی: من بووم، فەرمووی: «کاتەکانی نوێژ لەنێوان ئەو دوو کاتانەن».

تێبینی:

ڕۆژی یەکەم لە سەرەتای کاتی نوێژەکان نوێژی کرد، ڕۆژی دواتر لە کۆتایی کاتەکانی نوێژ نوێژی کرد، ئەمەش بۆ ئەوەی کەسی پرسیارکەر و هاوەڵان کات و ماوەی نێوان نوێژەکان و سەرەتا و کۆتایی هەر نوێژێک بزانن.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ النَّوْمِ قَبْلَ العِشَاءِ وَالسَّمَرِ بَعْدَهَا

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی خەوتن پێش عیشا و مانەوەی لەدوای عیشا

٢٨. عَنْ أَبِي بَرْزَةَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم يَكْرَهُ النَّوْمَ قَبْلَ العِشَاءِ، وَالحَدِيثَ بَعْدَهَا.

ئەبو بەرزە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ خەوتنی پێش نوێژی عیشای پێ ناپەسند بوو، هەروەها گفتوگۆکردن و مانەوەی شەوانیش (ی دوای نوێژی عیشا پێ باش نەبوو).

## بَابُ مَا جَاءَ مِنَ الرُّخْصَةِ فِي السَّمَرِ بَعْدَ العِشَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێگەدان بە شەونخونیکردن لەدوای عیشا

٢٩. عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَسْمُرُ مَعَ أَبِي بَكْرٍ فِي الأَمْرِ مِنْ أَمْرِ المُسْلِمِينَ وَأَنَا مَعَهُمَا.

عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ شەونخونیی دەکرد لەگەڵ ئەبو بەکر ﵁ (هەندێك جار) دەربارەی کاروبارەکانی موسوڵمانان، منیش لەگەڵیاندا بووم.



تێبینی:

ئەم فەرموودەیە بەڵگەی ئەوەی تێدایە کە مانەوەی شەوان لەدوای نوێژی عیشا ناپەسند نییە بۆ کارێکی پێویست جا بۆ بەرژەوەندیی گشتی بێت یاخود تاکی، بەتایبەت لەو ڕۆژگارە بەهۆی کۆمەڵێك هۆکاری وەك خوێندن و دەرسی منداڵان و هاتنی میوان و کۆمەڵێکی هۆکاری دیکە، خەوتن لەدوای عیشا ڕاستەوخۆ زۆر ئەستەمە، بۆیە دەکرێت لەدوای تەواوبوونی ئیش و پێداویستییەکان مرۆڤ ڕاستەوخۆ بخەوێت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْجِيلِ الصَّلَاةِ إِذَا أَخَّرَهَا الإِمَامُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژ بکرێت لە کاتی خۆی ئەگەر ئیمام دوای دەخست

٣٠. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أَبَا ذَرٍّ، أُمَرَاءُ يَكُونُونَ بَعْدِي يُمِيتُونَ

الصَّلَاةَ، فَصَلِّ الصَّلَاةَ لِوَقْتِهَا، فَإِنْ صُلِّيَتْ لِوَقْتِهَا كَانَتْ لَكَ نَافِلَةً، وَإِلَّا كُنْتَ قَدْ أَحْرَزْتَ صَلَاتَكَ».

**ئەبو زەڕ ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەی ئەبو زەڕ، لەدوای من جۆرە فەرمانڕەوایەک پەیدا دەبن نوێژەکان دەمرێنن (واتە: دوای دەخەن و لەکاتی خۆی نوێژەکان ئەنجام نادەن)، تۆ نوێژەکان لە کاتی خۆیان ئەنجام بدە، جا ئەگەر نوێژ لە کاتی خۆی کرا (تۆش بەهۆی جەماعەت دووبارەت کردەوە)، ئەوە بۆت بە سوننەت هەژمار دەکرێت، ئەگەر نوێژەکەشیان نەکرد، ئەوە تۆ ئەوکاتە نوێژی خۆت ئەنجام داوە بەتەواوی».**

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَنْسَى الصَّلَاةَ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێک نوێژی لەیاد کردبێت



٣١. **عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَسِيَ صَلَاةً فَلْيُصَلِّهَا إِذَا ذَكَرَهَا».**

**ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک نوێژێکی لەبیر چوو، ئەوە با هەر کاتێك بیری کەوتەوە ئەنجامی بدات».**

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الصَّلَاةِ بَعْدَ العَصْرِ وَبَعْدَ الفَجْرِ

## باسی ئەوەی هاتووە لە ناپەسندیی نوێژکردن<br>لەدوای نوێژی عەسر و دوای نوێژی بەیانی

٣٢. **عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: سَمِعْتُ غَيْرَ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ مِنْهُمْ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، وَكَانَ مِنْ أَحَبِّهِمْ إِلَيَّ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ الفَجْرِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَعَنِ الصَّلَاةِ بَعْدَ العَصْرِ حَتَّى تَغْرُبَ الشَّمْسُ.**

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: گوێبیستی زیاتر لە کەسێک بوومە لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، لەوانە: عومەری کوڕی خەتاب ﷺ، لە کاتێکدا خۆشەویسترینیان بوو لەلای من، کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژکردنی لەدوای نوێژی بەیانی قەدەغە کردووە هەتا خۆر دەردەکەوێت، هەروەها لەدوای نوێژی عەسر هەتا خۆر ئاوا دەبێت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ قَبْلَ المَغْرِبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژ (ی سوننەتی) پێش نوێژی مەغریب

٣٣.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مُغَفَّلٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «بَيْنَ كُلِّ أَذَانَيْنِ صَلَاةٌ لِمَنْ شَاءَ».

عەبدوڵڵای کوڕی موغەففەل ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «لە نێوان هەر دوو بانگێک (بانگ و قامەت) نوێژێکی سوننەت هەیە بۆ هەر کەسێك بیەوێت».

* وَقَدْ رُوِيَ عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُمْ كَانُوا يُصَلُّونَ قَبْلَ صَلَاةِ المَغْرِبِ رَكْعَتَيْنِ بَيْنَ الأَذَانِ وَالإِقَامَةِ. وقَالَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: إِنْ صَلَّاهُمَا فَحَسَنٌ وَهَذَا عِنْدَهُمَا عَلَى الِاسْتِحْبَابِ.

لە زیاتر لە یەکێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕدراوەتەوە کە ئەوان دوو ڕکات نوێژیان کردووە پێش نوێژی مەغریب لە نێوان بانگ و قامەتدا، (پێشەوایان) ئەحمەد و ئیسحاق گوتوویانە: ئەگەر ئەو دوو ڕکاتە بکرێت کارێکی باشە، ئەمە لەلای هەردووکیان بە پەسند دانراوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الجَمْعِ بَيْنَ الصَّلَاتَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کۆکردنەوەی دوو نوێژ

٣٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بَيْنَ الظُّهْرِ وَالعَصْرِ، وَبَيْنَ المَغْرِبِ وَالعِشَاءِ بِالمَدِينَةِ مِنْ غَيْرِ خَوْفٍ وَلَا مَطَرٍ. قَالَ: فَقِيلَ لِابْنِ عَبَّاسٍ: مَا أَرَادَ بِذَلِكَ؟ قَالَ: أَرَادَ أَنْ لَا يُحْرِجَ أُمَّتَهُ.

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆ و نوێژی عەسری کۆ کردەوە، هەروەها نوێژی مەغریب و نوێژی عیشای کۆکردەوە لە مەدینە بەبێ هەبوونی ترس (لە دوژمن) بەبێ بوونی باران، ڕاوی دەڵێت: بە ئیبن عەبباس گوترا: پێغەمبەری خوا ﷺ چ مەبەستێکی هەبوو لەو کارەیدا؟ گوتی: ویستی ئوممەتەکەی سەغڵەت نەکات (و پێیان بفەرموێت مۆڵەت هەیە بەبێ هیچ پاساوێکی بەهێز نوێژەکانتان کۆ بکەنەوە).



## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الخُرُوجِ مِنَ المَسْجِدِ بَعْدَ الأَذَانِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی دەرچوون لە مزگەوت لەدوای بانگدان

٣٥. عَنْ أَبِي الشَّعْثَاءِ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجَ رَجُلٌ مِنَ المَسْجِدِ بَعْدَ مَا أُذِّنَ فِيهِ بِالعَصْرِ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَمَّا هَذَا فَقَدْ عَصَى أَبَا القَاسِمِ ﷺ.

ئەبو شەعساء رضي الله عنه دەڵێت: کەسێک لە مزگەوت چووە دەرەوە دوای ئەوەی بانگ درا بۆ نوێژی عەسر، ئەبو هورەیرە رضي الله عنه گوتی: بێگومان ئەو کەسە سەرپێچی فەرمانی ئەبولقاسیمی ﷺ کرد.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الأَذَانِ فِي السَّفَرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بانگدان لە گەشتدا

٣٦. عَنْ مَالِكِ بْنِ الحُوَيْرِثِ ﵁ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَا وَابْنُ عَمٍّ لِي، فَقَالَ لَنَا: «إِذَا سَافَرْتُمَا فَأَذِّنَا وَأَقِيمَا، وَلْيَؤُمَّكُمَا أَكْبَرُكُمَا».

مەلیکی کوڕی حوەیریس ﵁ دەڵێت: من و ئامۆزایەکم بە سەردان چووینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، پێی فەرمووین: «ئەگەر سەفەرتان کرد بۆ نوێژەکان بانگ بدەن و قامەت بکەن، با بەتەمەنترینتان پێشنوێژی بکات».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الإِمَامَ ضَامِنٌ، وَالمُؤَذِّنَ مُؤْتَمَنٌ

### باسی ئەوەی هاتووە ئیمام دەستەبەرە و بانگبێژ ئەمیندارە



٣٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «الإِمَامُ ضَامِنٌ، وَالْمُؤَذِّنُ مُؤْتَمَنٌ، اللَّهُمَّ أَرْشِدِ الْأَئِمَّةَ وَاغْفِرْ لِلْمُؤَذِّنِينَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئیمام زەمانەتی نوێژەکەی لە ئەستۆیە (کە بەتەواوی بۆیان بکات، پارێزگاری لێ بکات و بزانێت چەند ڕکاتی کردووە، یاخود زەمانەتی دوعا و پاڕانەوە دەکات کە دوعاکە تەنها بۆ خۆی ناکات، بەڵکوو بۆ هەموو نوێژخوێنانیشی دەکات، گوتراوە: قوڕئانخوێندنی ئەم قوڕئانخوێنە بۆ ئەوانیشە)، وە بانگبێژیش ئەمیندارە (خەڵك بەهۆی بانگی ئەوەوە نوێژ دەکەن)، خوایە ڕێنمایی ئیمامەکان بکە، لە بانگبێژان خۆش بە».

## بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا أَذَّنَ الْمُؤَذِّنُ

### باسی ئەوەی دەگوترێت کاتێک بانگبێژ بانگی دا

٣٨. **عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ** رضي الله عنه: **عَنْ رَسُولِ اللَّهِ** ﷺ **قَالَ:** «مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: وَأَنَا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ».

**سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرکەسێک کاتێک گوێی لە بانگبێژ بوو بڵێت: وە منیش شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، هیچ هاوبەشێکی نییە، شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندە و پێغەمبەری خوایە، ڕازیم بەوەی خوا پەروەردگارم بێت، موحەممەد پێغەمبەرم بێت، ئیسلام ئایینم بێت، ئەوە خوا لە گوناهەکانی دەبوورێت».**



## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَنَّ الدُّعَاءَ لَا يُرَدُّ بَيْنَ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت ڕەت ناکرێتەوە

٣٩. **عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ** رضي الله عنه **قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ** ﷺ: «الدُّعَاءُ لَا يُرَدُّ بَيْنَ الْأَذَانِ وَالْإِقَامَةِ».

**ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دوعا و پاڕانەوەی نێوان بانگ و قامەت ڕەت ناکرێتەوە».**

## بَابٌ فِي فَضْلِ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسِ

### باسێک دەربارەی پێگە و گەورەیی پێنج نوێژەکان

٤٠. **عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ** رضي الله عنه: **أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ **قَالَ:** «الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمُعَةُ إِلَى

الجُمُعَةِ، كَفَّارَاتٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ، مَا لَمْ تُغْشَ الكَبَائِرُ».

ئەبو هوڕەیڕە ﷛ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نێوان پێنج نوێژە فەڕزەکان و ڕۆژی هەینی بۆ ڕۆژی هەینی، کەفارەتی (گوناهەکانی) نێوانیانن (بۆ موسوڵمان) بەو مەرجەی نزیکی گوناهە گەورەکان نەبێتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الجَمَاعَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشت و گەورەیی نوێژی بەکۆمەڵ

٤١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «صَلَاةُ الجَمَاعَةِ تَفْضُلُ عَلَى صَلَاةِ الرَّجُلِ وَحْدَهُ، بِسَبْعٍ وَعِشْرِينَ دَرَجَةً».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نوێژی بەکۆمەڵ چاکترە لە نوێژی کەسێک بەتەنیا بە بیست و حەوت پلە».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الجَمَاعَةِ فِي مَسْجِدٍ قَدْ صُلِّيَ فِيهِ مَرَّةً

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژی بەکۆمەڵ لە مزگەوتێک جارێک نوێژی کۆمەڵی تێدا کرابێت

٤٢. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ وَقَدْ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «أَيُّكُمْ يَتَّجِرُ عَلَى هَذَا؟»، فَقَامَ رَجُلٌ فَصَلَّى مَعَهُ.

ئەبو سەعید ﵁ دەڵێت: پیاوێک هاتە مزگەوت و پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی تەواو کردبوو، فەرمووی: «کێ بازرگانی دەکات لەگەڵ ئەم پیاوە (نوێژی لەگەڵ بکات و پاداشتی دەست کەوێت)»، پیاوێک هەڵسا و نوێژی لەگەڵ کرد.

وَهُوَ قَوْلُ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَغَيْرِهِمْ مِنَ التَّابِعِينَ، قَالُوا: لَا بَأْسَ أَنْ يُصَلِّيَ القَوْمُ جَمَاعَةً فِي مَسْجِدٍ قَدْ صَلَّى فِيهِ جَمَاعَةٌ.

ئەمە قسەی زیاتر لە یەکێکە لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ و کەسانی دیکەش لە شوێنکەوتووان، گوتوویانە: دروستە کەسانێک نوێژ بەکۆمەڵ بکەن لە مزگەوتێک کە جارێک نوێژی تێدا کرابێت (بۆ هەمان نوێژ).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ العِشَاءِ وَالفَجْرِ فِي الجَمَاعَةِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پلە و پێگەی نوێژی عیشا و بەیانی بەکۆمەڵ

٤٣. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ شَهِدَ العِشَاءَ فِي جَمَاعَةٍ كَانَ لَهُ قِيَامُ نِصْفِ لَيْلَةٍ، وَمَنْ صَلَّى العِشَاءَ وَالفَجْرَ فِي جَمَاعَةٍ كَانَ لَهُ كَقِيَامِ لَيْلَةٍ».

عوسمانی کوڕی عەففان رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک نوێژی عیشا بەکۆمەڵ بکات، پاداشتی هەڵسانەوە و شەونوێژی نیوەی شەوی بۆ دەنووسرێت، هەر کەسێک نوێژی عیشا و بەیانی بەکۆمەڵ بکات، پاداشتی هەڵسانەوە و شەونوێژی تەواوی شەوی بۆ دەنووسرێت».

## بَابُ مَا جَاءَ لِيَلِيَنِّي مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلَامِ وَالنُّهَى

## باسی ئەوەی هاتووە کەوا با کەسانێک لە دواوەم بوەستن کە خاوەن ژیرین لە ئێوە

٤٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لِيَلِيَنِّي مِنْكُمْ أُولُو الأَحْلَامِ وَالنُّهَى، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، وَلَا تَخْتَلِفُوا فَتَخْتَلِفَ قُلُوبُكُمْ، وَإِيَّاكُمْ وَهَيْشَاتِ الأَسْوَاقِ».

عەبدوڵلا ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «با ئەوانەتان کە پێگەیشتوو و ژیرترن لەدوای منەوە بووەستن، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان (واتە: لەو تایبەتمەندییە لە ئەوان نزیک بن)، ئەوجار ئەوانەی دوای ئەوان، ناڕێك مەبن (لە ڕیزەکانی نوێژدا)، چونکە ناکۆکی و ناڕێکی دەکەوێتە دڵەکانیشتان، ئاگادار بن دوور بن لە شێوەی هاوار و دەنگەدەنگی بازاڕەکان (کاتێک کە لەنێو مزگەوتن)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وەستان لەدوای ڕیزەوە بەتەنیایی بۆ نوێژ

٤٥. **عَنْ وَابِصَةَ بْنِ مَعْبَدٍ ﵁: أَنَّ رَجُلًا صَلَّى خَلْفَ الصَّفِّ وَحْدَهُ فَأَمَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ أَنْ يُعِيدَ الصَّلَاةَ.**

وابیصەی کوڕی مەعبەد ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک نوێژی کرد لەدوای ڕیزەکان بەتەنیایی، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێ کرد کە نوێژەکەی دووبارە بکاتەوە.



## بَابُ مَنْ أَحَقُّ بِالْإِمَامَةِ

### باسی ئەوە ئایا چ کەسێك شاییستەترە بۆ پێشنوێژی

٤٦. **عَنْ أَبَا مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيَّ ﵁ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:** «يَؤُمُّ الْقَوْمَ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ، فَإِنْ كَانُوا فِي الْقِرَاءَةِ سَوَاءً، فَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، فَإِنْ كَانُوا فِي السُّنَّةِ سَوَاءً، فَأَقْدَمُهُمْ هِجْرَةً، فَإِنْ كَانُوا فِي الْهِجْرَةِ سَوَاءً، فَأَكْبَرُهُمْ سِنًّا، وَلَا يُؤَمُّ الرَّجُلُ فِي سُلْطَانِهِ، وَلَا يُجْلَسُ عَلَى تَكْرِمَتِهِ فِي بَيْتِهِ إِلَّا بِإِذْنِهِ».

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەو کەسە پێشنوێژی بۆ خەڵکەکەی دەکات کە شارەزاترینە لە خوێندنەوەی قوڕئان

(یان بە مانا و خوێندنی قورئان)، ئەگەر لە جوان خوێندنی قورئانیشدا وەکوو یەک بوون، ئەوە کامیان لە سوننەت شارەزاترە (با ئەو پێش بکەوێت)، ئەگەر لە شارەزایی لە سوننەتیشدا وەکوو یەک بوون، ئەوە کامیان زووتر کۆچی کردووە (بۆ مەدینە، با ئەو پێش بکەوێت)، ئەگەر لە کۆچکردنیشدا وەکوو یەک بوون، با کامیان گەورەترە (ئەویان پێش بکەوێت)، با هیچ پیاوێک پێشنوێژی بۆ کەسێک نەکات کە خاوەن دەسەڵاتی ئەم شوێنەیە، هەروەها با لەو شوێنەی کە خاوەن ماڵ بۆخۆی لێی دادەنیشێت و تایبەتە بە خۆی، لێی دانەنیشێت، مەگەر کەسەکە مۆڵەتی پێ بدات».

* وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ، قَالُوا: أَحَقُّ النَّاسِ بِالإِمَامَةِ أَقْرَؤُهُمْ لِكِتَابِ اللَّهِ وَأَعْلَمُهُمْ بِالسُّنَّةِ، وَقَالُوا: صَاحِبُ المَنْزِلِ أَحَقُّ بِالإِمَامَةِ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا أَذِنَ صَاحِبُ المَنْزِلِ لِغَيْرِهِ فَلَا بَأْسَ أَنْ يُصَلِّيَ بِهِ. وَكَرِهَهُ بَعْضُهُمْ، وَقَالُوا: السُّنَّةُ أَنْ يُصَلِّيَ صَاحِبُ البَيْتِ، قَالَ أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ: فَإِذَا أَذِنَ فَأَرْجُو أَنَّ الإِذْنَ فِي الكُلِّ، وَلَمْ يَرَ بِهِ بَأْسًا إِذَا أَذِنَ لَهُ أَنْ يُصَلِّيَ بِهِ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان گوتوویانە: شیاوترین کەس بۆ پێشنوێژیکردن ئەو کەسەیە کە زاناترە بە قورئان و زاناترە بە سوننەت، گوتوویانە: خاوەن ماڵ شیاوترە بە پێشنوێژیکردن، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەگەر هاتوو خاوەن ماڵ ڕێگەی بە کەسی دیکە دا، ئەوە دەکرێت ئەو کەسە پێشنوێژییەکە بکات، هەندێکی دیکە لە زانایان بە ناپەسندیان داناوە، گوتوویانە: سوننەت ئەوەیە کە خاوەن ماڵ پێش نوێژییەکە بکات. پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل گوتوویەتی: جا ئەگەر خاوەن ماڵ ڕێگەی دا، ئومێدم وایە ڕێگەپێدانەکە بۆ گشتی بێت، وای بۆ نەچووە شتێکی ڕەتکراوە بێت ئەگەر هاتوو ڕێگەی پێ دا پێش نوێژی بۆ بکات.

## بَابُ مَا جَاءَ إِذَا أَمَّ أَحَدُكُمُ النَّاسَ فَلْيُخَفِّفْ

## باسی ئەوەی هاتووە کە پێشنوێژ دەبێت کە نوێژی بۆ خەڵك کرد نوێژەکە سووک بکات

٤٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَمَّ أَحَدُكُمُ النَّاسَ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ فِيهِمُ الصَّغِيرَ وَالكَبِيرَ، وَالضَّعِيفَ وَالمَرِيضَ، فَإِذَا صَلَّى وَحْدَهُ فَلْيُصَلِّ كَيْفَ شَاءَ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر کەسێک لە ئێوە پێشنوێژیی بۆ خەڵکی کرد با نوێژەکەی سووک و سانا بێت، چونکە لە نێویاندا منداڵی بچووک و کەسانی بەساڵاچوو هەیە، هەروەها کەسانی بێهێز و نەخۆش هەیە، جا ئەگەر نوێژی بەتەنیا کرد با نوێژەکەی بە دڵ و ویستی خۆی بێت (بۆ درێژکردنەوە)».



## بَابُ مَا يَقُولُ عِنْدَ افْتِتَاحِ الصَّلَاةِ

## باسی ئەوەی دەگوترێت لە کاتی دەستپێکردنی نوێژ

٤٨. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ بِاللَّيْلِ كَبَّرَ، ثُمَّ يَقُولُ: «سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، وَتَبَارَكَ اسْمُكَ، وَتَعَالَى جَدُّكَ، وَلَا إِلَهَ غَيْرُكَ»، ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا»، ثُمَّ يَقُولُ: «أَعُوذُ بِاللَّهِ السَّمِيعِ العَلِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، مِنْ هَمْزِهِ وَنَفْخِهِ وَنَفْثِهِ».

ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەڵێت: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هەستابایەوە بۆ نوێژکردن لە کاتی شەو (الله أکبر)ی دەکرد، ئینجا دەیفەرموو: «پاکی و ستایش بۆ تۆ ئەی خوایە، پیرۆزیی بۆ ناوەکەت، بەرزیی بۆ گەورەییت، هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە تۆ»، ئینجا دەیفەرموو: «اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيراً»، ئینجا دەیفەرموو: «پەنا

دەگرم بە خوای بیسەر و زانا لە شەیتانی نەفرەتلێکراو، لە خۆبەگەورەزانینی، لە فووتێکردنی، لە خراپە خستنە نێو دڵانی».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّهُ لَا صَلَاةَ إِلَّا بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ

### باسی ئەوەی هاتووە کە نوێژ وەرناگیرێت بەبێ خوێندنەوەی فاتیحە

٤٩. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا صَلَاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ».

عوبادەی کوڕی صامیت ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «نوێژی کەسێک دروست نییە ئەگەر سووڕەتی (فاتیحە)ی تێدا نەخوێنێت».

* وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ مِنْهُمْ: عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ، وَجَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ، وَعِمْرَانُ بْنُ حُصَيْنٍ، وَغَيْرُهُمْ، قَالُوا: لَا تُجْزِئُ صَلَاةٌ إِلَّا بِقِرَاءَةِ فَاتِحَةِ الكِتَابِ، وَبِهِ يَقُولُ ابْنُ المُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، لەوانە عومەری کوڕی خەتتاب، جابیری کوڕی عەبدوڵڵا، عیمرانی کوڕی حوصەین، جگە لەوانەش، کەسانی دیکەش گوتوویانە: نوێژ دروست نییە تەنیا بە خوێندنی سوڕەتی فاتیحە نەبێت، ئەم ڕایەیان هەیە: ئیبن موبارەک، شافیعی، ئەحمەد، ئیسحاق.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي وَضْعِ اليَمِينِ عَلَى الشِّمَالِ فِي الصَّلَاةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دانانی دەستی ڕاست لەسەر چەپ لە نوێژدا

٥٠. عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ هُلْبٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَؤُمُّنَا، فَيَأْخُذُ شِمَالَهُ بِيَمِينِهِ.

قەبیصەی کوڕی هولب، لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژیی بۆ دەکردین، جا دەستی چەپی بە دەستی ڕاستی دەگرت (ئەوساکە دەستی ڕاستی دەکەوتە سەر دەستی چەپی).

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَالتَّابِعِينَ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ، يَرَوْنَ أَنْ يَضَعَ الرَّجُلُ يَمِينَهُ عَلَى شِمَالِهِ فِي الصَّلَاةِ. وَرَأَى بَعْضُهُمْ أَنْ يَضَعَهُمَا فَوْقَ السُّرَّةِ، وَرَأَى بَعْضُهُمْ: أَنْ يَضَعَهُمَا تَحْتَ السُّرَّةِ، وَكُلُّ ذَلِكَ وَاسِعٌ عِنْدَهُمْ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و لە شوێنکەوتووان و ئەوانەی لەدوای ئەوانن، بۆچوونیان وایە کە کەسەکە لە نوێژدا دەستی ڕاستی لەسەر چەپی دابنێت، هەندێکیان وای بۆ دەچن دانانی لە سەرووی ناوک بێت، هەندێکیش وای بۆ دەچن دانانی لە ژێرەوەی ناوک بێت، بۆ گشت ئەوانە کارەکە بەرفراوانی تێدایە.



## بَابُ رَفْعِ اليَدَيْنِ عِنْدَ الرُّكُوعِ

## باسی بەرزکردنەوەی دەستەکان لە کاتی چوونە ڕکوع

٥١. عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ إِذَا افْتَتَحَ الصَّلَاةَ يَرْفَعُ يَدَيْهِ حَتَّى يُحَاذِيَ مَنْكِبَيْهِ، وَإِذَا رَكَعَ، وَإِذَا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ. وَزَادَ ابْنُ أَبِي عُمَرَ ﷺ فِي حَدِيثِهِ: وَكَانَ لَا يَرْفَعُ بَيْنَ السَّجْدَتَيْنِ.

سالیم، لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی ئەگەر دەستی کردبا بە نوێژکردن، دەستەکانی بەرز دەکردەوە تا ئاستی شانەکانی، هەروەها ئەگەر چووبایە ڕکووع، ئەگەر سەریشی بەرز کردبایەوە لە ڕکووع، ئیبن ئەبو عومەر ﷺ ئەوەی زیاد کردووە لە فەرموودەکەی: بەڵام لە هەستانەوەی نێوان سوجدەکان دەستی بەرز نەدەکردەوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْبِيحِ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گوتنی (سبحان الله) لە کاتی ڕکووع و سوجدە

٥٢. عَنْ حُذَيْفَةَ ﵁: أَنَّهُ صَلَّى مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، فَكَانَ يَقُولُ فِي رُكُوعِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ»، وَفِي سُجُودِهِ: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى»، وَمَا أَتَى عَلَى آيَةِ رَحْمَةٍ إِلَّا وَقَفَ وَسَأَلَ، وَمَا أَتَى عَلَى آيَةِ عَذَابٍ إِلَّا وَقَفَ وَتَعَوَّذَ.

حوزەیفە ﵁ دەگێڕێتەوە: ئەو نوێژی کردووە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ، جا لە کاتی ڕکووعیدا دەیفەرموو: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْعَظِيمِ»، لە کاتی سوجدەیدا دەیفەرموو: «سُبْحَانَ رَبِّيَ الْأَعْلَى»، لە نوێژدا هەر ئایەتێکی خوێندبا کە باسی بەزەیی و میهرەبانی بووایە، دەوەستا و داوای (بەزەیی و میهرەبانیی خوای) دەکرد، بەسەر هەر ئایەتێکی دیکە تێپەڕ ببووایە کە باسی سزا و ئازار بووایە، دەوەستا و پەنای (بە خوا) دەگرت (لە سزاکە).

٥٣. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْأَنْصَارِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُجْزِئُ صَلَاةٌ لَا يُقِيمُ فِيهَا الرَّجُلُ -يَعْنِي- صُلْبَهُ فِي الرُّكُوعِ وَالسُّجُودِ».

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نوێژی ئەو کەسە قبووڵ نییە کە پشتی ڕاست ناکاتەوە بەتەواوی، -لەدوای- لەدوای هەستانەوە لە ڕکووع و چوونە سوجدەدا».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي السُّجُودِ عَلَى الْجَبْهَةِ وَالْأَنْفِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سوجدەبردن لەسەر نێوچەوان و لووت

٥٤. عَنْ أَبِي حُمَيْدٍ السَّاعِدِيِّ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا سَجَدَ أَمْكَنَ أَنْفَهُ وَجَبْهَتَهُ

مِنَ الأَرْضِ، وَنَحَّى يَدَيْهِ عَنْ جَنْبَيْهِ، وَوَضَعَ كَفَّيْهِ حَذْوَ مَنْكِبَيْهِ.

ئەبو حومەیدی ساعیدی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر سوجدەی بردبایە، لووت و نێوچاوانی لەسەر زەوی دادەنا و جێگیری دەکرد بەتەواوی، هەردوو دەستەکانی لە خۆی دوور دەخستەوە و بەرانبەر هەردوو لاشانی دادەنا.

* وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ يَسْجُدَ الرَّجُلُ عَلَى جَبْهَتِهِ وَأَنْفِهِ، فَإِنْ سَجَدَ عَلَى جَبْهَتِهِ دُونَ أَنْفِهِ، فَقَالَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: يُجْزِئُهُ، وَقَالَ غَيْرُهُمْ: لَا يُجْزِئُهُ حَتَّى يَسْجُدَ عَلَى الجَبْهَةِ وَالأَنْفِ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان: کەوا کەسێک سوجدە دەبات لەسەر نێوچاوان و لووتی، (دەربارەی کەسێک) ئەگەر سوجدەی برد لەسەر نێوچاوانی، بەڵام لەسەر لووتی نەیبرد، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: نوێژەکەی دروستە، هەندێکی دیکە گوتوویانە: نوێژەکەی دروست نییە هەتا سوجدە نەبات لەسەر نێوچاوان و لووتی.

٥٥. عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: قُلْتُ لِلْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ: أَيْنَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَضَعُ وَجْهَهُ إِذَا سَجَدَ، فَقَالَ: بَيْنَ كَفَّيْهِ.

ئەبو ئیسحاق دەڵێت: بە بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ گوت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر سوجدەی بردبا نێوچاوانی لەکوێ دادەنا؟ گوتی: لە نێوان هەردوو لاشانەکانی (لەسەر زەوی).

* وَهُوَ الَّذِي اخْتَارَهُ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ تَكُونَ يَدَاهُ قَرِيباً مِنْ أُذُنَيْهِ.

هەندێک لە زانایان هەر ئەم ڕایەیان هەڵبژاردووە کە هەردوو دەستەکان نزیکی هەردوو گوێچکە بێت.

٥٦. عَنِ البَرَاءِ ﷺ قَالَ: كُنَّا إِذَا صَلَّيْنَا خَلْفَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَرَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ الرُّكُوعِ، لَمْ يَحْنِ رَجُلٌ مِنَّا ظَهْرَهُ حَتَّى يَسْجُدَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَنَسْجُدَ.

بەڕاء ﷺ دەڵێت: ئێمە کاتی خۆی ئەگەر نوێژمان لەدوای پێغەمبەری خوا ﷺ کردبایە، کاتێک سەری بەرز کردبایەوە لە ڕکووع، هیچ کەسێک لە ئێمە پشتی نەدەچەماندەوە هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ سوجدەی نەبردبا (پێشی نەدەکەوتین)، ئینجا سوجدەمان دەبرد.

* وَبِهِ يَقُولُ أَهْلُ العِلْمِ: إِنَّ مَنْ خَلْفَ الإِمَامِ إِنَّمَا يَتْبَعُونَ الإِمَامَ فِيمَا يَصْنَعُ لَا يَرْكَعُونَ إِلَّا بَعْدَ رُكُوعِهِ، وَلَا يَرْفَعُونَ إِلَّا بَعْدَ رَفْعِهِ، لَا نَعْلَمُ بَيْنَهُمْ فِي ذَلِكَ اخْتِلَافًا.

ئەمە قسەی زانایانە: ئەو کەسەی لەدوای ئیمامە، شوێنی ئیمام دەکەوێت لەو کارانەی کە دەیکات (لەنێو نوێژدا)، ناچنە ڕکووع تەنیا لەدوای چوونە ڕکووعی ئەو نەبێت، بەرز نابنەوە تەنیا لەدوای بەرزبوونەوەی ئەو نەبێت، لەو بابەتەدا هیچ جیاوازییەکمان نەبینیوە لە نێوان زانایان.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّشَهُّدِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێندنی تەحیات

٥٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: عَلَّمَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا قَعَدْنَا فِي الرَّكْعَتَيْنِ أَنْ نَقُولَ: «التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ، وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فێری کردین ئەگەر دانیشتین لەدوای دوو سوجدەکە (تەحیات خوێندن)، بڵێین: «هەرچی قەدر و ڕێزە چ گوفتار، چ کردار، هەرچی سەرچاوەی پاکی و خاوێنیشە، ئەوانە لە ڕاستیدا هەموویان شایستەی خوای پەروەردگارن، دروودی خوا لەسەر تۆ ئەی پێغەمبەر لەگەڵ ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا، درود و سەلام لەسەر ئێمەش و لەسەر هەموو

بەندە باشەکانی خوا، شایەتی و گەواهی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، وە شایەتی دەدەم کە موحەممەد بەندە و نێردراوی خوایە».

* وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ التَّابِعِينَ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ المُبَارَكِ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، لە شوێنکەوتووان، هەروەها ئەوە بۆچوونی سوفیانی سەوری و ئیبن موبارەک و ئەحمەد و ئیسحاقیشە (ئاماژەکردن بە پەنجە لە کاتی خوێندنی وشەی شایەتیدان).

٥٨. عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: مِنَ السُّنَّةِ أَنْ يُخْفِيَ التَّشَهُّدَ. وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ.

ئیبن مەسعوود رضي الله عنه دەڵێت: خوێندنی تەحیات بەبێ دەنگی لە سوننەتە، کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْلِيمِ فِي الصَّلَاةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی (چۆنیەتی) سەلامدانەوەی نێو نوێژ

٥٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ كَانَ يُسَلِّمُ عَنْ يَمِينِهِ، وَعَنْ يَسَارِهِ: «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ، السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ».

عەبدوڵڵا رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: سەلامی دەدایەوە بە لای ڕاست و بە لای چەپیدا، (دەیفەرموو:) «السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ)، (السَّلَامُ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَةُ اللَّهِ».

* وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ المُبَارَكِ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، لەدوای ئەوانیش، هەروەها ئەوە بۆچوونی سوفیانی سەوری و ئیبن موبارەک و ئەحمەد و ئیسحاقیشە.

## بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا سَلَّمَ

## باسی ئەوەی دەگوترێت لە دوای سەلامدانەوە

٦٠. **عَنْ عَائِشَةَ** رضي الله عنها **قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا سَلَّمَ لَا يَقْعُدُ إِلَّا مِقْدَارَ مَا يَقُولُ:** «اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلَامُ، وَمِنْكَ السَّلَامُ، تَبَارَكْتَ ذَا الْجَلَالِ وَالإِكْرَامِ».

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامی دەدایەوە تەنها بەئەندازەی ئەوەندە (بەرانبەر قیبلە) دادەنیشت کە بفەرموێت: «خوایە تۆ خۆت خاوەنی ئاشتی و هێمنی و ئاشتی هەر لە تۆوەیە، بەرز و پیرۆزیت خاوەنی شکۆ و ڕێزیت».



## بَابُ مَا يَقُولُ عِنْدَ دُخُولِهِ الْمَسْجِدِ

## باسی ئەوەی دەگوترێت لە کاتی هاتنە نێو مزگەوت

٦١. **عَنْ فَاطِمَةَ** رضي الله عنها **قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا دَخَلَ الْمَسْجِدَ صَلَّى عَلَى مُحَمَّدٍ وَسَلَّمَ، وَقَالَ:** «رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ»، **وَإِذَا خَرَجَ ﷺ، وَقَالَ:** «رَبِّ اغْفِرْ لِي ذُنُوبِي، وَافْتَحْ لِي أَبْوَابَ فَضْلِكَ».

فاتیمە رضي الله عنها دەڵێت: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ چووبایە نێو مزگەوت سەڵات و سەلامی لەسەر موحەممەد دەدا، ئینجا دەیفەرموو: «ئەی پەروەردگار لە گوناهەکانم خۆش بە، دەرگاکانی بەزەیی و میهرەبانیتم لێ بکەوە»، ئەگەریش دەرچووبایە (سەڵات و سەلامی لە سەر موحەممەد دەدا)، ئینجا دەیفەرموو: «ئەی پەروەردگار

لە گوناهەکانم خۆش بە، دەرگاکانی ڕێزی خۆتم لێ بکەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ إِذَا دَخَلَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە ئەگەر یەکێکتان هاتە مزگەوت با دوو ڕکات نوێژ بکات

٦٢. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: «إِذَا جَاءَ أَحَدُكُمُ المَسْجِدَ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ أَنْ يَجْلِسَ».

ئەبو قەتادە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان هاتە نێو مزگەوت، با دوو ڕکات نوێژ بکات پێش ئەوەی دابنیشێت».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَصْحَابِنَا: اسْتَحَبُّوا إِذَا دَخَلَ الرَّجُلُ المَسْجِدَ أَنْ لَا يَجْلِسَ حَتَّى يُصَلِّيَ رَكْعَتَيْنِ إِلَّا أَنْ يَكُونَ لَهُ عُذْرٌ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای هاوەڵانی ئێمە: بەپەسندیان داناوە ئەگەر هاتو کەسێک هاتە نێو مزگەوت دانەنیشێت هەتا دوو ڕکات نوێژ دەکات مەگەر بیانوویەکی هەبێت.

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الأَرْضَ كُلَّهَا مَسْجِدٌ إِلَّا المَقْبَرَةَ وَالحَمَّامَ

### باسی ئەوەی هاتووە کە هەموو زەوی شوێنی نوێژە جگە لە گۆڕستان و گەرماو

٦٣. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: «الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدٌ إِلَّا المَقْبَرَةَ وَالحَمَّامَ».

ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: «هەموو زەوی جێگای ئەنجامدانی نوێژە، جگە لە گۆڕستان و گەرماو».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ بُنْيَانِ المَسْجِدِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشت و گەورەیی دروستکردنی مزگەوت

٦٤. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ بَنَى لِلَّهِ مَسْجِدًا، بَنَى اللَّهُ لَهُ مِثْلَهُ فِي الجَنَّةِ».

عوسمانی کوڕی عەففان ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو، دەیفەرموو: «هەر کەسێک مزگەوتێک دروست بکات لەپێناو خوا، خوای گەورە لە شێوەی ئەوەی بۆ دروست دەکاتەوە لە بەهەشتدا».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ فِي مَسْجِدِ قُبَاءٍ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژکردن لە مزگەوتی قوباء



٦٥. عَنْ أُسَيْدَ بْنَ ظُهَيْرٍ الأَنْصَارِيَّ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الصَّلَاةُ فِي مَسْجِدِ قُبَاءٍ كَعُمْرَةٍ».

ئوسەیدی کوڕی زوهەیری ئەنصاری ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «نوێژکردن لە مزگەوتی قوباء (لە پاداشتدا) وەکوو ئەنجامدانی عومڕەیەکە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَيِّ المَسَاجِدِ أَفْضَلُ

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا (نوێژ لە) چ مزگەوتێک پاداشتی زیاترە

٦٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا خَيْرٌ مِنْ

أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ، إِلَّا المَسْجِدَ الحَرَامَ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نوێژێك لەو مزگەوتەی من چاکترە لە هەزار نوێژی مزگەوتەکانی دیکە جگە لە مزگەوتی حەرام».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي القُعُودِ فِي المَسْجِدِ وَانْتِظَارِ الصَّلَاةِ مِنَ الفَضْلِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی مانەوە لە مزگەوت و چاوەڕێکردنی نوێژ

٦٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَزَالُ أَحَدُكُمْ فِي صَلَاةٍ مَا دَامَ يَنْتَظِرُهَا، وَلَا تَزَالُ المَلَائِكَةُ تُصَلِّي عَلَى أَحَدِكُمْ مَا دَامَ فِي المَسْجِدِ، اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ارْحَمْهُ، مَا لَمْ يُحْدِثْ».



ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەردەوام بەندە لە کار و پاداشتی نوێژەکەیدایە مادام لەدوای نوێژ لە شوێنی خۆی بێت و چاوەڕێی نوێژی دواتر بکات، بەردەوام تا لە مزگەوتدا بێت فریشتەکان دوعای بۆ دەکەن و دەڵێن: ئەی خوایە لێی ببوورە، ئەی خوایە ڕەحمی پێ بکە، تا دەستنوێژی دەشکێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ إِلَى الرَّاحِلَةِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژکردن بەرەو لای ڕۆیشتنی سوارییەکە

٦٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى إِلَى بَعِيرِهِ (أَوْ رَاحِلَتِهِ)، وَكَانَ يُصَلِّي عَلَى رَاحِلَتِهِ حَيْثُ مَا تَوَجَّهَتْ بِهِ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ڕوو لە وشترەکەی، یان ڕوو لە

سوارییەکەی نوێژی دەکرد (وەک بەربەست بەکاری دەهێنا)، هەروەها لەسەر پشتی سوارییەکەی نوێژی دەکرد، جا بەرەو هەر لایەکی بردبایە. (ئەوە تەنیا بۆ نوێژە سوننەتەکان بووە).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ عِنْدَ النُّعَاسِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژکردن لە کاتی وەنەوزگرتن (خەوهاتن)

٦٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ وَهُوَ يُصَلِّي فَلْيَرْقُدْ حَتَّى يَذْهَبَ عَنْهُ النَّوْمُ، فَإِنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا صَلَّى وَهُوَ يَنْعَسُ، فَلَعَلَّهُ يَذْهَبُ لِيَسْتَغْفِرَ فَيَسُبَّ نَفْسَهُ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان نوێژی دەکرد و خەویشی دەهات، با پاڵ بکەوێت هەتا خەوەکەی دەڕەوێتەوە، چونکە کەسێکتان کاتێک نوێژ دەکات و وەنەوزیش دەیگرێت، لەوانەیە بەمەزندەی خۆی داوای لێخۆشبوون بکات، بەڵام جوێن بە خۆی بدات (کە بێئاگا دەبین نازانین چی دەڵێین!)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ زَارَ قَوْمًا فَلَا يُصَلِّ بِهِمْ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێک سەردانی کۆمەڵێک دەکات، پێشنوێژییان بۆ ناکات

٧٠. عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ، رَجُلٍ مِنْهُمْ قَالَ: كَانَ مَالِكُ بْنُ الْحُوَيْرِثِ ﵁ يَأْتِينَا فِي مُصَلَّانَا يَتَحَدَّثُ، فَحَضَرَتِ الصَّلَاةُ يَوْمًا، فَقُلْنَا لَهُ: تَقَدَّمْ، فَقَالَ: لِيَتَقَدَّمْ بَعْضُكُمْ حَتَّى أُحَدِّثَكُمْ لِمَ لَا أَتَقَدَّمُ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ زَارَ قَوْمًا فَلَا يَؤُمَّهُمْ، وَلْيَؤُمَّهُمْ رَجُلٌ مِنْهُمْ».

ئەبو عەتیە دەڵێت: کەسێک لەوان گوتی: مالیکی کوڕی حوەیریس ﷺ دەهاتە لامان و لە شوێنی نوێژکردنمان قسەی دەکرد، جا ڕۆژێک کاتی نوێژ داهات، ئێمەش پێمان گوت: پێش بکەوە (بۆ پێشنوێژی)، ئەویش گوتی: با یەکێکتان پێش بکەوێت تا بۆتان باس بکەم کە بۆچی پێش ناکەوم، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «هەریەکێک سەردانی کۆمەڵێکی کرد با پێشنوێژییان بۆ نەکات، بەڵکوو با کەسێک لە خۆیان پێشنوێژی بکات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِشَارَةِ فِي الصَّلَاةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئاماژەکردن لەنێو نوێژدا

٧١. عَنْ صُهَيْبٍ ﷺ قَالَ: مَرَرْتُ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَرَدَّ إِلَيَّ إِشَارَةً.

سوهەیب ﷺ دەڵێت: بەلای پێغەمبەری خوا ﷺ تێپەڕیم لە کاتێکدا کە نوێژی دەکرد، سڵاوم لێ کرد، بە ئاماژە وەڵامی دامەوە.

تێبینی:

ئەوە مەبەست نوێژی سوننەتە، نەك نوێژی فەڕز.

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ التَّسْبِيحَ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقَ لِلنِّسَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە گوتنی سبحان الله بۆ پیاوانە، چەپڵەلێدان بۆ ئافرەتانە

٧٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «التَّسْبِيحُ لِلرِّجَالِ، وَالتَّصْفِيقُ لِلنِّسَاءِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «گوتنی سبحان الله بۆ پیاوانە، چەپڵەلێدان بۆ ئافرەتانە (بۆ ئاگادارکردنەوەی ئیمام لە کاتی بوونی هەڵە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ التَّثَاؤُبِ فِي الصَّلَاةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی باوێشک لە نوێژدا

٧٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «التَّثَاؤُبُ فِي الصَّلَاةِ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا تَثَاءَبَ أَحَدُكُمْ فَلْيَكْظِمْ مَا اسْتَطَاعَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «باوێشک هاتن لە نوێژدا لە شەیتانەوەیە، ئەگەر کەسێکتان باوێشکی هات، با بەپێی توانا بیگەڕێنێتەوە».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ مَسْحِ الحَصَى فِي الصَّلَاةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی دەستهێنان بە شوێنەواری وردەبەرد لەنێو نوێژدا

٧٤. عَنْ مُعَيْقِيبٍ ﵁ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ مَسْحِ الحَصَى فِي الصَّلَاةِ؟ فَقَالَ: «إِنْ كُنْتَ لَا بُدَّ فَاعِلًا فَمَرَّةً وَاحِدَةً».

موعەیقیب ﵁ دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە سڕینەوەی شوێنەواری وردەبەردی شوێنی سوجدە لەنێو نوێژدا؟ فەرمووی: «ئەگەر هەر پێویست بوو بیسڕیەوە، با یەک جار بێت».

تێبینی:

مەبەستی ئەم فەرموودەیە بوونی کەمترین جووڵەیە لە نوێژدا، نەك بەهۆی زۆری

خۆجوولاندن خشووع و ملکەچی و بیرکردنەوە لە مانای وشەکان لەدەست بدرێن.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ التَّشْبِيكِ بَيْنَ الأَصَابِعِ فِي الصَّلَاةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی پەنجە خستنە نێو یەکدی لە نوێژدا

٧٥. عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا تَوَضَّأَ أَحَدُكُمْ فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ خَرَجَ عَامِدًا إِلَى المَسْجِدِ فَلَا يُشَبِّكَنَّ بَيْنَ أَصَابِعِهِ، فَإِنَّهُ فِي صَلَاةٍ».

کەعبی کوڕی عوجڕە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان جوانترین شێوەی دەستنوێژی شووشت، پاشان چووەدەر (لە ماڵ) بە نیازی مزگەوت، با پەنجەکانی دەستی نەخاتە نێو یەکدی، چونکە (لەو کاتەدا) ئەو لەنێو نوێژدایە».

تێبینی:

ئەوەش هەر جەختکردنەوەیە لەوەی کاتێك مرۆڤ دەستنوێژی هەڵگرت، وەك ئەوە وایە لەنێو نوێژ بێت، بۆیە جووڵەی زۆر ناکات کە شایستەی نوێژ نەبێت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي سَجْدَتَيِ السَّهْوِ بَعْدَ السَّلَامِ وَالكَلَامِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سوجدەکانی لەبیرچوون پاش سەلامدانەوە و قسەکردن

٧٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى الظُّهْرَ خَمْسًا، فَقِيلَ لَهُ: أَزِيدَ فِي الصَّلَاةِ أَمْ نَسِيتَ؟ فَسَجَدَ سَجْدَتَيْنِ بَعْدَمَا سَلَّمَ.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ (بەهەڵە) لە نوێژی نیوەڕۆ پێنج ڕکاتی کرد، پێی گوترا: ئایا ڕکاتەکانی نوێژ زیاد کراون یان

لەبیرت چوو (ڕکاتێکت زیاد کرد)؟ (فەرمووی: لەبیرم چووە) بۆیە دوو سوجدەی برد لەدوای سەلامدانەوە.

## بَابُ فِيمَنْ يَشُكُّ فِي الزِّيَادَةِ وَالنُّقْصَانِ

## باسێک دەربارەی ئەو کەسەی گومانی هەیە لە زیادی و کەمی ڕکاتەکانی نوێژەکەیدا

٧٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْتِي أَحَدَكُمْ فِي صَلَاتِهِ فَيَلْبِسُ عَلَيْهِ، حَتَّى لَا يَدْرِيَ كَمْ صَلَّى، فَإِذَا وَجَدَ ذَلِكَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْجُدْ سَجْدَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان شەیتان (بە خوتخوتەکردن) دێتە لای یەکێکتان کاتێك لەنێو نوێژە، جا لێی تێکەڵ دەکات، هەتا بە جۆرێک نازانێت چەند ڕکاتیشی کردووە، جا ئەگەر یەکێکتان هەستی بەوە کرد، با دوو سوجدە بەبات کاتێک لە دانیشتندایە (پێش سەلامدانەوە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاجْتِهَادِ فِي الصَّلَاةِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کۆششکردن لە نوێژدا

٧٨. عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﵁ قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَتَّى انْتَفَخَتْ قَدَمَاهُ، فَقِيلَ لَهُ: أَتَتَكَلَّفُ هَذَا وَقَدْ غُفِرَ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، قَالَ: «أَفَلَا أَكُونُ عَبْدًا شَكُورًا».

موغیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە نوێژی دەکرد هەتا پێیەکانی هەڵئاوسان، پێی گوترا: بۆ ئاوا فشار لە خۆت دەکەیت، لە کاتێکدا خوا لە هەموو کەموکوڕییەکی ڕابردوو و داهاتووت خۆش بووە؟ فەرمووی: «ئایا نابێت

منیش بەندەیەکی سوپاسگوزار بم».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ العَبْدُ يَوْمَ القِيَامَةِ الصَّلَاةُ

## باسی ئەوەی هاتووە یەکەم شت بەندە پرسیاری لێ دەکرێت لە ڕۆژی دوایی نوێژەکەیەتی

٧٩. عَنْ حُرَيْثِ بْنِ قَبِيصَةَ قَالَ: قَدِمْتُ المَدِينَةَ، فَقُلْتُ: اللَّهُمَّ يَسِّرْ لِي جَلِيسًا صَالِحًا، قَالَ فَجَلَسْتُ إِلَى أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ فَقُلْتُ: إِنِّي سَأَلْتُ اللَّهَ أَنْ يَرْزُقَنِي جَلِيسًا صَالِحًا، فَحَدِّثْنِي بِحَدِيثٍ سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَعَلَّ اللَّهَ أَنْ يَنْفَعَنِي بِهِ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ العَبْدُ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلَاتُهُ، فَإِنْ صَلُحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ، فَإِنْ انْتَقَصَ مِنْ فَرِيضَتِهِ شَيْءٌ، قَالَ الرَّبُّ ﷻ: انْظُرُوا هَلْ لِعَبْدِي مِنْ تَطَوُّعٍ فَيُكَمَّلَ بِهَا مَا انْتَقَصَ مِنَ الفَرِيضَةِ، ثُمَّ يَكُونُ سَائِرُ عَمَلِهِ عَلَى ذَلِكَ».



حوڕەیسی کوڕی قەبیسە دەڵێت: هاتمە شاری مەدینە، گوتم: ئەی خوایە دانیشتن (هاوەڵیکردن)ی کەسێکی چاکەکارم بۆ ئاسان بکە، گوتی: جا چوومە لای ئەبو هوڕەیرە ﵁ و دانیشتم، گوتم: من داوام کردووە لە خوا هاوەڵێکی چاکەکارم دەست بکەوێت، جا فەرموودەیەکم بۆ بڵێ کە لە پێغەمبەری خوات ﷺ بیستبێت، بەڵکوو خوا بیکاتە مایەی سوود بۆم! ئەویش گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «بێگومان یەکەم شت بەندە پرسیاری لێ دەکرێت لە ڕۆژی دوایی لە کارەکانی نوێژەکەیەتی، ئەگەر نوێژەکەی چاک بوو، بەڕاستی سەرفراز و دەرچووە، ئەگەر نوێژەکەشی خراپ بوو، بەڕاستی بەدبەخت و دۆڕاوە، ئەگەر لە نوێژە فەڕزەکانی کەموکوڕیی هەبوو، خوا ﷻ دەفەرموێت: سەیر بکەن بزانن بەندەکەم نوێژی سوننەتی هەیە؟ تا بەوە کەموکوڕی نوێژە فەڕزەکانی بۆ تەواو بکرێت، پاشان هەموو کارەکانی دیکەی بەندە بەو شێوەیە لەگەڵی دەکرێت (نوێژ دەبێتە بنچینە بۆ هەموو کارەکانی دیکەی)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي رَكْعَتَيِ الفَجْرِ مِنَ الفَضْلِ

باسی ئەوەی هاتووە کە دوو ڕکاتی پێش نوێژی بەیانی چ ڕێز و پلەیەکی هەیە

٨٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَكْعَتَا الفَجْرِ خَيْرٌ مِنَ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دوو ڕکات (نوێژی سوننەتی) پێش نوێژی بەیانی چاکترە لە دونیا و ئەوەی لەنێویشیدا».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاضْطِجَاعِ بَعْدَ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاڵکەوتن لەدوای
دوو ڕکات (نوێژی سوننەتی) بەیانی



٨١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمْ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى يَمِينِهِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان دوو ڕکاتی (نوێژی سوننەتی) بەیانی کرد، با بۆ خۆی لەسەر لای ڕاستی پاڵ بکەوێت».

## بَابُ مَا جَاءَ إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا صَلَاةَ إِلَّا المَكْتُوبَةُ

باسی ئەوەی هاتووە ئەگەر قامەت کرا جگە لە نوێژی فەرز نوێژی دیکە ناکرێت

٨٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا صَلَاةَ إِلَّا المَكْتُوبَةُ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر قامەت کرا بۆ نوێژ، ئەوکاتە هیچ نوێژی دیکە دروست نییە ئەنجام بدرێت جگە لە نوێژە فەڕزەکە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِعَادَتِهِمَا بَعْدَ طُلُوعِ الشَّمْسِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گێڕانەوەی دوو ڕکاتەکە لەدوای دەرکەوتنی خۆر

٨٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَمْ يُصَلِّ رَكْعَتَيِ الفَجْرِ فَلْيُصَلِّهِمَا بَعْدَ مَا تَطْلُعُ الشَّمْسُ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک دوو ڕکاتی نوێژی سوننەتی بەیانی نەکردبوو، با لەدوای دەرکەوتنی خۆر بیکاتەوە».



## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّهُ يُصَلِّيهِمَا فِي البَيْتِ

## باسی ئەوەی هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دوو ڕکات سوننەتی مەغریبی لەماڵەوە دەکرد

٨٤. عَنْ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ رَكْعَتَيْنِ بَعْدَ المَغْرِبِ فِي بَيْتِهِ.

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دوو ڕکات سوننەتی دوای نوێژی مەغریبیان کرد لە ماڵی ئەودا.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ بَعْدَ العِشَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دوو ڕکات (سوننەتی) دوای عیشا

٨٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﵂ عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَتْ: كَانَ يُصَلِّي قَبْلَ الظُّهْرِ رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَهَا رَكْعَتَيْنِ، وَبَعْدَ المَغْرِبِ ثِنْتَيْنِ، وَبَعْدَ العِشَاءِ رَكْعَتَيْنِ، وَقَبْلَ الفَجْرِ ثِنْتَيْنِ.

عەبدوڵڵای کوڕی شەقیق دەڵێت: پرسیارم کرد لە دایکمان عائیشە ﵂ دەربارەی نوێژە (سوننەتەکانی) پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: دوو ڕکات پێش نیوەڕۆ، دوو ڕکات لەدوای نیوەڕۆ، دوو ڕکات لەدوای مەغریب، دوو ڕکات لەدوای عیشا، دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ صَلَاةِ اللَّيْلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێز و گەورەیی شەونوێژ

٨٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ شَهْرِ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ المُحَرَّمُ، وَأَفْضَلُ الصَّلَاةِ بَعْدَ الفَرِيضَةِ صَلَاةُ اللَّيْلِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «چاکترین ڕۆژوو لەدوای مانگی ڕەمەزان (ڕۆژووی) مانگی موحەڕەمە، چاکترین نوێژ لەدوای نوێژە فەرزەکان شەونوێژە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْقِرَاءَةِ بِاللَّيْلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قورئانخوێندن بە شەو

٨٧. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِأَبِي بَكْرٍ: «مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تَقْرَأُ وَأَنْتَ تَخْفِضُ مِنْ صَوْتِكَ»، فَقَالَ: إِنِّي أَسْمَعْتُ مَنْ نَاجَيْتُ، قَالَ: «ارْفَعْ قَلِيلًا»، وَقَالَ لِعُمَرَ: «مَرَرْتُ بِكَ وَأَنْتَ تَقْرَأُ وَأَنْتَ تَرْفَعُ صَوْتَكَ»، قَالَ: إِنِّي أُوقِظُ الوَسْنَانَ، وَأَطْرُدُ الشَّيْطَانَ، قَالَ: «اخْفِضْ قَلِيلًا».

ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بە ئەبو بەکری فەرموو: «تێپەڕ بووم بەلاتدا تۆ قورئانت دەخوێند و دەنگت نزم بوو»، ئەبو بەکر گوتی: ئەوەی لێی دەپاڕێمەوە گوێبیستم بووە، فەرمووی: «کەمێک بەرزی بکەوە»، هەروەها بە عومەری فەرموو: «تێپەڕ بووم بەلاتدا لە کاتێکدا قورئانت دەخوێند، دەنگت بەرز بوو»، ئەویش گوتی: بۆ ئەوەی کەسانی خەوتوو بەئاگا بێنم، شەیتانەکان دەربکەم، پێی فەرموو: «کەمێک دەنگت نزم بکەوە».

٨٨. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ بِآيَةٍ مِنَ القُرْآنِ لَيْلَةً.

عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە شەوێکدا بە خوێندنی ئایەتێک لە قورئان شەونوێژی کردووە. (واتە: هەموو شەوەکە لە شەونوێژدا تەنها یەک ئایەتی دووبارە کردۆتەوە).

٨٩. عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ أَبِي قَيْسٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ ﷺ كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ النَّبِيِّ ﷺ بِاللَّيْلِ؟ أَكَانَ يُسِرُّ بِالْقِرَاءَةِ أَمْ يَجْهَرُ؟ فَقَالَتْ: كُلُّ ذَلِكَ قَدْ كَانَ يَفْعَلُ، رُبَّمَا أَسَرَّ بِالْقِرَاءَةِ، وَرُبَّمَا جَهَرَ، فَقُلْتُ: الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي جَعَلَ فِي الْأَمْرِ سَعَةً.

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەیس دەڵێت: پرسیارم کرد لە عائیشە ﷺ کە قورئانخوێندنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شەودا چۆن بووە؟ ئایا خوێندنی بەنهێنی بووە یان بەدەنگ؟

عائیشە گوتی: بە هەموو ئەو شێوانەی دەخوێند، جاری وا هەبوو بێدەنگ بووە، جاریش هەبووە بەدەنگ بووە، منیش گوتم: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە فراوانی خستۆتە کارەکانەوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ صَلَاةِ التَّطَوُّعِ فِي البَيْتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێز و پاداشتی نوێژی سوننەت لەماڵەوە

٩٠. عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَفْضَلُ صَلَاتِكُمْ فِي بُيُوتِكُمْ إِلَّا المَكْتُوبَةَ».

زەیدی کوڕی سابیت ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «چاکترین نوێژتان ئەوەیە کەوا لە ماڵەوە بێت، جگە لە نوێژە فەڕزەکان».

# أَبْوَابُ الوِتْرِ

## کۆباسی (نوێژی) ویتر

### بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الوِتْرَ لَيْسَ بِحَتْمٍ

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا نوێژی ویتر فەڕز نییە



٩١. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: الوِتْرُ لَيْسَ بِحَتْمٍ كَصَلَاتِكُمُ المَكْتُوبَةِ، وَلَكِنْ سَنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الوِتْرَ، فَأَوْتِرُوا يَا أَهْلَ القُرْآنِ».

عەلی ﵁ دەڵێت: نوێژی ویتر وەک نوێژە فەڕزەکان فەڕز نییە، بەڵکوو سوننەتێکی پێغەمبەری خوایە ﷺ، پێغەمبەر فەرموویەتی ﷺ: «بەڕاستی خوا تاکە، تاکیشی خۆش دەوێت، جا نوێژی ویتر بکەن ئەی ئەهلی قوڕئان».

٩٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: أَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ أُوتِرَ قَبْلَ أَنْ أَنَامَ.

ئەبو هوڕەیڕە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردم کە نوێژی ویتر بکەم پێش ئەوەی بخەوم.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الوِتْرِ بِسَبْعٍ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی حەوت ڕکاتی نوێژی ویتر

٩٣. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُوتِرُ بِثَلَاثَ عَشْرَةَ، فَلَمَّا كَبِرَ وَضَعُفَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ.

ئوم سەلەمە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ سێزدە ڕکات ویتری دەکرد، کاتێك بەتەمەندا چوو و بێهێز بوو، حەوت ڕکات ویتری دەکرد.

## بَابُ مَا جَاءَ مَا يُقْرَأُ فِي الوِتْرِ

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا چ بخویندرێت لە نوێژی ویتر



٩٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الوِتْرِ: {بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى}، {وَقُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ}، وَ: {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}، فِي رَكْعَةٍ رَكْعَةٍ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی ویتردا ئەوانەی دەخوێند: {بِسَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى}، {وَقُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ}، {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}، لە ڕکات بە ڕکاتدا.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَنَامُ عَنِ الوِتْرِ، أَوْ يَنْسَاهُ

### باسی ئەوەی هاتووە کەسێک بەهۆی خەوتن نوێژی ویتری لەدەست بچێت، یان لەیادی بکات

٩٥. عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ نَامَ عَنْ وِتْرِهِ فَلْيُصَلِّ إِذَا أَصْبَحَ».

زەیدی کوڕی ئەسلەم ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەرکەسێک ویستی ویتر بکات و خەوی لێکەوت، با خۆرهەڵات نوێژە ویترەکە بکات».

* وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ الْكُوفَةِ إِلَى هَذَا الحَدِيثِ، وَقَالُوا: يُوتِرُ الرَّجُلُ إِذَا ذَكَرَ، وَإِنْ كَانَ بَعْدَ مَا طَلَعَتِ الشَّمْسُ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ.

هەندێك لە زانایانی خەڵکی کوفە دەربارەی ئەو فەرموودەیە گوتوویانە: کەسەکە هەر کاتێک بەیادی هاتەوە با نوێژە ویترەکە بکات، ئەگەر هاتوو لەدوای دەرکەوتنی خۆریش بێت، ئەمە بۆچوونی سوفیانی سەوریشە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صَلَاةِ الضُّحَى

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژی چێشتەنگاو (چێشتەنوێژ)



٩٦. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي لَيْلَى ﵁ قَالَ: مَا أَخْبَرَنِي أَحَدٌ أَنَّهُ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي الضُّحَى، إِلَّا أُمَّ هَانِئٍ، فَإِنَّهَا حَدَّثَتْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ دَخَلَ بَيْتَهَا يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ فَاغْتَسَلَ، فَسَبَّحَ ثَمَانَ رَكَعَاتٍ، مَا رَأَيْتُهُ صَلَّى صَلَاةً قَطُّ أَخَفَّ مِنْهَا، غَيْرَ أَنَّهُ كَانَ يُتِمُّ الرُّكُوعَ وَالسُّجُودَ.

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو لەیلا ﵁ دەڵێت: هیچ کەسێک پێی ڕانەگەیاندووم کە پێغەمبەری ﷺ بینیبێت نوێژی چێشتەنگاوی کردبێت جگە لە ئوم هانی، ئەو بۆی باس کردین کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتۆتە نێو ماڵەکەی لە کاتی ڕزگارکردنی مەککە و خۆی شوشتووە، ئینجا هەشت ڕکات نوێژی کردووە، هەرگیز نەمبینیوە نوێژکردنی ئاوا بەسووکی بووبێت، بەڵام (لەگەڵ ئەوەش) ئەو مافی ڕکووع و سوجدەکانی بەتەواوی دەدا.

٩٧. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ وَأَبِي ذَرٍّ ﵄ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، عَنِ اللَّهِ ﷻ أَنَّهُ قَالَ: «ابْنَ

آدَمَ ارْكَعْ لِي أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ أَكْفِكَ آخِرَهُ».

ئەبو دەرداء و ئەبو زەڕ ﵄ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕنەوە: ئەویش لە خواوە ﷻ، کە فەرموویەتی: «ئەی نەوەی ئادەم، لە سەرەتای ڕۆژدا چوار ڕکات سوننەت ئەنجام بدە، کۆتاییەکەت بۆ لەئەستۆ دەگرم (واتە: تێکڕای ڕۆژەکە دەتپارێزم)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صَلَاةِ الِاسْتِخَارَةِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژی ئیستیخارە

٩٨. **عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا الِاسْتِخَارَةَ فِي الأُمُورِ كُلِّهَا كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ القُرْآنِ، يَقُولُ:** «إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالأَمْرِ فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الفَرِيضَةِ، ثُمَّ لِيَقُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ العَظِيمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلَّامُ الغُيُوبِ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعِيشَتِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي -أَوْ قَالَ: فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ- فَيَسِّرْهُ لِي، ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعِيشَتِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي -أَوْ قَالَ: فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ- فَاصْرِفْهُ عَنِّي، وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِي الخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ، قَالَ: وَيُسَمِّي حَاجَتَهُ».

جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پاڕانەوەی ئیستیخارەی فێر دەکردین بۆ هەموو کارەکانمان، هەر وەک چۆن سوورەتێکی لە قوڕئان فێر دەکردین، دەیفەرموو: «ئەگەر یەکێک لە ئێوە ویستی کارێک بکات، با دوو ڕکات نوێژ بکات لە غەیری نوێژی فەڕز، پاشان بڵێت: خوایە بە زانستی خۆت داوای چاکە و خێرت لێ دەکەم، وە داوای هێزت لێ دەکەم بە هێز و توانای خۆت، لە فەزڵ و چاکە و گەورەیی خۆت داوات لێ دەکەم، بەڕاستی تۆ دەتوانیت و من ناتوانم، وە تۆ دەزانیت و من نازانم، وە تۆ زانا و شارەزای بە هەموو نهێنی و

پەنهانەکان، سا خوایە ئەگەر ئەو کارە -لێرەدا ناوی کارەکە دێنێت- خێر و چاکەیە بۆ من بۆ دین و ژین و کۆتایی تەمەنم -یان بڵێت: بۆ ئێستا و کۆتاییم- بیکە بە بەشم و بۆم ئاسان بکە و بیکە بە خێر و بەرەکەت بۆم، وە ئەگەر دەزانیت -بە شێوەی یەکەم جار دەڵێت- ئەگەر (ئەو کارە) شەڕ و خراپەی تێدایە بۆ من بۆ دین و ژین و کۆتایی تەمەنم -یان بڵێت: بۆ ئێستا و کۆتاییم-، لێم دوور بخەوە و منی لێ دوور بخەوە، وە چاکە بکە بەشم لە هەر شوێنێک بێت، پاشان منی پێ ڕازی بکە جا فەرمووی: (لە کاتی پاڕانەوەکە) با ناوی کارەکەی بهێنێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ الصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی شێوەی سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ

٩٩. عَنْ كَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ ؓ قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَذَا السَّلَامُ عَلَيْكَ قَدْ عَلِمْنَا، فَكَيْفَ الصَّلَاةُ عَلَيْكَ؟ قَالَ: «قُولُوا: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، وَبَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ».

کەعبی کوڕی عوجرە ؓ دەڵێت: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە چۆنیەتی سڵاوکردنە لە جەنابت زانیمان، ئایا چۆن سەڵاواتت لەسەر بدەین؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بڵێن: ئەی خوایە درووود بڕژێنە بەسەر موحەممەد و خانەوادەی موحەممەد، هەر وەک چۆن درووودت ڕژاندووە بەسەر ئیبڕاهیم، بەڕاستی تۆ ستایشکراو و خاوەنشکۆی، هەروەها بەرەکەتت بڕژێنە بەسەر موحەممەد و خانەوادەی موحەممەد، هەر وەک چۆن بەرەکەتت ڕژاندووە بەسەر ئیبڕاهیم، بەڕاستی تۆ ستایشکراو و خاوەن شکۆی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێگە و پاداشتی سەڵاواتدان لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ

١٠٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلَاةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک سەڵاواتێکم لەسەر بدات، خوا دە سەڵاواتی لەسەر دەدات».

* وَرُوِي عَنْ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَغَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ، قَالُوا: صَلَاةُ الرَّبِّ الرَّحْمَةُ، وَصَلَاةُ المَلَائِكَةِ الِاسْتِغْفَارُ.

ڕیوایەتکراوە لە سوفیانی سەوری و زیاتر لە یەکێک لە زانایان، گوتوویانە: سەڵاتی پەروەردگار بەزەیی نواندنە، سەڵاتی فریشتەکان داوای لێخۆشبوونە.

١٠١. عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه قَالَ: إِنَّ الدُّعَاءَ مَوْقُوفٌ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ لَا يَصْعَدُ مِنْهُ شَيْءٌ، حَتَّى تُصَلِّيَ عَلَى نَبِيِّكَ ﷺ.

عومەری کوڕی خەتتاب رضي الله عنه دەڵێت: نزا و پاڕانەوەکان لە نێوان ئاسمان و زەویدا دەوەستن، هیچی لێ بەرز نابێتەوە هەتا سەڵاوات لەسەر پێغەمبەرەکەت ﷺ دەدەیت.



# أَبْوَابُ الْجُمُعَةِ

## كۆباسی هەینی

### بَابُ فَضْلِ يَوْمِ الجُمُعَةِ

### باسی پێگە و گەورەیی ڕۆژی هەینی



١٠٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ فِيهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الجَنَّةَ، وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَا، وَلَا تَقُومُ السَّاعَةُ إِلَّا فِي يَوْمِ الجُمُعَةِ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «چاکترین ڕۆژ کە خۆری بەسەردا هەڵبێت ڕۆژی هەینییە، لەو ڕۆژەدا ئادەم دروست کراوە، لەو ڕۆژەدا خراوەتە بەهەشت، هەر لەو ڕۆژەشدا لێی دەرکراوە، ڕۆژی دوایی لە هیچ ڕۆژێک ڕوو نادات تەنیا لەو ڕۆژەدا نەبێت (هەینی)».

## بَابُ فِي السَّاعَةِ الَّتِي تُرْجَى فِي يَوْمِ الجُمُعَةِ

### باسێک دەربارەی ئەو کاتەی ئومێدی وەرگیرانی پاڕانەوەی تێدایە لە ڕۆژی هەینی

١٠٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ فِيهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الجُمُعَةِ، فِيهِ خُلِقَ آدَمُ، وَفِيهِ أُدْخِلَ الجَنَّةَ، وَفِيهِ أُهْبِطَ مِنْهَا، وَفِيهِ سَاعَةٌ لَا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ يُصَلِّي فَيَسْأَلُ اللَّهَ فِيهَا شَيْئًا إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «چاکترین ڕۆژ کە خۆری بەسەردا هەڵهاتبێت ڕۆژی هەینییە، لەو ڕۆژەدا ئادەمی تێدا دروست کراوە، لەو ڕۆژەدا خراوەتە بەهەشت، هەر لەو ڕۆژەش لێی دابەزیوە، کاتێکی پیرۆزی تێدایە، هەر بەندەیەکی موسوڵمان دوعای تێدا بکات، جا شتێک لە خوا داوا بکات بەدڵنیاییەوە خوا ئەو شتەی پێ دەدات».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الغُسْلِ يَوْمَ الجُمُعَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشت و گەورەیی خۆشوشتنی ڕۆژی هەینی

١٠٤. عَنْ أَوْسِ بْنِ أَوْسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ اغْتَسَلَ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَغَسَّلَ، وَبَكَّرَ وَابْتَكَرَ، وَدَنَا وَاسْتَمَعَ وَأَنْصَتَ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ خُطْوَةٍ يَخْطُوهَا أَجْرُ سَنَةٍ صِيَامُهَا وَقِيَامُهَا».

ئەوسی کوڕی ئەوس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە ڕۆژی هەینی بەجوانی و تەواوی خۆی بشوات، زوو بێت بۆ مزگەوت بۆ نوێژی هەینی، لە وتارخوێن نزیک ببێتەوە و گوێبیستی بێت و بێدەنگ بێت، ئەوە بە هەر هەنگاوێک کە دەینێت پاداشتی ساڵێک لە بەڕۆژووبون و هەڵسانەوەی شەونوێژی بۆ هەیە».

١٠٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَوَضَّأَ فَأَحْسَنَ الوُضُوءَ، ثُمَّ أَتَى الجُمُعَةَ، فَدَنَا وَاسْتَمَعَ وَأَنْصَتَ، غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الجُمُعَةِ وَزِيَادَةُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ، وَمَنْ مَسَّ الحَصَى فَقَدْ لَغَا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك دەستنوێژێکی جوان بشوات، پاشان بێت بۆ نوێژی هەینی و گوێ بگرێت و بێدەنگ بێت، خوا لە گوناهەکانی ئەو هەینییەی خۆش دەبێت تا هەینییەکی دیکە، زیادەی سێ ڕۆژیش (واتە: دە ڕۆژ)، هەر کەسێکیش لە کاتی وتاردا بە وردەبەرد خۆی سەرقاڵ بکات و یاری پێ بکات ئەوە لەغووی کردووە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرْكِ الجُمُعَةِ مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وازهێنان لە هەینی بەبێ بیانوو



١٠٦. عَنْ أَبِي الجَعْدِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ تَرَكَ الجُمُعَةَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ تَهَاوُنًا بِهَا طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ».

ئەبو جەعد ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک سێ هەینی واز بهێنێت بەهۆی بێباکی (بەبێ هۆکاری شەرعی)، مۆری بێئاگایی (یان دووڕوویی) لەسەر دڵی دەدرێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الخُطْبَةِ عَلَى المِنْبَرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وتار لەسەر دوانگە

١٠٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَخْطُبُ إِلَى جِذْعٍ، فَلَمَّا اتَّخَذَ النَّبِيُّ ﷺ المِنْبَرَ حَنَّ الجِذْعُ حَتَّى أَتَاهُ فَالتَزَمَهُ فَسَكَنَ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێک وتاری دەدا پاڵی بە بنەدارێکی خورما دەدا، جا کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ مینبەر (دوانگە)ی دانا، بنەدارەکە کەوتە گریان و ناڵە، هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ چوو لە باوەشی گرت، ئەوساکە هێور بۆیەوە و بێدەنگ بوو.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ إِذَا جَاءَ الرَّجُلُ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دوو ڕکات نوێژی کەسێک کە دێت و ئیمامیش وتار دەدات

١٠٨. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: بَيْنَمَا النَّبِيُّ ﷺ يَخْطُبُ يَوْمَ الجُمُعَةِ إِذْ جَاءَ رَجُلٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَصَلَّيْتَ؟»، قَالَ: لَا، قَالَ: «قُمْ فَارْكَعْ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێت: لە کاتێک کە پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی هەینی وتاری دەدا، پیاوێک هات (بۆ مزگەوت و دانیشت)، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموو: «نوێژت کردووە؟»، گوتی: نەخێر، فەرمووی: «هەڵسە دوو ڕکات نوێژ بکە».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الكَلَامِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی گفتوگۆکردن لە کاتێک ئیمام وتار دەدا

١٠٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَالَ يَوْمَ الجُمُعَةِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ: أَنْصِتْ، فَقَدْ لَغَا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە ڕۆژی هەینی کاتێک کە ئیمام وتار دەدات بە هاوەڵەکەی گوت: بێدەنگ بە، ئەوە لەغووی کردووە».

* وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: كَرِهُوا لِلرَّجُلِ أَنْ يَتَكَلَّمَ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ، فَقَالُوا: إِنْ تَكَلَّمَ غَيْرُهُ فَلَا يُنْكِرْ عَلَيْهِ إِلَّا بِالإِشَارَةِ، وَاخْتَلَفُوا فِي رَدِّ السَّلَامِ، وَتَشْمِيتِ العَاطِسِ: فَرَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ فِي رَدِّ السَّلَامِ، وَتَشْمِيتِ العَاطِسِ وَالإِمَامُ يَخْطُبُ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَكَرِهَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ التَّابِعِينَ وَغَيْرِهِمْ ذَلِكَ وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان: بە ناپەسندیان داناوە بۆ کەسێک گفتوگۆ بکات لە کاتێک ئیمام وتار دەدات، گوتووشیانە: خۆ ئەگەر کەسێکی دیکە قسەی کرد، ئەوە لێی نایەتە وەڵام تەنیا بە ئاماژەکردن نەبێت، ڕاجیایی لە نێوان زانایان هەیە سەبارەت بە وەڵامدانەوەی سڵاوکردن و نزاکردن بۆ کەسی پژمیو: هەندێك لە زانایان ڕێگەیان داوە بە وەڵامدانەوەی سڵاو و نزاکردن بۆ کەسی پژمیو لە کاتێک کە ئیمام وتار دەدات، ئەمە وتەی ئەحمەد و ئیسحاقە، هەندێکی دیکەش لە زانایان لە شوێنکەوتووان و کەسانی دیکەش بە ناپەسندیان داناوە، ئەمە وتەی شافیعییە.



## بَابٌ: فِيمَنْ يَنْعَسُ يَوْمَ الجُمُعَةِ أَنَّهُ يَتَحَوَّلُ مِنْ مَجْلِسِهِ

## باسێک: ئەو کەسەی خەوی دێت لە ڕۆژی هەینی با شوێنی خۆی بگۆڕێت

١١٠. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا نَعَسَ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الجُمُعَةِ فَلْيَتَحَوَّلْ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک خەوی هات لەکاتی نوێژی هەینیدا، با شوێنی خۆی بگۆڕێت (تا خەوەکەی بڕوات)».

# أبْوَابُ العِيدَيْنِ

## کۆباسی هەردوو جەژن

### بَابٌ فِي صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ

### باسێک دەربارەی نوێژی هەردوو جەژن پێش وتاردان



١١١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ يُصَلُّونَ فِي العِيدَيْنِ قَبْلَ الخُطْبَةِ ثُمَّ يَخْطُبُونَ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر (خوا لێیان ڕازی بێت) لە پێش وتاردان نوێژی هەر دوو جەژنیان دەکرد، پاشان وتاریان دەدا.

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ صَلَاةَ العِيدَيْنِ قَبْلَ الخُطْبَةِ، وَيُقَالُ إِنَّ أَوَّلَ مَنْ خَطَبَ قَبْلَ الصَّلَاةِ مَرْوَانُ بْنُ الحَكَمِ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ جگە لەوانیش: نوێژی هەردوو جەژن لەپێش وتاردانە، دەشگوترێت: یەکەم کەس کە وتاری داوە پێش نوێژکردن مەڕوانی کوڕی حەکەم بووە.

## بَابُ فِي خُرُوجِ النِّسَاءِ فِي العِيدَيْنِ

### باسێک دەربارەی دەرچوونی ئافرەتان (بۆ نوێژ) لە هەردوو جەژن

١١٢. عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ ﵂: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يُخْرِجُ الأَبْكَارَ، وَالعَوَاتِقَ، وَذَوَاتِ الخُدُورِ، وَالحُيَّضَ فِي العِيدَيْنِ، فَأَمَّا الحُيَّضُ فَيَعْتَزِلْنَ المُصَلَّى، وَيَشْهَدْنَ دَعْوَةَ المُسْلِمِينَ، قَالَتْ إِحْدَاهُنَّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا جِلْبَابٌ، قَالَ: «فَلْتُعِرْهَا أُخْتُهَا مِنْ جَلَابِيبِهَا».

ئوم عەتیە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە هاتنی کچانی تازەپێگەیشتوو، کچانی نێو سوچی ماڵان، ئافرەتانی حەیزدار، (بۆ شوێنی نوێژ) لە کاتی هەردوو جەژندا، فەرمان درا بەو ئافرەتانەی کە لە حەیزدان کە لە کاتی نوێژکردن خۆیان دوور بخەنەوە لە شوێنی نوێژکردن، بۆ ئەوەی ئەوانیش ئامادەی خێر و خوشی و پاڕانەوەی موسوڵمانان بن، جا یەکێک لە ئافرەتەکان گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەدی ئەگەر کەسێک پۆشاکی نەبوو (بۆئەوەی بێتەدەر)، فەرمووی: «با خوشکێکی پۆشاکێکی خۆی بداتێ».



## بَابُ فِي الأَكْلِ يَوْمَ الفِطْرِ قَبْلَ الخُرُوجِ

### باسێک دەربارەی خواردن لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان پێش دەرچوون (بۆ نوێژ)

١١٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَخْرُجُ يَوْمَ الفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ، وَلَا يَطْعَمُ يَوْمَ الأَضْحَى حَتَّى يُصَلِّيَ.

عەبدوڵڵای کوڕی بوڕەیدە، لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان دەرنەدەچوو تا خواردنێکی دەخوارد، بەڵام لە جەژنی قوربان تا نوێژی جەژنی دەکرد هیچی نەدەخوارد.

* وَقَدْ اسْتَحَبَّ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ لَا يَخْرُجَ يَوْمَ الفِطْرِ حَتَّى يَطْعَمَ شَيْئًا، وَيُسْتَحَبُّ لَهُ أَنْ يُفْطِرَ عَلَى تَمْرٍ، وَلَا يَطْعَمَ يَوْمَ الأَضْحَى حَتَّى يَرْجِعَ.

هەندێک لە زانایان بەپەسندیان داناوە، کەسێک لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان دەرنەچێت هەتا خواردنێک دەخوات، پەسندکراوە بەیانیکردنەوەی بە خورما بێت، بەڵام لە جەژنی قوربان هیچ نەخوات هەتا دەگەڕێتەوە لە نوێژی جەژن.



# أَبْوَابُ السَّفَرِ

## کۆباسی گەشت

### بَابُ التَّقْصِيرِ فِي السَّفَرِ

### باسی کورتکردنەوەی (نوێژ) لە گەشتدا



١١٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: سَافَرْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ فَكَانُوا يُصَلُّونَ الظُّهْرَ وَالعَصْرَ رَكْعَتَيْنِ رَكْعَتَيْنِ، لَا يُصَلُّونَ قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: گەشتم کردووە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان (خوا لێیان ڕازی بێت)، جا دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژی نیوەڕۆ و عەسریان دەکرد، نە لەپێشیان و نە لەدوایان هیچ نوێژی دیکەیان (نوێژی سوننەت) نەدەکرد.

### بَابُ مَا جَاءَ فِي كَمْ تُقْصَرُ الصَّلَاةُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کورتکردنەوەی نوێژ (لە گەشتدا)

١١٥. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ مِنَ المَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ فَصَلَّى

رَكْعَتَيْنِ، قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسٍ: كَمْ أَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: عَشْرًا.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەوە دەرچووین بۆ مەککە دوو ڕکاتی کرد (نوێژەکانی کورت دەکردنەوە)، (ڕاوی دەڵێت:) بە ئەنەسم گوت: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ماوەی چەند ڕۆژ مایەوە لە مەککە؟ گوتی: دە ڕۆژ.

## بَابٌ فِي صَلَاةِ الْكُسُوفِ

### باسێک دەربارەی نوێژی خۆرگیران

١١٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ صَلَّى فِي كُسُوفٍ، فَقَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ، ثُمَّ قَرَأَ ثُمَّ رَكَعَ ثُمَّ قَرَأَ، ثُمَّ رَكَعَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، ثُمَّ سَجَدَ سَجْدَتَيْنِ، وَالأُخْرَى مِثْلُهَا.

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی خۆرگیرانی کرد، دەستی کرد بە قورئانخوێندن، ئینجا ڕکووعی برد، دووبارە قورئانی خوێند ئینجا ڕکووعی برد، سێبارە قورئانی خوێند، ئینجا ڕکووعی برد، سێجاران (ئەوەی کرد)، ئینجا دوو سەجدەی برد، ڕکاتەکەی دیکەشی بەهەمان شێوە کرد.

* وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي القِرَاءَةِ فِي صَلَاةِ الكُسُوفِ، فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ يُسِرَّ بِالقِرَاءَةِ فِيهَا بِالنَّهَارِ، وَرَأَى بَعْضُهُمْ: أَنْ يَجْهَرَ بِالقِرَاءَةِ فِيهَا، كَنَحْوِ صَلَاةِ العِيدَيْنِ وَالجُمُعَةِ، وَبِهِ يَقُولُ مَالِكٌ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: يَرَوْنَ الجَهْرَ فِيهَا قَالَ الشَّافِعِيُّ: لَا يَجْهَرُ فِيهَا.

* وَقَدْ صَحَّ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ كِلْتَا الرِّوَايَتَيْنِ: صَحَّ عَنْهُ أَنَّهُ صَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ، وَصَحَّ عَنْهُ أَنَّهُ صَلَّى سِتَّ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ وَهَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ جَائِزٌ عَلَى قَدْرِ الكُسُوفِ، إِنْ تَطَاوَلَ الكُسُوفُ فَصَلَّى سِتَّ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ، فَهُوَ جَائِزٌ، وَإِنْ صَلَّى أَرْبَعَ رَكَعَاتٍ فِي أَرْبَعِ سَجَدَاتٍ وَأَطَالَ

الْقِرَاءَةَ فَهُوَ جَائِزٌ، وَيَرَى أَصْحَابُنَا، أَنْ تُصَلَّى صَلَاةُ الكُسُوفِ فِي جَمَاعَةٍ فِي كُسُوفِ الشَّمْسِ وَالقَمَرِ.

زانایان ڕاجیاییان هەیە سەبارەت بە چۆنیەتی خوێندنی قورئان لە نوێژی خۆرگیران، هەندێک لە زانایان ڕایان وایە کە قورئانخوێندن بەنهێنی بێت بە کاتی ڕۆژ، هەندێکی دیکە ڕایان وایە کە قورئانخوێندنی بەدەنگ بێت وەک هەردوو نوێژی جەژن و نوێژی هەینی، ئەمە بۆچوونی مالیک و ئەحمەد و ئیسحاقە، ڕایان وایە کە قورئانخوێندن بەدەنگ بێت، شافیعی گوتوویەتی: دەنگی تێدا بەرز ناکرێتەوە.

(سەبارەت بە شێوازی نوێژەکە) بێگومان بە ڕێگای ڕاست هەر دوو ڕیوایەتەکە هاتووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ، کە نوێژی کردووە بە چوار ڕکووعبردن لە چوار سوجدەدا، هەروەها نوێژی کردووە بە شەش ڕکووعبردن لە چوار سوجدەدا، ئەمە لەلای زانایان دروستە بەپێی ئەندازەی گیرانەکە، ئەگەر درێژەی خایەند و ئەویش نوێژەکەی کرد بە شەش ڕکووع لە چوار سوجدەدا ئەوە دروستە، ئەگەر نوێژەکەشی کرد بە چوار ڕکووعبردن لە چوار سوجدەدا و قورئانخوێندنەکەی درێژ کردەوە، ئەوەش هەر دروستە، هاوەڵانمان وای بۆچوونە نوێژی خۆرگیران و مانگگیران بەکۆمەڵ بکرێت.

١١٧. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: خَسَفَتْ الشَّمْسُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالنَّاسِ، فَأَطَالَ القِرَاءَةَ، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَأَطَالَ القِرَاءَةَ، وَهِيَ دُونَ الأُولَى، ثُمَّ رَكَعَ فَأَطَالَ الرُّكُوعَ، وَهُوَ دُونَ الأَوَّلِ، ثُمَّ رَفَعَ رَأْسَهُ فَسَجَدَ، ثُمَّ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ فِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ.

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆر گیرا، پێغەمبەری خوا ﷺ پێشنوێژیی بۆ خەڵک کرد، قورئانخوێندنی درێژ کردەوە، ئینجا ڕکووعی برد، ڕکووعەکەی درێژ کردەوە، پاشان سەری بەرز کردەوە و درێژەی دا بە خوێندنەوە و وەستا کەمتر لە وەستانی یەکەم، ئینجا ڕکووعی بردەوە، درێژەی دا بە ڕکووعەکەی کەمتر لە ڕکووعی یەکەم، پاشان سەری بەرز کردەوە و سوجدەی برد، پاشان هەمان کاری دووبار کردەوە لە ڕکاتی دووەمیش.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صَلَاةِ الخَوْفِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژی ترس

١١٨. عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى صَلَاةَ الخَوْفِ بِإِحْدَى الطَّائِفَتَيْنِ رَكْعَةً، وَالطَّائِفَةُ الأُخْرَى مُوَاجِهَةُ العَدُوِّ، ثُمَّ انْصَرَفُوا، فَقَامُوا فِي مَقَامِ أُولَئِكَ، وَجَاءَ أُولَئِكَ فَصَلَّى بِهِمْ رَكْعَةً أُخْرَى، ثُمَّ سَلَّمَ عَلَيْهِمْ، فَقَامَ هَؤُلَاءِ فَقَضَوْا رَكْعَتَهُمْ، وَقَامَ هَؤُلَاءِ فَقَضَوْا رَكْعَتَهُمْ.

سالیم، لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی ترسی کرد، ڕکاتێکی کرد بە یەکێک لە دوو کۆمەڵەکە، کۆمەڵێکیش ڕووبەڕووی دوژمن مانەوە، پاشان (کۆمەڵی یەکەم) ڕۆیشتن، بەڕیز وەستان ڕووبەڕووی دوژمن لە شوێنی ئەوانی دیکە، ئینجا کۆمەڵەکەی دیکە هاتن بۆ نوێژکردن و (پێغەمبەر ﷺ) ڕکاتێکی لەگەڵدا کردن، پاشان سەلامی دایەوە، جا ئەو کۆمەڵە هەستانەوە ڕکاتی دووەمیان تەواو کرد، دواتر کۆمەڵی پێشووتر هاتن و ڕکاتی دووەمیان تەواو کرد.



## بَابُ فِي كَرَاهِيَةِ البُزَاقِ فِي المَسْجِدِ

### باسێک دەربارەی ناپەسندیی تف فڕێدان لەنێو مزگەوت

١١٩. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «البُزَاقُ فِي المَسْجِدِ خَطِيئَةٌ، وَكَفَّارَتُهَا دَفْنُهَا».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «تف فڕێدان لەنێو مزگەوت گوناهـ و هەڵەیە، کەفارەتەکەی ژێر گڵکردنە (یان شۆرین و سڕینەوەی شوێنەکەیە)».

## بَابُ مَا يَقُولُ فِي سُجُودِ القُرْآنِ

### باسی ئەوەی دەگوترێت لە کاتی سوجدەکانی قورئان

١٢٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ فِي سُجُودِ القُرْآنِ بِاللَّيْلِ: «سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی سوجدەکانی قورئان لە شەودا دەیفەرموو: «ڕوخسارم سوجدەی برد بۆ ئەو خوایەی دروستی کردووە و بیستن و بینینی بۆ کردینەوە، بەهۆی حاڵگۆڕین لەلایەن ئەو و بە هێز و توانای ئەو».

## بَابُ مَا ذُكِرَ فِي الإِلتِفَاتِ فِي الصَّلاة

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئاوڕدانەوە لە نوێژدا



١٢١. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الِالتِفَاتِ فِي الصَّلَاةِ، قَالَ: «هُوَ اخْتِلَاسٌ يَخْتَلِسُهُ الشَّيْطَانُ مِنْ صَلَاةِ الرَّجُلِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە ئاوڕدانەوە لەنێو نوێژدا؟ فەرمووی: «ئەمە دزینێکە شەیتان لە نوێژی خاوەنەکەی دەدزێت (واتە: لە خێر و پاداشتی کەم دەکات)».

## بَابُ كَرَاهِيَةِ أَنْ يَنْتَظِرَ النَّاسُ الإِمَامَ وَهُمْ قِيَامٌ عِنْدَ افْتِتَاحِ الصَّلَاةِ

### باسی ناپەسندیی ئەوەی کە خەڵک بەپێوە بوەستن و چاوەڕێی ئیمام بکەن، لە کاتی چوونە نێو نوێژ

١٢٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا

أُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَلَا تَقُومُوا حَتَّى تَرَوْنِي خَرَجْتُ».

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادە، لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر قامەتی نوێژ کرا، ئێوە هەڵمەستنەوە هەتا من دەبینن وا دێمەدەر (لە ماڵەوە بۆ مزگەوت)».

* وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ أَنْ يَنْتَظِرَ النَّاسُ الإِمَامَ وَهُمْ قِيَامٌ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا كَانَ الإِمَامُ فِي المَسْجِدِ فَأُقِيمَتِ الصَّلَاةُ فَإِنَّمَا يَقُومُونَ إِذَا قَالَ المُؤَذِّنُ: قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، وَهُوَ قَوْلُ ابْنِ المُبَارَكِ.

هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ و کەسانی دیکەش بە ناپەسندیان داناوە کە خەڵکی بەپێوە وەستابن و چاوەڕێی ئیمام بکەن، هەندێکیان گوتوویانە: ئەگەر ئیمام لە مزگەوت بوو و قامەت کرا بۆ نوێژەکە، ئەوە خەڵکەکە هەڵدەستنەوە ئەو کاتەی بانگدەر دەڵێت: (قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ)، ئەمە بۆچوونی ئیبن موبارەکە.



بَابُ مَا ذُكِرَ فِي الثَّنَاءِ عَلَى اللَّهِ، وَالصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ قَبْلَ الدُّعَاءِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ستاییشی خوا و سەڵاتدان
لەسەر پێغەمبەر ﷺ پێش دوعاکردن

١٢٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: كُنْتُ أُصَلِّي وَالنَّبِيُّ ﷺ، وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ ﷺ مَعَهُ، فَلَمَّا جَلَسْتُ بَدَأْتُ بِالثَّنَاءِ عَلَى اللَّهِ، ثُمَّ الصَّلَاةِ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ دَعَوْتُ لِنَفْسِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «سَلْ تُعْطَهْ، سَلْ تُعْطَهْ».

عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: جارێکیان نوێژم دەکرد، پێغەمبەر ﷺ ئەبو بەکر و عومەری ﷺ لەگەڵدا بوو، جا کاتێک دانیشتم دەستم کرد بە مەدحی خوا، پاشان گوتنی

سەڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ، ئینجا پاڕامەوە بۆ خۆم، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «داوا بکە پێت دەدرێت، داوا بکە پێت دەدرێت».

## بَابُ مَا ذُكِرَ مِنَ التَّسْمِيَةِ عِنْدَ دُخُولِ الخَلَاءِ

## باسی ئەوەی هاتووە لە گوتنی (بسم الله) لە کاتی چوونە سەرئاو

١٢٤. **عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ** رضي الله عنه: **أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** ﷺ **قَالَ:** «سَتْرُ مَا بَيْنَ أَعْيُنِ الجِنِّ وَعَوْرَاتِ بَنِي آدَمَ: إِذَا دَخَلَ أَحَدُهُمُ الخَلَاءَ، أَنْ يَقُولَ: بِسْمِ اللَّهِ».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پەردەی داپۆشینی نێوان چاوەکانی جنۆکە و عەوڕەتی ئادەمیزاد ئەوەیە: کاتێک یەکێکیان ویستی بچێتە سەرئاو بڵێت: بسم الله (بە ناوی خوا)».



## بَابُ مَا ذُكِرَ مِنْ سِيمَاءِ هَذِهِ الْأُمَّةِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مِنْ آثَارِ السُّجُودِ وَالطُّهُورِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕوخساری ئەو ئوممەتە لە ڕۆژی دوایی بەهۆی شوێنەواری سوجدە و دەستنوێژەوە

١٢٥. **عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ** رضي الله عنه **عَنِ النَّبِيِّ** ﷺ **قَالَ:** «أُمَّتِي يَوْمَ القِيَامَةِ غُرٌّ مِنَ السُّجُودِ، مُحَجَّلُونَ مِنَ الوُضُوءِ».

عەبدوڵڵای کوڕی بوسر رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ئوممەتەکەم لە ڕۆژی دوایی بانگهێشتی گۆڕەپانی مەحشەر دەکرێن بە نێوچاوان و دەست و قاچی سپییەوە بەهۆی شوێنەواری دەستنوێژ شووشتنەوە».

## بَابُ مَا ذُكِرَ فِي نَضْحِ بَوْلِ الغُلَامِ الرَّضِيعِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پڕژاندنی ئاو بەسەر میزی منداڵی شیرەخۆر

١٢٦. **عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ فِي بَوْلِ الغُلَامِ الرَّضِيعِ:** «يُنْضَحُ بَوْلُ الغُلَامِ، وَيُغْسَلُ بَوْلُ الجَارِيَةِ».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی میزی منداڵی شیرەخۆرە فەرموویەتی: «(بەرگ و پۆشاک) ئاوپڕژێن دەکرێت بەهۆی میزی کوڕی بچووک، دەشۆردرێت بەهۆی میزی کیژۆڵەی بچووک».

## بَابُ مَا ذُكِرَ فِي فَضْلِ الصَّلَاةِ



### باسی ئەوەی باس کراوە دەربارەی پێگە و گەورەیی نوێژ

١٢٧. **عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﵁ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ فَقَالَ:** «اتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ، وَصَلُّوا خَمْسَكُمْ، وَصُومُوا شَهْرَكُمْ، وَأَدُّوا زَكَاةَ أَمْوَالِكُمْ، وَأَطِيعُوا ذَا أَمْرِكُمْ تَدْخُلُوا جَنَّةَ رَبِّكُمْ».

ئەبو ئومامە ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، لە حەجیماڵئاوایی وتاری دەدا فەرمووی: «پارێز بکەن لە پەروەردگارتان، پێنج نوێژەکەتان بکەن، مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بن، زەکاتی ماڵەکانتان بدەن، ملکەچی فەرمانڕەواکانتان بن، ئەوساکە دەچنە بەهەشتی پەروەردگارتان».



# أبْوَابُ الزَّكَاةِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی زەکات لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي زَكَاةِ الذَّهَبِ وَالوَرِقِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی زەکاتی زێڕ و زیو



١٢٨. عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «قَدْ عَفَوْتُ عَنْ صَدَقَةِ الخَيْلِ وَالرَّقِيقِ، فَهَاتُوا صَدَقَةَ الرِّقَةِ: مِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ دِرْهَمًا دِرْهَمًا، وَلَيْسَ فِي تِسْعِينَ وَمِائَةٍ شَيْءٌ، فَإِذَا بَلَغَتْ مِائَتَيْنِ فَفِيهَا خَمْسَةُ دَرَاهِمَ».

عەلی رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(لە زەکاتی) ئەسپ و کۆیلە چاوپۆشیم کردووە، بۆیە لە هەر چل دەرهەمی زیو دەرهەمێك زەکات بدەن، (بزانن) ئەگەر سەد و نەوەد (دەرهەمیش) بێت، زەکاتی تێدا نییە، جا هەر کاتێك گەیشتە دوو سەد (دەرهەم)، ئەوە پێنج دەرهەمی زەکاتە».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي زَكَاةِ البَقَرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی زەکاتی مانگا

١٢٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «فِي ثَلَاثِينَ مِنَ البَقَرِ تَبِيعٌ أَوْ تَبِيعَةٌ، وَفِي

كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةٌ».

عەبدوڵڵا ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «لە هەر سی مانگایەک گۆلکێکی یەکساڵەی نێر بێت یان مێ، لە هەر چل مانگایەک گۆلکێک دووساڵەی نێر بێت یان مێ (زەکاتی تێدایە)».

١٣٠. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﵁ قَالَ: بَعَثَنِي النَّبِيُّ ﷺ إِلَى اليَمَنِ، فَأَمَرَنِي أَنْ آخُذَ مِنْ كُلِّ ثَلَاثِينَ بَقَرَةً تَبِيعًا أَوْ تَبِيعَةً، وَمِنْ كُلِّ أَرْبَعِينَ مُسِنَّةً، وَمِنْ كُلِّ حَالِمٍ دِينَارًا، أَوْ عِدْلَهُ مَعَافِرَ.

موعازی کوڕی جەبەل ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ منی نارد بۆ یەمەن، فەرمانی پێ کردم کە زەکات وەربگرم لە هەر سی مانگایەک گۆلکێکی یەکساڵەی نێر بێت یان مێ، لە هەر چل مانگایەک گۆلکێک دووساڵەی نێر بێت یان مێ، لە هەر کەسێکی (خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان) کە باڵغ بووبێت دینارێکی زێڕ وەردەگیرێت، یان بەئەندازەی ئەو (دینارە) بەرگ و پۆشاکی موعافی وەردەگیرێت (جۆرە پۆشاکێکی خەڵکی یەمەنە).



## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ أَخْذِ خِيَارِ المَالِ فِي الصَّدَقَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی لە وەرگرتنی چاکترین ماڵ لە زەکات

١٣١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ مُعَاذًا إِلَى اليَمَنِ فَقَالَ لَهُ: «إِنَّكَ تَأْتِي قَوْمًا أَهْلَ كِتَابٍ، فَادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنِّي رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِي اليَوْمِ وَاللَّيْلَةِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةَ أَمْوَالِهِمْ تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ وَتُرَدُّ عَلَى فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومِ، فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ».

ئیبن عەبباس ﷻ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ موعازی نارد بۆ یەمەن و پێی فەرموو: «تۆ دەچیتە لای کۆمەڵێک خاوەن کتێبن، جا بانگهێشتیان بکە بۆ شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، من پێغەمبەری خوام ئەگەر ئەوان ملکەچ بوون بۆ ئەوە، ئینجا پێیان ڕابگەیەنە کە خوا لە شەو و ڕۆژێکدا پێنج نوێژی لەسەری پێویست کردوون، ئەگەر ئەوان ملکەچ بوون بۆ ئەوە، ئینجا پێیان ڕابگەیەنە کە خوا ماڵ بەخشینێکی لەسەر فەڕز کردوون، لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێت و دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان، ئەگەر ئەوان ملکەچ بوون بۆ ئەوە، ئاگادار بە نەکەیت چاکترین جۆری ماڵ و سامانیان لێ وەربگریت، خۆت بپارێزە لە دوعا و پاڕانەوەی کەسی ستەملێکراو، چونکە لە نێوان ئەو (ستەملێکراو) و خوا هیچ پەردەیەک نییە (دوعایان وەرگیراوە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صَدَقَةِ الزَّرْعِ وَالتَّمْرِ وَالحُبُوبِ



### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی زەکاتی کشتوکاڵ و خورما و دانەوێڵە

١٣٢. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ، وَلَيْسَ فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر لە پێنج وشتر کەمتر بوو زەکاتی تێدا نییە (ئەگەر پێنج بوو زەکاتەکەی یەك مەڕە)، ئەگەر کەسێك لە پێنج ئۆقیە کەمتر زیوی هەبوو زەکاتی تێدا نییە (پێنج ئۆقیە دەکاتە چل دەرهەم، چل جاران پێنج دەکاتە دوو سەد دەرهەم، ئەگەر کەسێك دوو سەد مسقاڵ زیوی هەبێت، پێویستە زەکاتی بدات)، ئەگەر کەسێك لە دانەوێڵەدا پێنج ویسق کەمتری هەبوو زەکاتی تێدا نییە».

## بَابُ مَا جَاءَ لَيْسَ فِي الخَيْلِ وَالرَّقِيقِ صَدَقَةٌ

### باسی ئەوەی هاتووە کە ئەسپ و کۆیلە زەکاتیان تێدا نییە

١٣٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَيْسَ عَلَى المُسْلِمِ فِي فَرَسِهِ، وَلَا فِي عَبْدِهِ صَدَقَةٌ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لەسەر موسوڵمان پێویست نییە زەکاتی کۆیلە و ئەسپەکەی بدات».

* وَالعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّهُ لَيْسَ فِي الخَيْلِ السَّائِمَةِ صَدَقَةٌ، وَلَا فِي الرَّقِيقِ إِذَا كَانُوا لِلْخِدْمَةِ صَدَقَةٌ، إِلَّا أَنْ يَكُونُوا لِلتِّجَارَةِ، فَإِذَا كَانُوا لِلتِّجَارَةِ فَفِي أَثْمَانِهِمُ الزَّكَاةُ إِذَا حَالَ عَلَيْهَا الحَوْلُ.



کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان: کە ئەسپی لەوەڕگا زەکاتی لێ دەرناکرێت، کۆیلە ئەگەر بۆ خزمەتکردن بێت زەکاتی لێ دەرناکرێت، تەنیا ئەگەر بۆ بازرگانی بێت، جا ئەگەر بۆ بازرگانی بوو ئەوە لە نرخەکەی زەکاتی لێ دەردەکرێت ئەگەر ساڵی بەسەردا سووڕایەوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي العَامِلِ عَلَى الصَّدَقَةِ بِالحَقِّ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سەرڕاستیی کۆکەرەوەی زەکات

١٣٤. عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «العَامِلُ عَلَى الصَّدَقَةِ بِالحَقِّ كَالغَازِي فِي سَبِيلِ اللَّهِ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى بَيْتِهِ».

ڕافیعی کوڕی خەدیج ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «کۆکەرەوە و سەرپەرشتیاری زەکات بەڕاست و دروستی وەک موجاهیدێک وایە

لەپێناوی خوا بجەنگێت، هەتا دەگەڕێتەوە نێو ماڵەکەی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ العَوْدِ فِي الصَّدَقَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی گەڕاندنەوەی ماڵی بەخشراو

١٣٥. عَنْ عُمَرَ رضي الله عنه: أَنَّهُ حَمَلَ عَلَى فَرَسٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، ثُمَّ رَآهَا تُبَاعُ فَأَرَادَ أَنْ يَشْتَرِيَهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تَعُدْ فِي صَدَقَتِكَ».

عومەر رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: ئەو ئەسپێکی بە کەسێک بەخشیوە بۆ ئەوەی لەپێناو خوا جیهاد بکات، پاشان بینیویەتی کە ئەسپەکە دەفرۆشرێتەوە، ویستوویەتی بیکڕێتەوە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «لە بەخشینەکەت پاشگەز مەبەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صَدَقَةِ الفِطْرِ



### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سەرفیترە

١٣٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَرَضَ زَكَاةَ الفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى مِنَ المُسْلِمِينَ.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەخشینی سەرفیترەی لە ڕەمەزاندا پێویست کردووە، کە ڕبەیەک بێت لە خورما، یان ڕبەیەک بێت لە جۆ، لەسەر هەموو موسوڵمانان پێوستە، نێر بێت یان مێ، ئازاد بێت یان کۆیلە.

* وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي هَذَا، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا كَانَ لِلرَّجُلِ عَبِيدٌ غَيْرُ مُسْلِمِينَ لَمْ يُؤَدِّ عَنْهُمْ صَدَقَةَ الفِطْرِ، وَهُوَ قَوْلُ مَالِكٍ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ. وقَالَ بَعْضُهُمْ: يُؤَدِّي عَنْهُمْ وَإِنْ كَانُوا غَيْرَ مُسْلِمِينَ، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ المُبَارَكِ، وَإِسْحَاقَ.

زانایان ڕایان جیاوازە دەربارەی ئەو پرسە، هەندێکیان گوتوویانە: ئەگەر هاتو کەسێک کۆیلەی ناموسوڵمانی هەبوو، ئەوە زەکاتی سەرفیترەی بۆ نادات، ئەمە بۆچوونی مالیک و شافیعی و ئەحمەدە، هەندێکی دیکەیان گوتوویانە: سەرفیترە بۆ کۆیلەی ناموسوڵمانیش دەدرێت، ئەمە بۆچوونی سوفیانی سەوری و ئیبن موبارەک و ئیسحاقە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَقْدِيمِهَا قَبْلَ الصَّلَاةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێشخستنی سەرفیترە پێش نوێژی جەژن

١٣٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ بِإِخْرَاجِ الزَّكَاةِ قَبْلَ الغُدُوِّ لِلصَّلَاةِ يَوْمَ الفِطْرِ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دەکرد پێش دەرچوونی خەڵکی بۆ نوێژی جەژن سەرفیترە بدرێت.

وَهُوَ الَّذِي يَسْتَحِبُّهُ أَهْلُ العِلْمِ: أَنْ يُخْرِجَ الرَّجُلُ صَدَقَةَ الفِطْرِ قَبْلَ الغُدُوِّ إِلَى الصَّلَاةِ.

ئەمەیە کە زانایان بە پەسندیان داناوە: کە کەسێک سەرفیترە بدات پێش ئەوەی دەربچێت بۆ نوێژ.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنِ المَسْأَلَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێگریکردن لە سواڵکردن

١٣٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَأَنْ يَغْدُوَ أَحَدُكُمْ فَيَحْتَطِبَ عَلَى ظَهْرِهِ فَيَتَصَدَّقَ مِنْهُ فَيَسْتَغْنِيَ بِهِ عَنِ النَّاسِ، خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ

رَجُلًا، أَعْطَاهُ أَوْ مَنَعَهُ ذَلِكَ، فَإِنَّ اليَدَ العُلْيَا أَفْضَلُ مِنَ اليَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «ئەگەر یەکێکتان بەیانی زوو دەربچێت بۆ دارکردن و کۆکردنەوەی دار بە پشتی، جا لێی (لە داهاتەکەی) ببەخشێت و بەهۆیەوە بێنیاز بێت لە خەڵکی، زۆر چاکترە لە سواڵکردن لە خەڵکی، جا هەیە پێی دەبەخشێت یان پێی نابەخشێت، بەڕاستی دەستی بەرز (بەخشەر) چاکترە لە دەستی نزم (وەرگر)، بەخشینت بەوانە دەست پێ بکە کە لێتەوە نزیکن و خەرجییان لە ئەستۆتە».



# أَبْوَابُ الصَّوْمِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی ڕۆژوو لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ شَهْرِ رَمَضَانَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێگە و گەورەیی مانگی ڕەمەزان



١٣٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ وَقَامَهُ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت و شەوەکانیشی شەونوێژ بکات، بڕوای پێی هەبێت و چاوەڕێی پاداشت بێت، لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبوردرێت، هەر کەسێکیش شەوی قەدر شەونوێژ بکات و بڕوای پێی هەبێت و چاوەڕێی پاداشت بێت، لە گوناهەکانی ڕابردووی دەبوردرێت».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الصَّوْمَ لِرِؤيَةِ الهِلَالِ وَالإِفْطَارَ لَهُ

### باسی ئەوەی هاتووە کە ڕۆژووگرتن بە بینینی مانگە، کردنە جەژنیش بەبینینی مانگی یەکشەوەی شەواڵە

١٤٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَصُومُوا قَبْلَ رَمَضَانَ، صُومُوا لِرِؤيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرِؤيَتِهِ، فَإِنْ حَالَتْ دُونَهُ غَيَايَةٌ، فَأَكْمِلُوا ثَلَاثِينَ يَوْمًا».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پێش مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو مەبن، بەڵام بەڕۆژوو بن بەهۆی بینینی مانگ لە یەکەم شەوی ڕەمەزان، بیکەنە جەژن بەهۆی بینینی مانگ لە یەکەم شەوی شەواڵ، ئەگەر مانگتان نەبینی بەهۆی هەر هۆکارێک (وەک ئاسمان غەیم بێت)، ئەوە سی ڕۆژ تەواو بکەن (ئینجا بیکەن بە جەژن)».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْجِيلِ الإِفْطَارِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پەلەکردن لە بەربانگکردن

١٤١. عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الفِطْرَ».

سەهلی کوڕی سەعد ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەردەوام خەڵک لە خێر و چاکەدان هەتا زوو بەربانگ بکەنەوە».

* وَهُوَ الَّذِي اخْتَارَهُ أَهْلُ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: اسْتَحَبُّوا تَعْجِيلَ الفِطْرِ وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

ئەوە ئەو بۆچوونەیە کە زانایان لەنێو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و جگە لەوانیش

هەڵیانبژاردووە: کەوا پەسندە پەلە بکرێت لە بەربانگکردن (ئەگەر کاتی هاتبوو)، ئەمەش بۆچوونی (پێشەوایان) شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي بَيَانِ الفَجْرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەرکەوتنی بەیانی

١٤٢. عَنْ أَبِي طَلْقُ بْنُ عَلِيٍّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «كُلُوا وَاشْرَبُوا، وَلَا يَهِيدَنَّكُمُ السَّاطِعُ المُصْعِدُ، وَكُلُوا وَاشْرَبُوا، حَتَّى يَعْتَرِضَ لَكُمُ الأَحْمَرُ».

ئەبو تەلقی کوڕی عەلی ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بخۆن و بخۆنەوە، با ڕووناکی (بەیانی ناڕاست) بەپەلەتان نەخات، بخۆن و بخۆنەوە تا ڕووناکی سوورتان بۆ دەردەکەوێت».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُ: لَا يَحْرُمُ عَلَى الصَّائِمِ الأَكْلُ وَالشُّرْبُ حَتَّى يَكُونَ الفَجْرُ الأَحْمَرُ المُعْتَرِضُ، وَبِهِ يَقُولُ عَامَّةُ أَهْلِ العِلْمِ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان کە: خواردن و خواردنەوە لەسەر ڕۆژووەوان قەدەغە ناکرێت تا بەیانی سوور بەپانی دەردەکەوێت، ئەمەش زۆرینەی زانایان وایان گوتووە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّشْدِيدِ فِي الغِيبَةِ لِلصَّائِمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هەڕەشەکردن لە غەیبەتکردنی ڕۆژووەوان

١٤٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالعَمَلَ بِهِ، فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ بِأَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک واز لە

وتەی درۆ و کارپێکردنی نەهێنێت، خوا هیچ پێویستی بەوە نییە کە واز بهێنێت لە خواردن و خواردنەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ السَّحُورِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی پارشێوکردن

١٤٤. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً».

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «پارشێو بکەن، چونکە بەڕاستی لە پارشێوکردن بەرەکەت هەیە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ



### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی مۆڵەتدان بۆ ڕۆژوونەگرتن لە گەشتدا

١٤٥. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: كُنَّا نُسَافِرُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ، فَمَا يَعِيبُ عَلَى الصَّائِمِ صَوْمَهُ، وَلَا عَلَى المُفْطِرِ إِفْطَارَهُ.

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ڕەمەزان گەشتمان دەکرد، ئەوەی بەڕۆژوو بوو ڕەخنەی لێ نەدەگیرا بەهۆی ڕۆژووەکەی، ئەوەی بەڕۆژووش نەبوو ڕەخنەی لێ نەدەگیرا بەهۆی ڕۆژوونەگرتنی.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّوْمِ عَنِ المَيِّتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژووگرتن لەجیاتی مردوو

١٤٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: جَاءَتْ امْرَأَةٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّ أُخْتِي مَاتَتْ

وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ، قَالَ: «أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُخْتِكِ دَيْنٌ أَكُنْتِ تَقْضِينَهُ»، قَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: «فَحَقُّ اللَّهِ أَحَقُّ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: ئافرەتێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: خوشکم مردووە و بەڕۆژووبوونی دوو مانگ بەدوای یەکدا قەرزارە، فەرمووی: «ئایا ئەگەر خوشکەکەت قەرزێکی لەئەستۆ بێت، ئایا بۆی دەدەیتەوە؟»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «مافی خوا شیاوترە بە دانەوەی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ اسْتَقَاءَ عَمْدًا

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژووگر بەئەنقەست خۆی بڕشێنێتەوە

١٤٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «مَنْ ذَرَعَهُ الْقَيْءُ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ، وَمَنْ اسْتَقَاءَ عَمْدًا فَلْيَقْضِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بەبێ ویستی ڕشایەوە، گێڕانەوەی لەسەر نییە، هەر کەسێک بەئەنقەست خۆی بڕشێنێتەوە، پێویستە ڕۆژووەکەی بگرێتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّائِمِ يَأْكُلُ أَوْ يَشْرَبُ نَاسِيًا

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژووگر بە لەبیرچوونەوە شت بخوات یان بخواتەوە

١٤٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَكَلَ أَوْ شَرِبَ نَاسِيًا وَهُوَ صَائِمٌ فَلَا يُفْطِرْ، فَإِنَّمَا هُوَ رِزْقٌ رَزَقَهُ اللَّهُ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بخوات،

یان بخواتەوە بەهۆی لە بیرچوونەوە لە کاتێکدا بەڕۆژوویە، با ڕۆژووەکەی بەردەوام بکات و نەیشکێنێت، چونکە ئەوە ڕۆزییەکە خوا پێی داوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي القُبْلَةِ لِلصَّائِمِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ماچکردن بۆ ڕۆژووەوان

١٤٩. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُ فِي شَهْرِ الصَّوْمِ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە مانگی ڕەمەزان ماچی دەکرد.

* وَاخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَغَيْرِهِمْ فِي القُبْلَةِ لِلصَّائِمِ: فَرَخَّصَ بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فِي القُبْلَةِ لِلشَّيْخِ، وَلَمْ يُرَخِّصُوا لِلشَّابِّ مَخَافَةَ أَنْ لَا يَسْلَمَ لَهُ صَوْمُهُ، وَالمُبَاشَرَةُ عِنْدَهُمْ أَشَدُّ، وَقَدْ قَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: القُبْلَةُ تُنْقِصُ الأَجْرَ وَلَا تُفْطِرُ الصَّائِمَ، وَرَأَوْا أَنَّ لِلصَّائِمِ إِذَا مَلَكَ نَفْسَهُ أَنْ يُقَبِّلَ، وَإِذَا لَمْ يَأْمَنْ عَلَى نَفْسِهِ تَرَكَ القُبْلَةَ لِيَسْلَمَ لَهُ صَوْمُهُ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ.

زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ و غەیری ئەوانیش ڕاجیان سەبارەت بە ماچکردن بۆ ڕۆژووەوان، هەندێک لە هاوەڵان مۆڵەتیان داوە بۆ کەسانی بەتەمەن، بەڵام مۆڵەتیان نەداوە بۆ گەنج و لاوان لە ترسی زیانگەیاندن بە ڕۆژووەکەی، لەباوەشگرتن لەلایەن توندترە، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ماچکردن لە پاداشت کەم دەکەتەوە و ڕۆژوو بەتاڵ ناکاتەوە، بۆچوونیان وایە ڕۆژووەوان ماچی بۆ هەیە ئەگەر خۆی پێ بگیرێت، ئەگەر لەیخۆی دڵنیا نەبوو با ماچ نەکات، تا ڕۆژووەکەی پارێزراو بێت، ئەمە بۆچوونی سوفیانی سەوری و شافیعییە.

## بَابُ مَا جَاءَ لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يَعْزِمْ مِنَ اللَّيْلِ

## باسی ئەوەی هاتووە ڕۆژووی بەتاڵە هەر کەسێک نیەتی بەڕۆژووبوونی نەبێت لە شەودا

١٥٠. عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الفَجْرِ، فَلَا صِيَامَ لَهُ».

حەفصە رضي الله عنها لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک نیاز و نیەتی بەڕۆژووبوونی نەهێنێت لەپێش بەیانی، ئەوە ڕۆژووی قبووڵ نییە».

* وَإِنَّمَا مَعْنَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ: لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ طُلُوعِ الفَجْرِ فِي رَمَضَانَ، أَوْ فِي قَضَاءِ رَمَضَانَ، أَوْ فِي صِيَامِ نَذْرٍ، إِذَا لَمْ يَنْوِهِ مِنَ اللَّيْلِ، لَمْ يُجْزِهِ، وَأَمَّا صِيَامُ التَّطَوُّعِ، فَمُبَاحٌ لَهُ أَنْ يَنْوِيَهُ بَعْدَ مَا أَصْبَحَ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

لەلای هەندێک لە زانایان ئەم فەرموودەیە مانای ئەوەیە: ڕۆژووی بۆ نییە ئەو کەسەی نیەتی بەڕۆژووبوونی نەبێت لە کاتی شەو پێش دەرکەوتنی بەیانی، لە ڕەمەزان یان بۆ گێڕانەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان، یان ڕۆژووگرتنی ڕۆژووی نەزر، ئەگەر هاتو نیەتی دانەمەزراندبێت لە کاتی شەو، بۆ ئەم ڕۆژووانە ڕێگەی پێ نەدراوە (نیەتهێنان لەدوای بەیانی)، بەڵام ڕۆژووی سوننەت ڕێگە دراوە بە ڕۆژ نیەتی بۆ بێنێت، ئەمە بۆچوونی (پێشەوایان) شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

## بَابُ صِيَامِ المُتَطَوِّعِ بِغَيْرِ تَبْيِيتٍ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەڕۆژووبوونی سوننەت بەبێ نیەتهێنان لە شەودا

١٥١. عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ المُؤْمِنِينَ رضي الله عنها قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمًا، فَقَالَ: «هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟»، قَالَتْ: قُلْتُ: لَا، قَالَ: «فَإِنِّي صَائِمٌ».

عائیشە دایکی بڕواداران رضي الله عنها دەڵێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لام، فەرمووی: «ئایا هیچ شتێکتان لەلایە (خواردن)»، گوتم: نەخێر، فەرمووی: «دەی من بەڕۆژووم».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ صَوْمِ يَوْمِ الجُمُعَةِ وَحْدَهُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی بەڕۆژووبوونی ڕۆژی هەینی بەتەنها

١٥٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَصُومُ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الجُمُعَةِ إِلَّا أَنْ يَصُومَ قَبْلَهُ أَوْ يَصُومَ بَعْدَهُ».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «با کەسێکتان بە ڕۆژوو نەبێت لە ڕۆژی هەینیدا، مەگەر ڕۆژێک لەپێشیدا، یان لەپاشیدا لەگەڵیدا بەڕۆژوو بێت».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: يَكْرَهُونَ لِلرَّجُلِ أَنْ يَخْتَصَّ يَوْمَ الجُمُعَةِ بِصِيَامٍ، لَا يَصُومُ قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ، وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان کە: بە ناپەسندیان داناوە کەسێک ڕۆژی هەینی تایبەت بکات بە ڕۆژووگرتن، لە کاتێکدا ڕۆژێک لەپێشیدا یان لەدوایدا

لەگەڵی بەڕۆژوو نەبێت، ئەمە بۆچوونی (پێشەوایان) ئەحمەد و ئیسحاقە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ صَوْمِ يَوْمِ السَّبْتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی بەڕۆژووبوونی ڕۆژی شەممە

١٥٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ ، عَنْ أُخْتِهِ : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَصُومُوا يَوْمَ السَّبْتِ إِلَّا فِيمَا افْتَرَضَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ، فَإِنْ لَمْ يَجِدْ أَحَدُكُمْ إِلَّا لِحَاءَ عِنَبَةٍ أَوْ عُودَ شَجَرَةٍ فَلْيَمْضُغْهُ».

عەبدوڵڵای کوڕی بوسر ، لە خوشکیەوە دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕۆژی شەممە (بەتەنها) بەڕۆژوو مەبن تەنیا لەو ڕۆژووە نەبێت کە لەسەرتان فەڕزە، ئەگەر هیچ شتێک لە خۆراکیشتان دەست نەکەوت کە بیخۆن، تەنیا پەلکی ترێ، یان لقە دارێکیش بێت با هەر بیجوێت (بەڕۆژوو نەبێت)».

* وَمَعْنَى كَرَاهَتِهِ فِي هَذَا: أَنْ يَخُصَّ الرَّجُلُ يَوْمَ السَّبْتِ بِصِيَامٍ، لِأَنَّ الْيَهُودَ تُعَظِّمُ يَوْمَ السَّبْتِ.

مەبەستی ناپەسندی لەوەدا ئەوەیە: کە کەسەکە شەممە تایبەت بکات بە ڕۆژوو گرتن، لەبەرئەوەی یەهودییەکان ڕۆژی شەممە بەگەورە و پیرۆز دادەنێن.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صَوْمِ يَوْمِ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژووی دووشەممە و پێنجشەممە

١٥٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ : أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «تُعْرَضُ الْأَعْمَالُ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالْخَمِيسِ، فَأُحِبُّ أَنْ يُعْرَضَ عَمَلِي وَأَنَا صَائِمٌ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕۆژی دووشەمە و پێنجشەمە کارەکان دەخرێنە ڕوو (لەلای خوا)، بۆیە پێمخۆشە لە کاتی خستنەڕووی کارەکەم بەڕۆژوو بم».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَثِّ عَلَى صَوْمِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سووربوون لەسەر بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عاشوڕاء

١٥٥. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، إِنِّي أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ».

ئەبو قەتادە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەڕۆژووبوونی ڕۆژی عاشوڕاء، من وای دادەنێم ببێتە کەفارەتی ساڵی ڕابردوو لەلای خوا».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي العَمَلِ فِي أَيَّامِ العَشْرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کاری چاکە لە دە ڕۆژەکەدا

١٥٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ أَيَّامٍ العَمَلُ الصَّالِحُ فِيهِنَّ أَحَبُّ إِلَى اللَّهِ مِنْ هَذِهِ الأَيَّامِ العَشْرِ»، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَلَا الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَلَا الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، إِلَّا رَجُلٌ خَرَجَ بِنَفْسِهِ وَمَالِهِ فَلَمْ يَرْجِعْ مِنْ ذَلِكَ بِشَيْءٍ».

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ ڕۆژانێك نییە کردەوەی چاك تییاندا خۆشەویستتر بێت لای خوا لەم دە ڕۆژانەدا»، (واتە: دە ڕۆژی سەرەتای مانگی زیلحیجە)، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، تەنانەت جیهادکردنیش لەپێناو خوا؟ فەرمووی: «نەخێر تەنانەت جیهادکردنیش لەپێناو

خوا، مەگەر پیاوێك بە خۆی و بە ماڵەکەی دەرچووە بۆ جیهادکردن، نە خۆی دەگەڕێتەوە نە ماڵی دەگەڕێتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صِيَامِ سِتَّةِ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژووگرتنی شەش ڕۆژ لە مانگی شەوالدا

١٥٧. عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَنْ صَامَ رَمَضَانَ ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ فَذَلِكَ صِيَامُ الدَّهْرِ».

ئەبو ئەیووب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێت، ئینجا لەدوای ئەوەدا شەش ڕۆژ لە شەوال بەڕۆژوو بێت، وەک ئەوە وایە کە هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو بووبێت».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي صَوْمِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێک

١٥٨. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا أَبَا ذَرٍّ، إِذَا صُمْتَ مِنَ الشَّهْرِ ثَلَاثَةَ أَيَّامٍ فَصُمْ ثَلَاثَ عَشْرَةَ، وَأَرْبَعَ عَشْرَةَ، وَخَمْسَ عَشْرَةَ».

ئەبو زەڕ ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەی ئەبو زەڕ ئەگەر سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێک بەڕۆژوو بوویت، با ڕۆژووەکانت لە سێزدە و چواردە و پازدەی مانگ بێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الصَّوْمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێز و پاداشتی بەڕۆژووبوون

١٥٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ رَبَّكُمْ يَقُولُ: كُلُّ حَسَنَةٍ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ، وَالصَّوْمُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَالصَّوْمُ جُنَّةٌ مِنَ النَّارِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پەروەردگارتان دەفەرموێت: هەر چاکەیەک بەقەد دەی هاووێنەی خۆیەتی تا دەگاتە حەوت سەد جار، ڕۆژوو بۆ منە و هەر منیش پاداشتەکەی دەدەمەوە، ڕۆژوو پارێزە لە ئاگر».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الوِصَالِ لِلصَّائِمِ



### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی بەیەکبەستنەوەی ڕۆژوو بۆ ڕۆژووەوان

١٦٠. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «لَا تُوَاصِلُوا»، قَالُوا: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «إِنِّي لَسْتُ كَأَحَدِكُمْ، إِنَّ رَبِّي يُطْعِمُنِي وَيَسْقِينِي».

ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕۆژوو مەبەستنەوە بەیەکەوە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆ تۆ ڕۆژوو بەیەکەوە دەبەستیەوە، فەرمووی: حاڵی من وەکوو ئێوە نییە، چونکە من خواردن و خواردنەوەم پێ دەدرێت».

تێبینی:

مەبەست لە ڕۆژوو بەیەکەوە بەستنەوە ئەوەیە کە بەڕۆژوو بیت، شەویش هیچ نەخۆیت و دووبارە بەیانی بەڕۆژوو بیتەوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِجَابَةِ الصَّائِمِ الدَّعْوَةَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وەڵامدانەوەی ڕۆژووەوان بۆ بانگهێشتی خواردن

١٦١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ فَلْيُجِبْ، فَإِنْ كَانَ صَائِمًا، فَلْيُصَلِّ»، يَعْنِي: الدُّعَاءَ.

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ئەگەر کەسێک لە ئێوە بانگهێشتی خواردن کرا با وەڵامی خاوەنەکەی بداتەوە (بە چوونی)، ئەگەر بەڕۆژووش بوو با دوعایان بۆ بکات». (ڕاوی دەڵێت: فلیصل) واتە: دوعاکردن.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاعْتِكَافِ



### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی مانەوە لە مزگەوت

١٦٢. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَعْتَكِفُ العَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى قَبَضَهُ اللَّهُ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان ئیعتیکافی دەکرد، هەتا خوا گیانی پاکی وەرگرتەوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي لَيْلَةِ القَدْرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی شەوی قەدر

١٦٣. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُجَاوِرُ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ

رَمَضَانَ، وَيَقُولُ: «تَحَرَّوْا لَيْلَةَ القَدْرِ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ».

عائیشه ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ له ده شەوەکانی کۆتایی ڕەمەزان له مزگەوت دەمایەوە، دەیفەرموو: «بەدوای شەوی قەدر بگەڕێن له ده شەوی کۆتایی ڕەمەزان».

* قَالَ الشَّافِعِيُّ: وَأَقْوَى الرِّوَايَاتِ عِنْدِي فِيهَا لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ.

* وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ ﵁ أَنَّهُ: كَانَ يَحْلِفُ أَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، وَيَقُولُ: أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِعَلَامَتِهَا فَعَدَدْنَا وَحَفِظْنَا، وَرُوِيَ عَنْ أَبِي قِلَابَةَ أَنَّهُ قَالَ: لَيْلَةُ القَدْرِ تَنْتَقِلُ فِي العَشْرِ الأَوَاخِرِ.

(پێشەوا) شافیعی گوتوویەتی: بەهێزترین ڕیوایەت لەلام ئەوەیە که شەوی بیست و یەکە.

ڕیوایەت کراوه له ئوبەی کوڕی کەعب ﵁: سوێندی دەخوارد شەوی قەدر له شەوی بیست و حەوتە، دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ نیشانەکانی ئەو شەوەی پێمان ڕاگەیاندووە، شەوەکانمان ژماردووە و لەبەرمان کردووە. هەروەها ڕیوایەت کراوە له ئەبو قیلابە کە گوتوویەتی: شەو قەدر دەگوازرێتەوە (جێگۆڕکێی پێ دەکرێت) له ده شەوی کۆتاییدا.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّوْمِ فِي الشِّتَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژووگرتن له زستاندا

١٦٤. عَنْ عَامِرِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الغَنِيمَةُ البَارِدَةُ الصَّوْمُ فِي الشِّتَاءِ».

عامیری کوڕی مەسعوود ﵁ له پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە که فەرموویەتی: «دەستکەوتی ئاسان و بێ ماندووبوون ڕۆژووگرتنە له زستاندا».

## بَابُ الْمُعْتَكِفِ يَخْرُجُ لِحَاجَتِهِ أَمْ لَا

### باسی ئەوە کە ئایا موعتەکیف بۆ کاری پێویست لە مزگەوت دەردەچێت یان نا

١٦٥. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اعْتَكَفَ أَدْنَى إِلَيَّ رَأْسَهُ فَأُرَجِّلُهُ، وَكَانَ لَا يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلَّا لِحَاجَةِ الإِنْسَانِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: کاتێک کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئیعتیکافدا بوو، سەری خۆی بۆ نزیک دەکردمەوە و منیش پرچیم بۆ دادەهێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەهاتەوە نێو ماڵەوە تەنیا بۆ کاری پێویستی مرۆڤ نەبێت.

تێبینی:

ماڵی پێغەمبەر ﷺ دراوسێی مزگەوت بووە، لە کاتی ئیعتیکاف هەر لەنێو مزگەوتەوە تەنها سەری موبارەکی بردۆتە ئەودیوی ماڵی خۆی.



* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ إِذَا اعْتَكَفَ الرَّجُلُ أَنْ لَا يَخْرُجَ مِنْ اعْتِكَافِهِ إِلَّا لِحَاجَةِ الإِنْسَانِ، وَاجْتَمَعُوا عَلَى هَذَا، أَنَّهُ يَخْرُجُ لِقَضَاءِ حَاجَتِهِ لِلْغَائِطِ وَالبَوْلِ، ثُمَّ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي عِيَادَةِ المَرِيضِ، وَشُهُودِ الجُمُعَةِ، وَالجَنَازَةِ لِلْمُعْتَكِفِ، فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: أَنْ يَعُودَ المَرِيضَ، وَيُشَيِّعَ الجَنَازَةَ، وَيَشْهَدَ الجُمُعَةَ، إِذَا اشْتَرَطَ ذَلِكَ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ المُبَارَكِ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ لَهُ أَنْ يَفْعَلَ شَيْئًا مِنْ هَذَا.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان ئەگەر کەسێک ئیعتیکافی کرد، ئەوە لە ئیعتیکافەکەی دەرنەچێت تەنیا بۆ کاری پێویستی مرۆڤ نەبێت، زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە دەردەچێت بۆ جێبەجێکرنی پێویستییەکانی لە پیسایی و میزکردن. ئینجا زانایان ڕاجیا بوون بۆ کەسێک لە ئیعتکافدا بێت سەبارەت بە سەردانکردنی نەخۆش و ئامادەبوونی نوێژی هەینی و ڕۆیشتن بەدوای جەنازەدا، هەندێک لە زانایان لە

هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ و غەیری ئەوانیش ڕایان وا بووە کە: بۆی هەیە سەردانی نەخۆش بکات، بڕوات بەدوای جەنازەدا، ئامادەی نوێژی هەینی ببێت ئەگەر ئەمانەی بەمەرج گرتبێت، ئەمە بۆچوونی سوفیانی سەوری، ئیبن موبارەکە هەندێکیش لە زانایان گوتوویانە: بۆی نییە هیچ یەکێک لەم کارانە بکات.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشتی ئەو کەسەی ڕۆژووگر لای ئەو ڕۆژوو دەشکێنێت

١٦٦. **عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ** رضي الله عنه **قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ** ﷺ: «مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ، غَيْرَ أَنَّهُ لَا يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئًا».

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک خواردنی ڕۆژووەوانێک بدات، پاداشتی بۆ دەبێت وەکوو پاداشتی ئەو، بەبێ ئەوەی هیچ شتێک لە پاداشتی ڕۆژووەوانەکە کەم بێتەوە».

# أبْوَابُ الحَجِّ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی حەج لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي ثَوَابِ الحَجِّ وَالعُمْرَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشتی حەج و عومرە



١٦٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَابِعُوا بَيْنَ الحَجِّ وَالعُمْرَةِ، فَإِنَّهُمَا يَنْفِيَانِ الفَقْرَ وَالذُّنُوبَ كَمَا يَنْفِي الكِيرُ خَبَثَ الحَدِيدِ، وَالذَّهَبِ، وَالفِضَّةِ، وَلَيْسَ لِلْحَجَّةِ المَبْرُورَةِ ثَوَابٌ إِلَّا الجَنَّةُ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «حەج و عومرە بەدوای یەکەوە بکەن، چونکە ئەوانە هەژاری و گوناهەکان لادەبەن، هەر وەک کوورەی ئاگر پیسی لە ئاسن و زێڕ و زیو لادەبات، حەجی وەرگیراو هیچ پاداشتێکی نییە جگە لە بەهەشت».

١٦٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ حَجَّ فَلَمْ يَرْفُثْ، وَلَمْ يَفْسُقْ، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک حەج

بکات، قسەی نابەجێ نەکات و جوێن نەدات، لادان و خراپە نەکات، لە گوناهەکانی پێشووی دەبووردرێت».

## بَابُ مَا جَاءَ كَمْ حَجَّ النَّبِيُّ ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا پێغەمبەر ﷺ چەند حەجی کردووە

١٦٩. عَنْ قَتَادَةَ قَالَ: قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁: كَمْ حَجَّ النَّبِيُّ ﷺ؟ قَالَ: حَجَّةً وَاحِدَةً، وَاعْتَمَرَ أَرْبَعَ عُمَرٍ: عُمْرَةٌ فِي ذِي القَعْدَةِ، وَعُمْرَةُ الحُدَيْبِيَةِ، وَعُمْرَةٌ مَعَ حَجَّتِهِ، وَعُمْرَةُ الجِعِرَّانَةِ، إِذْ قَسَّمَ غَنِيمَةَ حُنَيْنٍ.

قەتادە دەڵێت: بە ئەنەسی کوڕی مالیکم ﵁ گوت: پێغەمبەر ﷺ چەند حەجی کردووە؟ فەرمووی: یەک جار حەجی کردووە، چوار جار عومرەی کردووە، عومرەیەک لە زولقەعدە، عومرەیەک لە حودەیبیە، عومرەیەک لەگەڵ حەجەکەی، عومرەیەک لە جیعڕانە، کاتێک دەستکەوتی جەنگی حونەینی دابەش کرد».



## بَابُ مَا جَاءَ كَمْ اعْتَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا پێغەمبەر ﷺ چەند عومرەی کردووە

١٧٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ اعْتَمَرَ أَرْبَعَ عُمَرٍ: عُمْرَةَ الحُدَيْبِيَةِ، وَعُمْرَةَ الثَّانِيَةِ مِنْ قَابِلٍ، وَعُمْرَةَ القَضَاءِ فِي ذِي القَعْدَةِ، وَعُمْرَةَ الثَّالِثَةِ مِنَ الجِعِرَّانَةِ، وَالرَّابِعَةِ الَّتِي مَعَ حَجَّتِهِ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ چوار عومرەی کردووە: عومرەیەک لە حودەیبیە، عومرەی دووەم لە ساڵی دواتر، عومرەی قەزاکردنەوە لە مانگی زولقەعدە، عومرەی سێیەم لە جیعڕانە، هەروەها چوارەم ئەوەی لەگەڵ حەجەکەیدا کردوویەتی.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الجَمْعِ بَيْنَ الحَجِّ وَالعُمْرَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کۆکردنەوەی حەج و عومرە بەیەکەوە

١٧١. عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَبَّيْكَ بِعُمْرَةٍ وَحَجَّةٍ».

ئەنەس رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو، دەیفەرموو: «بەنیازی عومرە و حەجەوە بێت ئیحرام بەستنم».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ التَّلْبِيَةِ وَالنَّحْرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشتی گوتنەوەی (لبیک) و قوربانیکردن

١٧٢. عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ: أَيُّ الحَجِّ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «العَجُّ وَالثَّجُّ».

ئەبو بەکری صدیق رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرا چ جۆرە حەجێک باشترە؟ فەرمووی: «حەجێک دەنگ بەرزبوونەوە (بە گوتنەوەی دروشمەکانی) و قوربانی لەگەڵ بێت».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي رَفْعِ الصَّوْتِ بِالتَّلْبِيَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەنگبەرزکردنەوە لە گوتنەوەی (لبیک)

١٧٣. عَنْ خَلَّادِ بْنِ السَّائِبِ بْنِ خَلَّادٍ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَانِي جِبْرِيلُ، فَأَمَرَنِي أَنْ آمُرَ أَصْحَابِي أَنْ يَرْفَعُوا أَصْوَاتَهُمْ بِالإِهْلَالِ وَالتَّلْبِيَةِ».

خەللادی کوڕی سائیبی کوڕی خەللادی، لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جیبریل هات بۆ لام، فەرمانی پێ کردم کە فەرمان بکەم بە هاوەڵانم کە دەنگیان بەرز بکەنەوە لە کاتی ئیحرامبەستن و لە کاتی گوتنی تەلبیە (لبیک)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي مَوَاقِيتِ الإِحْرَامِ لِأَهْلِ الآفَاقِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی شوێنەکانی ئیحرامبەستن بۆ خەڵکی ناوچە جیاوازەکان

١٧٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: مِنْ أَيْنَ نُهِلُّ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «يُهِلُّ أَهْلُ المَدِينَةِ مِنْ ذِي الحُلَيْفَةِ، وَأَهْلُ الشَّامِ مِنَ الجُحْفَةِ، وَأَهْلُ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ»، قَالَ: «وَأَهْلُ اليَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ».



ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پیاوێك گوتی: لە چ شوێنیک ئیحرام ببەستین ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش فەرمووی: «خەڵکی مەدینە لە زولحولەیفە ئیحرام ببەستن، خەڵکی شام لە جوحفە ئیحرام ببەستن، خەڵکی نەجد لە قەڕنە ئیحرام ببەستن، فەرمووی: خەڵکی یەمەن لە یەلەملەم ئیحرام ببەستن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي اسْتِلَامِ الحَجَرِ، وَالرُّكْنِ اليَمَانِي دُونَ مَا سِوَاهُمَا

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەستدان لە بەردەڕەشەکە و ڕوکنی یەمانی جیا لە ڕوکنەکانی دیکە

١٧٥. عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: كُنْتُ مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَمُعَاوِيَةُ رضي الله عنهما لَا يَمُرُّ بِرُكْنٍ إِلَّا اسْتَلَمَهُ، فَقَالَ لَهُ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يَكُنْ يَسْتَلِمُ إِلَّا الحَجَرَ الأَسْوَدَ، وَالرُّكْنَ اليَمَانِيَ، فَقَالَ مُعَاوِيَةُ: لَيْسَ شَيْءٌ مِنَ البَيْتِ مَهْجُورًا.

ئەبو توفەیل دەڵێت: لەگەڵ ئیبن عەبباس بووم، موعاویەش رضي الله عنهما بە هەر ڕوکنێکی

چوار لای کەعبە تێپەڕ بووبایە دەستی لێ دەدا، جا ئیبن عەبباس پێی گوت: پێغەمبەر ﷺ دەستلێدانی تەنیا لە بەردەڕەشەکە و ڕوکنی یەمانی بووە، موعاویە گوتی: هیچ شتێک لە ڕوکنەکانی کەعبەی پیرۆز وازیان لێ نەهێنراوە (پشتگوێ نەخراون).

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ لَا يَسْتَلِمَ إِلَّا الحَجَرَ الأَسْوَدَ، وَالرُّكْنَ اليَمَانِيَ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لای زۆرینەی زانایان کە: دەست لە هیچ ڕوکنێکی کەعبە نەدرێت، جگە لە بەردەڕەشەکە و ڕوکنی یەمانی.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَقْبِيلِ الحَجَرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ماچکردنی بەردەڕەشەکە

١٧٦. عَنْ عَابِسِ بْنِ رَبِيعَةَ قَالَ: رَأَيْتُ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ رضي الله عنه يُقَبِّلُ الحَجَرَ، وَيَقُولُ: إِنِّي أُقَبِّلُكَ وَأَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ، وَلَوْلَا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُقَبِّلُكَ لَمْ أُقَبِّلْكَ.

عابیسی کوڕی ڕەبیعە دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتابم رضي الله عنه بینی کە بەردەڕەشەکەی (کەعبەی پیرۆزی) ماچ دەکرد، دەیگوت: بەڕاستی ماچت دەکەم، دەشزانم تۆ بەردێکی و بەس، خۆ ئەگەر من پێغەمبەری خوام ﷺ نەبینیبایە ماچی دەکردیت، ماچم نەدەکردیت.

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّهُ يَبْدَأُ بِالصَّفَا قَبْلَ المَرْوَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە (هاتن و چوون) لە صەفاوە دەست پێ دەکرێت پێش مەڕوە

١٧٧. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ طَافَ بِالبَيْتِ سَبْعًا، فَقَرَأَ: {وَاتَّخِذُوا

مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى} البقرة: ١٢٥، فَصَلَّى خَلْفَ المَقَامِ، ثُمَّ أَتَى الحَجَرَ فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ قَالَ: «نَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ»، فَبَدَأَ بِالصَّفَا، وَقَرَأَ: {إِنَّ الصَّفَا وَالمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ} البقرة: ١٥٨.

جابیر ﵁ دەگێڕێتەوە: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەککە، حەوت جار تەوافی کەعبەی کرد، ئەو ئایەتەی خوێندەوە: {وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى}، واتە: جێ و مەقامەکەی ئیبڕاهیم بکەنە نوێژگەی خۆتان، جا دوو ڕکات نوێژی کرد لەپشت شوێنی مەقام، ئینجا هاتە لای گۆشەی کەعبە و دەستی پیرۆزی لێ دا، ئینجا فەرمووی: «لەوەوە دەست پێ دەکەین کەوا خوای گەورە لێیەوە دەستی پێ کردووە»، جا لەلای چیای سەفا دەستی پێ کرد، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {إِنَّ الصَّفَا وَالمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ}، واتە: بەڕاستی هاتن و چوونی نێوان سەفا و مەڕوە لە دروشمەکانی ئایینی خوان.



* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُ يَبْدَأُ بِالصَّفَا قَبْلَ المَرْوَةِ، فَإِنْ بَدَأَ بِالمَرْوَةِ قَبْلَ الصَّفَا لَمْ يُجْزِهِ، وَبَدَأَ بِالصَّفَا.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان: کە لە سەرەتادا لە سەفاوە دەست پێ دەکرێت پێش مەڕوە، ئەگەر هاتو بەمەڕوە دەست پێ بکرێت پێش سەفا، ئەوە دروست نییە، دەست دەکرێتەوە بە سەفا.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّعْيِ بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕاکردن لە نێوان سەفا و مەڕوە

١٧٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: إِنَّمَا سَعَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ لِيُرِيَ المُشْرِكِينَ قُوَّتَهُ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە ڕۆیشتنێکی گورجوگۆڵ

له تەوافکردندا بەدەوری کەعبە و لە نێوان سەفا و مەڕوەدا، تاکوو هێز و تواناییان پیشانی هاوبەشدانەرەکان بدەن.

* وَهُوَ الَّذِي يَسْتَحِبُّهُ أَهْلُ العِلْمِ أَنْ يَسْعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ، فَإِنْ لَمْ يَسْعَ وَمَشَى بَيْنَ الصَّفَا وَالمَرْوَةِ رَأَوْهُ جَائِزًا.

ئەوەی زانایان بەپەسندیان داناوە ئەوەیە کە: هاتوچۆی نێوان سەفا و مەڕوە بە سووکەڕاکردن بێت، ئەگەر تەنها بە ڕۆیشتنیش بێت لە نێوان سەفا و مەڕوە ئەوە دروستە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الطَّوَافِ رَاكِبًا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تەوافکردن بەسواری (وڵاخەوە)

١٧٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭫ قَالَ: طَافَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى رَاحِلَتِهِ فَإِذَا انْتَهَى إِلَى الرُّكْنِ أَشَارَ إِلَيْهِ.



ئیبن عەبباس ﭫ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لەسەر پشتی سوارییەکەی بەدەوری کەعبەی پیرۆزدا دەسووڕایەوە، کاتێک دەگەیشتە لای گۆشەی کەعبە، ئاماژەی بۆ دەکرد.

## بَابُ مَا جَاءَ مَا يُقْرَأُ فِي رَكْعَتَيِ الطَّوَافِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەوەی دەخوێندرێت لە دوو ڕکاتی دوای تەواف

١٨٠. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﭫ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ فِي رَكْعَتَيِ الطَّوَافِ بِسُورَتَيِ الْإِخْلَاصِ: {قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ}، {وَقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﭫ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە دوو ڕکاتی نوێژی سوننەتی دوای تەوافدا، هەردوو سووڕەتی {قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ} و {وَقُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}ی خوێندوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الحَجَرِ الأَسْوَدِ، وَالرُّكْنِ، وَالمَقَامِ

### باسی ئەوەی هاتووە لە ڕێز و پیرۆزیی بەردەڕەشەکە و ڕوکن و مەقام

١٨١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نَزَلَ الحَجَرُ الأَسْوَدُ مِنَ الجَنَّةِ، وَهُوَ أَشَدُّ بَيَاضًا مِنَ اللَّبَنِ فَسَوَّدَتْهُ خَطَايَا بَنِي آدَمَ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بەردەڕەشەکەی کەعبە لە بەهەشتەوە دابەزیوە، ئەوکاتە سپیتر بووە لە شیر، بەڵام هەڵە و گوناهەکانی ئادەمیزاد ڕەشی کردووە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِفَاضَةِ مِنْ عَرَفَاتٍ



### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەرچوون لە عەرەفات

١٨٢. عَنْ جَابِرٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَوْضَعَ فِي وَادِي مُحَسِّرٍ -وَزَادَ فِيهِ بِشْرٌ:- وَأَفَاضَ مِنْ جَمْعٍ وَعَلَيْهِ السَّكِينَةُ وَأَمَرَهُمْ بِالسَّكِينَةِ، -وَزَادَ فِيهِ أَبُو نُعَيْمٍ:- وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَرْمُوا بِمِثْلِ حَصَى الخَذْفِ، وَقَالَ لَعَلِّي: «لَا أَرَاكُمْ بَعْدَ عَامِي هَذَا».

جابیر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پەلەی دەکرد لە دەرچوون لە دۆڵی موحەسسیر -بیشر ئەوەی تێدا زیاد کردووە-: کاتێک کە دەرچوو لە موزدەلیفە بەهێمنی دەرچوو (تا ئەزیەتی کەس نەدرێت)، فەرمانیشی کرد بە هاوەڵانی کەوا بەهێمنی دەربچن، -ئەبو نوعەیم ئەوەی تێدا زیاد کردووە-: فەرمانی کرد کە بەردهاویشتنیان بە شێوەی قەبارەی ئەو بەردانە بێت کە پەنجەکانی لە بەرانبەر دەگیرێت، بە عەلی ﵁ فەرموو: «لەوانەیە لەدوای ئەم ساڵەوە نەتانبینمەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي رَمْيِ الجِمَارِ رَاكِبًا وَمَاشِيًا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەردبارانکردنی شەیتان بەپیادە و سوارییەوە

١٨٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَمَى الجَمْرَةَ يَوْمَ النَّحْرِ رَاكِبًا.

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بەردبارانی شەیتانی کرد لە ڕۆژی قوربانی لەسەر پشتی سواری.

## بَابُ مَا جَاءَ بِأَيِّ الرَّأْسِ يَبْدَأُ فِي الحَلْقِ

### باسی ئەوەی هاتووە بە چ لایەکی سەر دەست دەکرێت بە تاشینی

١٨٤. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمَّا رَمَى النَّبِيُّ ﷺ الجَمْرَةَ نَحَرَ نُسُكَهُ، ثُمَّ نَاوَلَ الحَالِقَ شِقَّهُ الأَيْمَنَ فَحَلَقَهُ، فَأَعْطَاهُ أَبَا طَلْحَةَ، ثُمَّ نَاوَلَهُ شِقَّهُ الأَيْسَرَ فَحَلَقَهُ، فَقَالَ: «اقْسِمْهُ بَيْنَ النَّاسِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ بەردبارانی شەیتانی کرد، قوربانییەکانی سەر بڕی، ئینجا لای ڕاستی سەری پیرۆزی خستە بەردەستی سەرتاش و بۆی تاشی، مووەکانی دایە دەست ئەبو تەلحە، ئینجا لای چەپی خستە بەردەستی و ئەویشی تاشی، جا فەرمووی: (مووەکان) دابەش بکەن لە نێو خەڵکی.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَلْقِ وَالتَّقْصِيرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تاشین و کورتکردنەوەی قژی سەر

١٨٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: حَلَقَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، وَحَلَقَ طَائِفَةٌ مِنْ أَصْحَابِهِ،

وَقَصَّرَ بَعْضُهُمْ، قَالَ ابْنُ عُمَرَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «رَحِمَ اللَّهُ الْمُحَلِّقِينَ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ»، ثُمَّ قَالَ: «وَالْمُقَصِّرِينَ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەری تاشی (سفری کرد)، هەندێک لە هاوەڵانیشی سەریان تاشی، هەندێکی دیکەیان کورتیان کردەوە، (ڕاوی دەڵێت:) ئیبن عومەر ﵄ گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ جارێک، یان دوو جار فەرمووی: «ڕەحمەتی خوا لەوانەی سەریان تاشی»، پاشان فەرمووی: «ئەوانەش کە کورتیان کردەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي حَجِّ الصَّبِيِّ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی حەجی منداڵ

١٨٦. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: رَفَعَتْ امْرَأَةٌ صَبِيًّا لَهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلِهَذَا حَجٌّ، قَالَ: «نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێت: ئافرەتێک منداڵێکی بەرز کردەوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا ئەم منداڵە پاداشتی حەجی بۆ هەیە؟ فەرمووی: «بەڵێ، تۆش پاداشتت بۆ هەیە (بەهۆی ئەوەوە)».

## بَابُ مَا ذُكِرَ فِي فَضْلِ الْعُمْرَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێگە و گەورەیی عومرەکردن

١٨٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ تُكَفِّرُ مَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلَّا الْجَنَّةُ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «عومرە بۆ عومرە

كەفارەتی گوناهەکانی نێوانیانە، حەجی وەرگیراویش هیچ پاداشتێکی نییە جگە لە بەهەشت)).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي العُمْرَةِ مِنَ التَّنْعِيمِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی عومرەکردن لە تەنعیم

١٨٨. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِي بَكْرٍ أَنْ يُعْمِرَ عَائِشَةَ مِنَ التَّنْعِيمِ.

عەبدورڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا بە عەبدورڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکر کە لەگەڵ خاتوو عائیشە دەربچێت بۆ تەنعیم (لەوێ ئیحرام ببەستێت بۆ عومرەکەی، چونکە بەهۆی حاڵەتی خۆیەوە نەیتوانی لە سەرەتادا عومرەکەی بکات).



## بَابُ مَا جَاءَ مَا تَقْضِي الحَائِضُ مِنَ المَنَاسِكِ

## باسی ئەوەی هاتووە کەوا ئافرەتی حەیزدار چی دەگێڕێتەوە لە کارەکانی حەج

١٨٩. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: حِضْتُ فَأَمَرَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ أَقْضِيَ الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا، إِلَّا الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ.

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: تووشی حەیز بووم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردم گشت کارەکانی حەج بکەم، جگە لە تەوافی بەیت.

* وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا الْحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ: أَنَّ الْحَائِضَ تَقْضِي الْمَنَاسِكَ كُلَّهَا مَا خَلَا الطَّوَافَ بِالْبَيْتِ.

کارکردن لەسەر ئەم فەرموودەیە لەلای زانایان ئەوەیە: ئافرەتی حەیزدار گشت کارەکانی حەج دەگێڕێتەوە، جگە لە تەواف.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَجَرِ الأَسْوَدِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەردەڕەشەکە

١٩٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الحَجَرِ: «وَاللَّهِ لَيَبْعَثَنَّهُ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ لَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا، وَلِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ، يَشْهَدُ عَلَى مَنْ اسْتَلَمَهُ بِحَقٍّ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بەبەردەڕەشەکە فەرمووی: «سوێند بە خوا بەردەڕەشەکەی کەعبە لە ڕۆژی دوایی دێت بەزیندوویی، دوو چاوی هەیە بەهۆیەوە دەبینێت، زوبانێکی هەیە بەهۆیەوە دەدوێت، شایەتی بۆ ئەو کەسانە دەدات کە دەستیان لێ داوە بەهەق (یان سەلامیان لێ کردووە)».

# أبْوابُ الجَنَائِزِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی جەنازە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي ثَوَابِ المَرِيضِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشتی نەخۆش

١٩١. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُصِيبُ المُؤْمِنَ شَوْكَةٌ فَمَا فَوْقَهَا، إِلَّا رَفَعَهُ اللَّهُ بِهَا دَرَجَةً، وَحَطَّ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةً».

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر بەڵایەک تووشی بڕوادار بێ لە دڕکێک بەرەو سەرەوە، بەدڵنیایی بەهۆیەوە خوا پلەیەک بەرزی دەکاتەوە، گوناهێکیشی لێ هەڵدەوەرێنێت».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي عِيَادَةِ المَرِيضِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سەردانی نەخۆش

١٩٢. عَنْ ثَوْبَانَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ المُسْلِمَ إِذَا عَادَ أَخَاهُ المُسْلِمَ لَمْ يَزَلْ فِي خُرْفَةِ الجَنَّةِ».

سەوبان ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «بەڕاستی کاتێک موسوڵمانێک سەردانی برا موسوڵمانە نەخۆشەکەی دەکات، ئەو کەسە بەردەوام لە باغەکانی بەهەشتە».

١٩٣. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَعُودُ مُسْلِمًا غُدْوَةً إِلَّا صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنْ عَادَهُ عَشِيَّةً إِلَّا صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصْبِحَ، وَكَانَ لَهُ خَرِيفٌ فِي الْجَنَّةِ».

عەلی ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «هەر موسوڵمانێک لە بەیانییەکدا سەردانی برایەکی موسوڵمانی نەخۆشی بکات، حەفتا هەزار فریشتە دوعای بۆ دەکەن تاکوو ئێوارە، ئەگەر بە شەو سەردانی بکات، حەفتا هەزار فریشتە دوعای بۆ دەکەن تاکوو بەیانی، هەروەها باغێکی بەهەشتیشی پێ دەدرێت».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنِ التَّمَنِّي لِلْمَوْتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەکردنی خۆزگەخواستن بە مردن

١٩٤. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «لَا يَتَمَنَّيَنَّ أَحَدُكُمُ الْمَوْتَ لِضُرٍّ نَزَلَ بِهِ، وَلْيَقُلْ: اللَّهُمَّ أَحْيِنِي مَا كَانَتِ الحَيَاةُ خَيْرًا لِي، وَتَوَفَّنِي إِذَا كَانَتِ الوَفَاةُ خَيْرًا لِي».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «با هیچ یەکێکتان خۆزگە بە مردن نەخوازێت لەبەر ئەو زیان و ناخۆشییەی کە تووشی بووە، بەڵکوو بڵێت: خوایە ئەگەر ژیان خێری تێدایە بۆم ئەوە بمژیێنە، ئەگەر مردنیش خێری تێدایە بۆم، ئەوە بمرێنە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّعَوُّذِ لِلْمَرِيضِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پەناگرتن بە خوا لە نەخۆشی

١٩٥. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه: أَنَّ جِبْرِيلَ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ اشْتَكَيْتَ؟ قَالَ: «نَعَمْ»، قَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ، مِنْ كُلِّ شَيْءٍ يُؤْذِيكَ، مِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ، وَعَيْنٍ حَاسِدَةٍ، بِاسْمِ اللَّهِ أَرْقِيكَ وَاللَّهُ يَشْفِيكَ.

ئەبو سەعید رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: جیبریل هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی موحەممەد، ئێش و ئازارت هەیە؟ ئەویش فەرمووی: «بەڵێ»، جیبریل فەرمووی: بە ناوی خوا دوعات بۆ دەکەم لە هەر شتێک کە ئەزیەتت دەدات، لە خراپەی هەر نەفسێک، لە خراپەی هەر چاوێکی حەسود، بە ناوی خوا دوعات بۆ دەکەم و خواش چارەت بکات.



١٩٦. عَنْ عَبْدِ العَزِيزِ بْنِ صُهَيْبٍ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَثَابِتٌ عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه فَقَالَ ثَابِتٌ: يَا أَبَا حَمْزَةَ اشْتَكَيْتُ، فَقَالَ أَنَسٌ: أَفَلَا أَرْقِيكَ بِرُقْيَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: «اللَّهُمَّ رَبَّ النَّاسِ، مُذْهِبَ البَاسِ، اشْفِ أَنْتَ الشَّافِي، لَا شَافِيَ إِلَّا أَنْتَ، شِفَاءً لَا يُغَادِرُ سَقَمًا».

عەبدولعەزیزی کوڕی سوهەیب دەڵێت: من و سابیت چووینە لای ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه، سابیت گوتی: ئەی باوکی حەمزە نەخۆشم، ئەنەس رضي الله عنه گوتی: ئایا دوعای چاکبوونەوەت بۆ بکەم بە دوعای پێغەمبەری خوا ﷺ؟، گوتی: بەڵێ، ئەنەس گوتی: «ئەی خوای پەروەردگاری خەڵک، لابەری ئێش و نەخۆشی، شیفای بدە تۆ شیفادەری، هیچ شیفادەرێکی تەواو نییە جگە لە تۆ، شیفایەک نەخۆشییەکان لاببات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَثِّ عَلَى الوَصِيَّةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هاندان بۆ وەسییەت

١٩٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ وَلَهُ شَيْءٌ يُوصِي فِيهِ إِلَّا وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ».

ئیبن عومەر رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕەوا نییە بۆ موسوڵمان کە شتێک هەبێت وەسییەتی بۆ بکات و دوو شەوی بەسەردا بڕوات، مەگەر وەسییەتەکەی (بنووسێت و) بە نووسراوی لەلای نەبێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَلْقِينِ المَرِيضِ عِنْدَ المَوْتِ، وَالدُّعَاءِ لَهُ عِنْدَهُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی یادهێنانەوەی نەخۆش لە کاتی مەرگ و پاڕانەوە بۆ کردنی

١٩٨. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَقِّنُوا مَوْتَاكُمْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ».

ئەبو سەعید رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «یادی ئەوانە بێننەوە کە لە سەرەمەرگن بە گوتنی وشەی: (لا اله الا الله)».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الصَّبْرَ فِي الصَّدْمَةِ الأُولَى

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا ئارامی تەواو لە یەکەم ساتی ناخۆشیەکەیە

١٩٩. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأُولَى».

ئەنەسی کوڕی مالیک رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ئارامی تەواو لە ساتی یەکەمی هاتنی بەڵایە (لە سەرەتای ڕووداوەکە پێویستە ئارامیت هەبێت)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَقْبِيلِ المَيِّتِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ماچکردنی مردوو

٢٠٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَبَّلَ عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ وَهُوَ مَيِّتٌ وَهُوَ يَبْكِي، أَوْ قَالَ: عَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ عوسمانی کوڕی مەزعوونی ماچ کرد کاتێک وەفاتی کرد و بۆی دەگریا، یان گوتی: چاوەکانی فرمێسکیان دەڕژاند.

## بَابٌ فِي مَا جَاءَ فِي المِسْكِ لِلْمَيِّتِ

## باسێك دەربارەی ئەوەی هاتووە سەبارەت بە بەکارهێنانی میسک بۆ مردوو



٢٠١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَطْيَبُ الطِّيبِ المِسْكُ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خۆشترین و پاکترین بۆن بۆنی میسکە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الغُسْلِ مِنْ غُسْلِ المَيِّتِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆشوشتن بەهۆی شوشتنی مردوو

٢٠٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مِنْ غُسْلِهِ الغُسْلُ، وَمِنْ حَمْلِهِ الوُضُوءُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «بەهۆی شوشتنی مردوو خۆشوشتنەوە (پێویستە)، بەهۆی هەڵگرتنی مردوو دەستنوێژ شوشتنەوە (پێویستە)».

* وَقَدْ اخْتَلَفَ أَهْلُ العِلْمِ فِي الَّذِي يُغَسِّلُ المَيِّتَ، فَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: إِذَا غَسَّلَ مَيِّتًا فَعَلَيْهِ الغُسْلُ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: عَلَيْهِ الوُضُوءُ، وقَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ: أَسْتَحِبُّ الغُسْلَ مِنْ غُسْلِ المَيِّتِ، وَلَا أَرَى ذَلِكَ وَاجِبًا، وَهَكَذَا قَالَ الشَّافِعِيُّ، وقَالَ أَحْمَدُ: مَنْ غَسَّلَ مَيِّتًا أَرْجُو أَنْ لَا يَجِبَ عَلَيْهِ الغُسْلُ، وَأَمَّا الوُضُوءُ فَأَقَلُّ مَا قِيلَ فِيهِ.

زانایان ڕاجیان سەبارەت بەو کەسەی مردوو دەشوات، هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیری ئەوانیش گوتوویانە: ئەگەر کەسێک مردووی شوشت ئەوە خۆشوشتنی لەسەر پێویستە، هەندێکی دیکە لە زانایان گوتوویانە: تەنها دەستنوێژی لەسەر پێویستە، مالیکی کوڕی ئەنەس گوتوویەتی: بە پەسندی دەزانم خۆشوشتن بەهۆی شوشتنی مردوو، پێم وا نییە واجب بێت، شافیعیش هەمان بۆچوونی هەیە، ئەحمەد گوتوویەتی: هەر کەسێک مردوو بشوات ئومێدم وایە خۆشوشتنی لەسەر واجب نەبێت، بەڵام دەستنوێژ کەمترین شتە کە بۆی بگوترێت (ڕەحمەتی خوا لە هەموو زانایان بێت).



## بَابُ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الأَكْفَانِ

### باسی ئەو جۆرە کفنەی بەباش زانراوە

٢٠٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «البَسُوا مِنْ ثِيَابِكُمُ البَيَاضَ، فَإِنَّهَا مِنْ خَيْرِ ثِيَابِكُمْ، وَكَفِّنُوا فِيهَا مَوْتَاكُمْ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە بەرگ و پۆشاکدا پۆشاکی سپی لەبەر بکەن، لەبەر ئەوەی باشترین پۆشاکتان سپییە، مردووەکانیشتان هەر بە خامی سپی کفن بکەن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنْ ضَرْبِ الخُدُودِ، وَشَقِّ الجُيُوبِ عِنْدَ المُصِيبَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە لە ڕێگریکردنی لە ڕوومەتدان و یەخەداڕنین لە کاتی بەڵا و ناخۆشیدا

٢٠٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ شَقَّ الجُيُوبَ، وَضَرَبَ الخُدُودَ، وَدَعَا بِدَعْوَةِ الجَاهِلِيَّةِ».

عەبدوڵڵا ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «لە ئێمە نییە ئەو کەسەی یەخەی دابڕنێت و لە ڕوومەتی خۆی بدات و هاوار بکات بەهاوارکردنی نەفامییەت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِسْرَاعِ بِالجَنَازَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پەلەکردن لە شاردنەوەی مردوو



٢٠٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَسْرِعُوا بِالجَنَازَةِ، فَإِنْ يَكُنْ خَيْرًا تُقَدِّمُوهَا إِلَيْهِ، وَإِنْ يَكُنْ شَرًّا تَضَعُوهُ عَنْ رِقَابِكُمْ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «پەلە بکەن لە شاردنەوەی مردوو، ئەگەر کەسێکی چاك بێت ئەوە باشترین شتە کە پێشکەشی دەکەن و دەیگەیەنن بە شوێنی خۆی، ئەگەر واش نەبێت کەسێکی خراپ بێت، ئەوە خراپەیەکە لەکۆڵ خۆتانی دەکەنەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّكْبِيرِ عَلَى الجَنَازَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گوتنی (الله أكبر) لەسەر جەنازە

٢٠٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى عَلَى النَّجَاشِيِّ فَكَبَّرَ أَرْبَعًا.

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر نەجاشی کرد، بە گوتنی چوار تەکبیر (الله اکبر).

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: يَرَوْنَ التَّكْبِيرَ عَلَى الجَنَازَةِ أَرْبَعَ تَكْبِيرَاتٍ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیری ئەوانیش کە: گوتنی (الله أکبر) لەسەر جەنازە چوار تەکبیرە.

## بَابُ مَا يَقُولُ فِي الصَّلَاةِ عَلَى المَيِّتِ

### باسی ئەوەی دەگوترێت لە نوێژ لەسەر مردوو



٢٠٧. عَنْ أَبِي إِبْرَاهِيمَ الأَشْهَلِيِّ، عَنْ أَبِيهِ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا صَلَّى عَلَى الجَنَازَةِ، قَالَ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِحَيِّنَا وَمَيِّتِنَا، وَشَاهِدِنَا وَغَائِبِنَا، وَصَغِيرِنَا وَكَبِيرِنَا، وَذَكَرِنَا وَأُنْثَانَا».

ئەبو ئیبراهیمی ئەشهەلی، لە باوکیەوە ﷺ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر نوێژی لەسەر مردوویەک کردبا، دەیفەرموو: «ئەی خوایە لە زیندوو و مردوومان خۆش ببە، لە ئامادەبووان و ئامادەنەبووانمان، لە بچووک و گەورەمان، لە نێر و مێیمان».

٢٠٨. عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي عَلَى مَيِّتٍ، فَفَهِمْتُ مِنْ صَلَاتِهِ عَلَيْهِ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ، وَارْحَمْهُ، وَاغْسِلْهُ بِالبَرَدِ، وَاغْسِلْهُ كَمَا يُغْسَلُ الثَّوْبُ».

عەوفی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کاتێک نوێژی لەسەر مردوویەک دەکرد جا ئەوەی لە پاڕانەوەکەی گەیشتم لە نوێژەکەیدا

دەیفەرموو: «ئەی خوایە لێی ببوورە و ڕەحمی پێ بکە و بیشۆرە (لە گوناهەکانی) بە ئاوی تەرزە، بیشۆرە (لە گوناهەکانی) هەروەک چۆن بەرگ و پۆشاک دەشۆردرێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي القِرَاءَةِ عَلَى الجَنَازَةِ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێندنی فاتیحە لە نوێژی مردوودا

٢٠٩. عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَوْفٍ: أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ صَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ، فَقَرَأَ بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ، فَقُلْتُ لَهُ، فَقَالَ: إِنَّهُ مِنَ السُّنَّةِ، أَوْ مِنْ تَمَامِ السُّنَّةِ.

تەلحەی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عەوف دەگێڕێتەوە: ئیبن عەبباس ﷺ نوێژی کرد لەسەر مردوویەک، سووڕەتی فاتیحەی خوێند، سەبارەت بەو کارەی پرسیارم لێ کرد؟ ئەویش گوتی: خوێندنی سووڕەتی فاتیحە لە کاری پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، یان گوتی: لە تەواویی سوننەت ئەوەیە (فاتیحە بخوێنرێت).

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: يَخْتَارُونَ أَنْ يُقْرَأَ: بِفَاتِحَةِ الكِتَابِ بَعْدَ التَّكْبِيرَةِ الأُولَى، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: لَا يُقْرَأُ فِي الصَّلَاةِ عَلَى الجَنَازَةِ، إِنَّمَا هُوَ ثَنَاءٌ عَلَى اللهِ، وَالصَّلَاةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، وَالدُّعَاءُ لِلْمَيِّتِ، وَهُوَ قَوْلُ الثَّوْرِيِّ، وَغَيْرِهِ مِنْ أَهْلِ الكُوفَةِ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیر ئەوانیش کە: ئەوەیان هەڵبژاردووە کە سووڕەتی فاتیحە بخوێندرێت لەدوای تەکبیری یەکەم، ئەمە بۆچوونی شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە، هەندێکی دیکە لە زانایان گوتوویانە: هیچ سووڕەتێک ناخوێندرێت لە نوێژی مردوو، بەڵکوو مەدح و سەنایە بەسەر خوا، سەڵاواتدانە لە پێغەمبەر ﷺ، دوعا و پاڕانەوەیە بۆ مردوو، ئەمەش بۆچوونی

سوفیان سەوری و کەسانی دیکەیە لە خەڵکی کوفە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الصَّلَاةِ عَلَى الجَنَازَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشتی نوێژکردن لەسەر مردوو

٢١٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَلَّى عَلَى جَنَازَةٍ فَلَهُ قِيرَاطٌ، وَمَنْ تَبِعَهَا حَتَّى يُقْضَى دَفْنُهَا فَلَهُ قِيرَاطَانِ، أَحَدُهُمَا أَوْ أَصْغَرُهُمَا مِثْلُ أُحُدٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک نوێژ لەسەر مردوویەک بکات، قیراتیکی (پاداشت) بۆ هەیە، جا ئەگەر بەدوایدا ڕۆیشت تا دەنێژرێت، دوو قیراتی بۆ هەیە، یەکێکیان یان بچوکترینیان وەکوو چیای ئوحودە».



## بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا أُدْخِلَ المَيِّتُ القَبْرَ

### باسی ئەوەی دەگوترێت کاتێك مردوو دەخرێتە نێو گۆڕەوە

٢١١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أُدْخِلَ المَيِّتُ القَبْرَ، وَقَالَ أَبُو خَالِدٍ مَرَّةً: إِذَا وُضِعَ المَيِّتُ فِي لَحْدِهِ، قَالَ مَرَّةً: «بِسْمِ اللَّهِ وَبِاللَّهِ، وَعَلَى مِلَّةِ رَسُولِ اللَّهِ»، وَقَالَ مَرَّةً: «بِسْمِ اللَّهِ وَبِاللَّهِ وَعَلَى سُنَّةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: کاتێک کە مردوو دەخرایە نێو گۆڕ، ئەبو خالیدی گێڕەرەوە جارێکیان گوتی: کاتێک مردوو دەخرایە نێو لاگۆڕەکەی، (پێغەمبەر ﷺ) جارێکیان فەرمووی: «بە ناوی خوا، پەنا بە خوا، لەسەر میللەتی پێغەمبەری خوا ﷺ»، جارێکی دیکە فەرمووی: «بە ناوی خوا، پەنا بە خوا، لەسەر سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ المَشْيِ عَلَى القُبُورِ، وَالجُلُوسِ عَلَيْهَا، وَالصَّلَاةِ إِلَيْهَا

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێگریی ڕۆیشتن و دانیشتن لەسەر گۆڕ و نوێژ ڕووەو گۆڕ

٢١٢. عَنْ أَبِي مَرْثَدٍ الغَنَوِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تَجْلِسُوا عَلَى القُبُورِ، وَلَا تُصَلُّوا إِلَيْهَا».

ئەبو مەرڕسەدی غەنەوی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «لەسەر گۆڕ دامەنیشن، نوێژیش مەکەن ڕووەو گۆڕ».

٢١٣. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: نَهَى النَّبِيُّ ﷺ أَنْ تُجَصَّصَ القُبُورُ، وَأَنْ يُكْتَبَ عَلَيْهَا، وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهَا، وَأَنْ تُوطَأَ.

جابیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە کە گۆڕ گەچکاری بکرێت، لەسەری بنووسرێت و شتی لەسەر دروست بکرێت، هەروەها بە پێ بەسەری بکەوێت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الثَّنَاءِ الحَسَنِ عَلَى المَيِّتِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەچاکە باسکردنی مردوو

٢١٤. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: مُرَّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِجَنَازَةٍ، فَأَثْنَوْا عَلَيْهَا خَيْرًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَجَبَتْ»، ثُمَّ قَالَ: «أَنْتُمْ شُهَدَاءُ اللَّهِ فِي الأَرْضِ».

ئەنەس ﵁ دەڵێت: جەنازەیەک تێپەڕ کرا بەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ، خەڵکی بەچاکە باسیان کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بۆی پێویست کرا»، ئینجا فەرمووی: «ئێوە شایەتیدەری خوان لەسەر زەوی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الشُّهَدَاءِ مَنْ هُمْ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی شەهیدان کێن؟

٢١٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الشُّهَدَاءُ خَمْسٌ: الْمَطْعُونُ، وَالمَبْطُونُ، وَالغَرِقُ، وَصَاحِبُ الهَدْمِ، وَالشَّهِيدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «شەهیدەکان پێنج جۆرن: مردن بە تاعوون، مردن بە ژانەسک، خنکان، مردن بەهۆی داڕمان، شەهید لەپێناو خوا».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێک دیداری خوای پێخۆش بێت، خواش دیداری ئەوی پێخۆشە



٢١٦. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ ذَكَرَتْ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ أَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَمَنْ كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ كَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ»، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كُلُّنَا نَكْرَهُ المَوْتَ، قَالَ: «لَيْسَ ذَلِكَ، وَلَكِنَّ المُؤْمِنَ إِذَا بُشِّرَ بِرَحْمَةِ اللَّهِ وَرِضْوَانِهِ وَجَنَّتِهِ، أَحَبَّ لِقَاءَ اللَّهِ، وَأَحَبَّ اللَّهُ لِقَاءَهُ، وَإِنَّ الكَافِرَ إِذَا بُشِّرَ بِعَذَابِ اللَّهِ وَسَخَطِهِ، كَرِهَ لِقَاءَ اللَّهِ، وَكَرِهَ اللَّهُ لِقَاءَهُ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک دیداری خوای پێخۆش بێت، خوا دیداری ئەوی پێخۆشە، هەر کەسێک دیداری خوای پێناخۆش بێت، ئەوە خواش دیداری ئەوی پێناخۆشە»، جا (عائیشە) دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری، خوا ئێمە هەموومان مردنمان پێناخۆشە! فەرمووی: «مەبەست ئەوە نییە، بەڵکوو بڕوادار کاتێک ئەگەر موژدەی پێ درا بە میهرەبانی خوا و ڕەزامەندی

خوا و بەهەشتەکەی، ئەو کاتە ئەو دیداری خوای پێخۆشە، خواش دیداری ئەوی پێخۆشە، بێبڕواش ئەگەر موژدەی پێ درا بە سزای خوا و توڕەبوونی خوا، ئەوساکە ڕقی لە دیداری خوایە، خواش ڕقی لە دیداری ئەوە».

تێبینی:

لێرەدا مەبەست لەوەیە کاتێک مرۆڤ لە مردن نزیک دەبێتەوە و بە جۆرێک لە جۆرەکان ئاگادار دەکرێتەوە، ئەو کاتە بڕوادار دیداری خوای پێخۆشە و بێبڕواش پێیناخۆشە، چونکە هەردووکیان دەزانن کە چی چاوەڕێیانە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ لَمْ يُصَلَّ عَلَيْهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی خۆی کوشتووە و نوێژی لەسەر نەکراوە



٢١٧. عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلاً قَتَلَ نَفْسَهُ، فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ.

جابیری کوڕی سەمورە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: کەسێک خۆی کوشت، پێغەمبەر ﷺ نوێژی لەسەر نەکرد.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّلَاةِ عَلَى المَدْيُونِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نوێژکردن لەسەر قەرزدار

٢١٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ المُتَوَفَّى عَلَيْهِ الدَّيْنُ، فَيَقُولُ: «هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ مِنْ قَضَاءٍ؟»، فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّهُ تَرَكَ وَفَاءً صَلَّى عَلَيْهِ، وَإِلَّا قَالَ لِلْمُسْلِمِينَ: «صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ»، فَلَمَّا فَتَحَ اللهُ عَلَيْهِ الفُتُوحَ، قَامَ فَقَالَ: «أَنَا أَوْلَى بِالمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ تُوُفِّيَ مِنَ المُسْلِمِينَ فَتَرَكَ دَيْنًا عَلَيَّ قَضَاؤُهُ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَهُوَ لِوَرَثَتِهِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: جاری وا هەبووە پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێکی مردوویان هێناوەتە خزمەتی قەرزی لەسەر بووە (تا نوێژی لەسەر بکات)، دەیفەرموو: «ئایا هیچی جێ هێشتووە بۆ دانەوەی قەرزەکەی؟»، ئەگەر گوترابا: جێی هێشتووە بۆ دانەوەی، ئەو کات نوێژی لەسەر دەکرد، ئەگەرنا بە موسوڵمانەکانی دەفەرموو: «نوێژ لەسەر هاوەڵەکەتان بکەن»، کاتێک خوا داهاتی گرتنی وڵاتانی پێ دا، هەستایەوە و فەرمووی: «من لە بڕواداران نزیکترم لە خودی خۆیان، جا هەر کەسێک لە موسوڵمانان بمرێت و قەرزی لەسەر بێت، ئەوە دانەوەی لەسەر منە، هەر کەسێکیشماڵی لەدوای خۆی جێ هێشت، ئەو ماڵە بۆ میراتگرەکانیەتی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي عَذَابِ القَبْرِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سزای نێوگۆڕ



٢١٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا مَاتَ المَيِّتُ عُرِضَ عَلَيْهِ مَقْعَدُهُ، إِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ فَمِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ، وَإِنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَمِنْ أَهْلِ النَّارِ، ثُمَّ يُقَالُ: هَذَا مَقْعَدُكَ حَتَّى يَبْعَثَكَ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێک کەسێک مرد شوێنەکەی پیشان دەدرێت (لەنێو گۆڕ)، ئەگەر ئەهلی بەهەشت بوو، ئەوە شوێنی بەهەشتییەکانی پیشان دەدرێت، خۆ ئەگەر ئەهلی دۆزەخیش بێت، شوێنی دۆزەخییەکانی پیشان دەدرێت، ئینجا پێی دەگوترێت: ئەمە شوێنەکەتە هەتا ئەو ڕۆژەی خوا زیندووت دەکاتەوە بۆی لە ڕۆژی قیامەت».



# أَبْوَابُ النِّكَاحِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## كۆباسی هاوسەرگیری لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ التَّزْوِيجِ، وَالحَثِّ عَلَيْهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی هاوسەرگیری و هاندان بۆ ئەنجامدانی



**٢٢٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ، وَنَحْنُ شَبَابٌ لَا نَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ، فَقَالَ:** «يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، عَلَيْكُمْ بِالبَاءَةِ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، فَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ مِنْكُمُ البَاءَةَ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّ الصَّوْمَ لَهُ وِجَاءٌ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه دەڵێت: جارێکیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دەرچووین، لە کاتێک ئێمە گەنج بووین توانای هیچمان نەبوو (بێ پارە بووین)، جا بە ئێمەی فەرموو: «ئەی کۆمەڵی لاوان، هەوڵی بەدەستهێنانی توانا (ی ئەرک و مافی هاوسەرگیری) بدەن، چونکە ژنهێنان یارمەتیدەرە بۆ چاوپۆشی، بۆ داوێنپاکی کاریگەرترە، هەر یەکێکیشتان نەیتوانی (هاوسەرگیری بکات)، با ڕۆژوو بگرێت، چونکە بەڕۆژووبوون بۆ ئەو ئارەزووڕەوێنە».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ المَرْأَةَ تُنْكَحُ عَلَى ثَلَاثِ خِصَالٍ

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا ئافرەت داخوازی دەکرێت بەهۆی سێ تایبەتمەندییەوە

٢٢١. عَنْ جَابِرٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ المَرْأَةَ تُنْكَحُ عَلَى دِينِهَا، وَمَالِهَا، وَجَمَالِهَا، فَعَلَيْكَ بِذَاتِ الدِّينِ، تَرِبَتْ يَدَاكَ».

جابیر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئافرەت لەپێناو چوار شت دەخوازی دەکرێت: لەبەر ماڵەکەی یان لەبەر نەژاد و بنەماڵەکەی یان لەبەر جوانییەکەی یان لەبەر دینداریيەکەی، ئینجا تۆ خاوەن دینەکە هەڵبژێرە، دەستت بە خۆڵدا بچێت».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّظَرِ إِلَى المَخْطُوبَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سەیرکردنی خوازبێنیکراو

٢٢٢. عَنِ المُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﵁: أَنَّهُ خَطَبَ امْرَأَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «انْظُرْ إِلَيْهَا، فَإِنَّهُ أَحْرَى أَنْ يُؤْدَمَ بَيْنَكُمَا».

موغیرەی کوڕی شوعبە ﵁ دەگێڕێتەوە: خوازبێنی ئافرەتێکی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «سەیری بکە، چونکە شیاوترە بۆ بەردەوامی ڕێز و خۆشەویستی نێوانتان».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَا يُقَالُ لِلْمُتَزَوِّجِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەگوترێت بۆ کەسێک تازە هاوسەرگیری کردبێت

٢٢٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا رَفَّأَ الإِنْسَانَ إِذَا تَزَوَّجَ، قَالَ: «بَارَكَ

اللَّهُ لَكَ، وَبَارَكَ عَلَيْكَ، وَجَمَعَ بَيْنَكُمَا فِي الخَيْرِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێک کە پیرۆزبایی کردبایە لە کەسێک بەهۆی هاوسەرگیریکردنیەوە، دەیفەرموو: «خوا بەرەکەتت پێ بدات، بەرەکەت بڕژێنێتە سەرتان، لەسەر چاکە و خێر کۆتان بکاتەوە».

## بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا دَخَلَ عَلَى أَهْلِهِ

### باسی ئەوەی دەگوترێت لە کاتی چوونە لای هاوسەر

٢٢٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ قَالَ: بِسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ، وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، فَإِنْ قَضَى اللَّهُ بَيْنَهُمَا وَلَدًا لَمْ يَضُرَّهُ الشَّيْطَانُ».



ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان ویستی بچێتە لای هاوسەرەکەی، با بڵێت: بە ناوی خوا، ئەی خوایە شەیتانمان لێ دوور بخەوە، شەیتان دوور بخەوە لەو (منداڵ)ەش کە پێمان دەبەخشیت، جا ئەگەر خوا بڕیاری دا بەپێدانی منداڵێک پێیان، ئەوە شەیتان هیچ زیانی بۆی نابێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِجَابَةِ الدَّاعِي

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وەڵامدانەوەی بانگهێشت

٢٢٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ائْتُوا الدَّعْوَةَ إِذَا دُعِيتُمْ».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بڕۆنە داوەتی خواردن ئەگەر بانگهێشت کران».

# بَابُ مَا جَاءَ فِي تَزْوِيجِ الأَبْكَارِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەشوودانی کچان

٢٢٦. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «أَتَزَوَّجْتَ يَا جَابِرُ؟»، فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَ: «بِكْرًا، أَمْ ثَيِّبًا؟»، فَقُلْتُ: لَا، بَلْ ثَيِّبًا، فَقَالَ: «هَلَّا جَارِيَةً تُلَاعِبُهَا وَتُلَاعِبُكَ؟»، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ مَاتَ، وَتَرَكَ سَبْعَ بَنَاتٍ أَوْ تِسْعًا، فَجِئْتُ بِمَنْ يَقُومُ عَلَيْهِنَّ، قَالَ: فَدَعَا لِي.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: هاوسەرگیریم لەگەڵ ئافرەتێک کرد، جا هاتمە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: «ئایا هاوسەرگیریت کردووە ئەی جابیر؟»، گوتم: بەڵێ، فەرمووی: «کچە یان بێوەژنە؟»، گوتم: نا، بەڵکوو بێوەژنە، فەرمووی: «ئەی نەدەبووایە کچ بێت تا گەمەی لەگەڵدا بکەیت و گەمەت لەگەڵدا بکات؟»، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، عەبدوڵلای باوکم مردووە، حەوت کچ یان نۆی لەدوا بەجێ ماوە، ژنێکی وام هێناوە کە بە کار و پێویستییان هەڵسێت، جابیر دەڵێت: جا دوعای بۆ کردم.

تێبینی:

لێرەدا مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە بۆ گەنجێکی تازەپێگەیشتوو وا باشتر و چاکترە کە هاوسەرگیری لەگەڵ کچ بکات نەک ئافرەتی بێوەژن، چونکە بەشێوەیەکی گشتی بەوجۆرە سەرکەوتوو دەبێت، ئەگەرنا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ گوزارشت نییە لە ناپەسندیی هاوسەرگیری لەگەڵ بێوەژن، بەڵکوو هەر خۆی لەو بوارەدا سەرمەشق بووە، زۆرینەی خێزانەکانی بێوەژن بوون کاتێک هاوسەرگیری لەگەڵ کردوون.

## بَابُ مَا جَاءَ لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍ

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا مارەبڕین دانامەزرێت بەبێ سەرپەرشتیار

٢٢٧. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا نِكَاحَ إِلَّا بِوَلِيٍّ».

ئەبو مووسا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مارەبڕین دانامەزرێت بەبێ سەرپەرشتیار».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي خُطْبَةِ النِّكَاحِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خوازبێنیکردنی هاوسەرگیری

٢٢٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ خُطْبَةٍ لَيْسَ فِيهَا تَشَهُّدٌ فَهِيَ كَالْيَدِ الجَذْمَاءِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر داخوازیکردنێک بەبێ گوتنی وشەی شایەتی بێت، وەکوو دەستی بڕاوەیە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي اسْتِئْمَارِ البِكْرِ وَالثَّيِّبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وەرگرتنی بۆچوونی کچ و بێوەژن (بۆ هاوسەرگیری)

٢٢٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُنْكَحُ الثَّيِّبُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلَا تُنْكَحُ البِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ، وَإِذْنُهَا الصُّمُوتُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێوەژن مارە ناکرێت تا

بڕیاری لە خۆی وەرنەگیرێت، کچیش مارە ناکرێت تا ڕەزامەندیی لێ وەرنەگیرێت، نیشانەی ڕازییبوونی کچ بێدەنگبوونە (بەهۆی شەرمەوە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي مُهُورِ النِّسَاءِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی مارەیی ئافرەتان

٢٣٠. عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ جَاءَتْهُ امْرَأَةٌ، فَقَالَتْ: إِنِّي وَهَبْتُ نَفْسِي لَكَ، فَقَامَتْ طَوِيلاً، فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَزَوِّجْنِيهَا إِنْ لَمْ تَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ، فَقَالَ: «هَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ تُصْدِقُهَا؟»، فَقَالَ: مَا عِنْدِي إِلاَّ إِزَارِي هَذَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِزَارُكَ، إِنْ أَعْطَيْتَهَا جَلَسْتَ، وَلاَ إِزَارَ لَكَ، فَالتَمِسْ شَيْئًا؟»، قَالَ: مَا أَجِدُ، قَالَ: «فَالتَمِسْ، وَلَوْ خَاتَمًا مِنْ حَدِيدٍ» قَالَ: فَالتَمَسَ، فَلَمْ يَجِدْ شَيْئًا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «هَلْ مَعَكَ مِنَ القُرْآنِ شَيْءٌ؟»، قَالَ: نَعَمْ، سُورَةُ كَذَا، وَسُورَةُ كَذَا، لِسُوَرٍ سَمَّاهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «زَوَّجْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ القُرْآنِ».

سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی ﵁ دەگێڕێتەوە: ئافرەتێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا وا من خۆمم پێشکەش کردووە بە تۆ، ئافرەتەکە بۆ ماوەیەکی زۆر وەستا، ئینجا پیاوێک لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بیکە بە هاوسەرم، ئەگەر نیاز و پێویستت بەم ئافرەتە نەبێت (ئەگەر خۆت هاوسەرگیری لەگەڵ ناکەیت)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئایا هیچت هەیە (لە ماڵ و سامان) تا مارەییەکەی بدەیتێ؟»، پیاوەکە گوتی: نەخێر، هیچم نییە تەنیا ئەم پارچە پۆشاکەم هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «چی لە پۆشاکەکەت بکات، ئەگەر پێی ببەخشیت هیچت بۆ نامێنێتەوە، دادەنیشیت ئەو کات هیچ پۆشاکێکت نییە، دە هەوڵ بدە شتێکت دەست بکەوێت»، گوتی: هیچم نییە، فەرمووی: «هەوڵ بدە شتێکت دەست بکەوێت

ئەگەر ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێت»، پیاوەکە چوو شتێکی دەست بکەوێت، بەڵام گەڕایەوە هیچ شتێکی دەست نەکەوت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئایا هیچت لە قورئان لەلایە (دەیزانیت)؟»، پیاوەکە گوتی: بەڵێ، ئەم سوورەتە و ئەو سوورەتە، دەستی کرد بەناوهێنانی سوورەتەکان، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بڕۆ وا لێم مارە کردی لەسەر ئەوەی لەلاتە لە قورئان (کە فێری بکەیت)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُحِلِّ وَالْمُحَلَّلِ لَهُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی حەڵاڵکەری (ئافرەتانی تەڵاقدراو) و بۆحەڵاڵکراو

٢٣١. عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَعَنَ الْمُحِلَّ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ.

عەلی رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لەو پیاوەی ئافرەت بۆ کەسێکی دیکە حەڵاڵ دەکاتەوە و ئەوەیشی بۆی حەڵاڵ دەکرێتەوە.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَحْرِيمِ نِكَاحِ الْمُتْعَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەکردنی هاوسەرگیریی کاتی

٢٣٢. عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ، وَعَنْ لُحُومِ الْحُمُرِ الْأَهْلِيَّةِ زَمَنَ خَيْبَرَ.

عەلی کوڕی ئەبو تالیب رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی خەیبەردا مارەبڕینی ئافرەتی بەشێوەی کاتی قەدەغە کرد، هەروەها خواردنی گۆشتی گوێدرێژی ماڵیشی قەدەغە کرد.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنْ نِكَاحِ الشِّغَارِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەکردنی ژنبەژنە

٢٣٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الشِّغَارِ.

ئیبنو عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگریی کردووە لە ژنبەژنە.

تێبینی:

لە (سنن أبي داود هاتووە) موسەددەد دەڵێت: بە نافیعم گوت: ئەرێ شیغار چییە؟ گوتی: ئەم مارەی کچی ئەم پیاوە دەکات، ئەویش مارەی کچەکەی ئەم دەکات (ژنبەژنە دەکەن) بەبێ دانانی مارەیی، خوشکەکەی مارە دەکات ئەمیش خوشکەکەی خۆی پێ دەدات بەبێ دانانی مارەیی.



## بَابُ مَا جَاءَ لَا تُنْكَحُ المَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا وَلَا عَلَى خَالَتِهَا

### باسی ئەوەی هاتووە ئافرەت کۆ ناکرێتەوە لەگەڵ خوشکی باوکی، یان خوشکی دایکی

٢٣٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى أَنْ تُزَوَّجَ المَرْأَةُ عَلَى عَمَّتِهَا، أَوْ عَلَى خَالَتِهَا.

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئافرەتێک لەگەڵ خوشکی باوکی، یان لەگەڵ خوشکی دایکی کۆ ناکرێتەوە (واتە: بەیەکەوە نابنە هاوسەری یەك پیاو)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الشَّرْطِ عِنْدَ عُقْدَةِ النِّكَاحِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دانانی مەرج لە کاتی هاوسەرگیری

٢٣٥. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الجُهَنِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: «إِنَّ أَحَقَّ الشُّرُوطِ أَنْ يُوفَى بِهَا مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الفُرُوجَ».

عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: «بێگومان شاییستەترین مەرج کە پەیڕەوی لێ بکرێت (بەوەفا بیت بەرانبەری)، ئەو مەرجانەن کە دامێنی پێ حەڵاڵ دەکرێت (مەرجەکانی هاوسەرگیری)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي العَزْلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گرتنەوەی مەنی (لە کاتی سەرجێی)

٢٣٦. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: قُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا كُنَّا نَعْزِلُ، فَزَعَمَتِ اليَهُودُ أَنَّهَا المَوْءُودَةُ الصُّغْرَى، فَقَالَ: «كَذَبَتِ اليَهُودُ، إِنَّ اللَّهَ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْلُقَهُ فَلَمْ يَمْنَعْهُ».

جابیر رضي الله عنهما دەڵێت: گوتمان ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە ڕێگری دەکەین لە منداڵبوون، جوولەکەکان دەڵێن: ئەو کارە زیندەبەچاڵی بچووکە! فەرمووی: «جوولەکەکان درۆ دەکەن، بێگومان خوا ئەگەر خواستی دروستکردنی بۆ هەبێت، ئەم کارە (خواستی ئەو) ڕەت ناکاتەوە».

٢٣٧. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما قَالَ: كُنَّا نَعْزِلُ وَالقُرْآنُ يَنْزِلُ.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا رضي الله عنهما دەڵێت: ئێمە ڕێگریمان دەکرد لە منداڵبوون، قورئانیش لەو کاتەدا دادەبەزی (واتە: ئەگەر قەدەغەلێکراو بێت، ئەوە قورئان لێی قەدەغە دەکردین).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي القِسْمَةِ لِلْبِكْرِ وَالثَّيِّبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دابەشکاری لە نێوان ئافرەتی کچ و بێوەژن

٢٣٨. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: السُّنَّةُ إِذَا تَزَوَّجَ الرَّجُلُ البِكْرَ عَلَى امْرَأَتِهِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ عَلَى امْرَأَتِهِ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلَاثًا.

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێت: لە سوننەتە ئەگەر پیاوێک کچی هێنا بەسەر خێزانیدا، حەوت شەو لەلای بمێنێتەوە (ئینجا کاتەکان لە نێوانیاندا دابەش دەکات)، ئەگەر بێوەژنێکیشی هێنا، سێ ڕۆژ لەلای بمێنێتەوە.



# أبْوَابُ الرَّضَاعِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی شیرپێدان له پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ يُحَرَّمُ مِنَ الرَّضَاعِ مَا يُحَرَّمُ مِنَ النَّسَبِ

### باسی ئەوەی هەرچی بە ڕەچەڵەك حەرام دەبێت، بەهۆی شیرپێدانیشەوە حەرام دەبێت

٢٣٩. عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ مِنَ الرَّضَاعِ مَا حَرَّمَ مِنَ النَّسَبِ».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان ئەوەی بەهۆی شیرخواردن حەرام دەبێت، وەک ئەوەیە کە بەهۆی ڕەچەڵەکەوە حەرام کرابێت (دەبن بە خوشك و برا و برا و برازا و خاڵ و خوارزا و ... لە شیری)».

### بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الوَلَدَ لِلْفِرَاشِ

### باسی ئەوەی هاتووە ڕەچەڵەکی منداڵ بۆ خاوەن جێگایە

٢٤٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕەچەڵەکی منداڵ بۆ خاوەن جێگایە (کە پیاوی ئافرەتەکەیە)، پیاوی زیناکەر هەر بەردی بۆ دەمێنێتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي حَقِّ الزَّوْجِ عَلَى المَرْأَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی مافی پیاو بەسەر ئافرەتەوە

٢٤١. عَنْ طَلْقِ بْنِ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا الرَّجُلُ دَعَا زَوْجَتَهُ لِحَاجَتِهِ فَلْتَأْتِهِ، وَإِنْ كَانَتْ عَلَى التَّنُّورِ».

تەلقی کوڕی عەلی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر پیاو داوای لە ئافرەتەکەی کرد بۆ پێویستییەکەی با بەدەمیەوە بچێت، ئەگەر لەسەر تەندووریش بێت».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي حَقِّ المَرْأَةِ عَلَى زَوْجِهَا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی مافی ئافرەت بەسەر پیاوەکەی

٢٤٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَكْمَلُ المُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا، وَخَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِنِسَائِهِمْ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان ئیمان تەواوترینی بڕواداران ڕەوشت جوانترینیانە و باشترینتان باشترینتانن بۆ ژنەکانتان (هاوسەرانتان)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الدُّخُولِ عَلَى المُغِيبَاتِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەی سەردانکردنی ئافرەتان (کە مێردی لەلا نەبێت)

٢٤٣. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالدُّخُولَ عَلَى النِّسَاءِ»، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَفَرَأَيْتَ الحَمْوَ؟ قَالَ: «الحَمْوُ المَوْتُ».

عوقبەی کوڕی عامیر رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئاگادار بن نەکەن بچنە ژوورەوە بۆ لای ئافرەتان»، جا پیاوێک لە ئەنصارییەکان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی ئەگەر (خزمی) نزیکی مێردەکەی بێت؟ فەرمووی: «کەسی نزیکی پیاوەکەی هەر مردنە».



تێبینی:

تێکەڵاویی ژن و پیاو، کچ و کوڕ کە نامەحەرەم بن ڕێگەپێنەدراوە، نابێت ڕێگە خۆش بکرێت بۆ تێکەڵاوبوون بە هەر بیانوویەك بێت، بەتایبەت خزمی نزیك کارەساتی گەورەیی لێ کەوتۆتەوە، بۆیە فەرموویەتی: خزم هەر مردنە، چونکە بە بیانووی ئەوەی خزمن ئاسانتر دەتوانن سەردانی یەکدی بکەن و یەکدی ببینن.

# أَبْوَابُ الطَّلَاقِ وَاللِّعَانِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

**كۆباسی تەڵاق و نەفرین (ی ژن و مێرد) لە پێغەمبەری خواوە ﷺ**

## بَابُ مَا جَاءَ فِي طَلَاقِ السُّنَّةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تەڵاق بەپێی سوننەت



٢٤٤. عنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه: أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ فِي الحَيْضِ، فَسَأَلَ عُمَرُ النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالَ: «مُرْهُ فَلْيُرَاجِعْهَا، ثُمَّ لِيُطَلِّقْهَا طَاهِرًا أَوْ حَامِلاً».

سالیم، لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: کە باوکی خێزانەکەی تەڵاق داوە لە کاتێکدا لە حەیزدا بووە، عومەری باوکی پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد (سەبارەت بەو تەڵاقدانە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «فەرمانی پێ بکە با بیگەڕێنێتەوە، ئینجا لە کاتی پاکبوونەوە یان سکپڕی با تەڵاقی بدات».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ طَلَاقَ السُّنَّةِ أَنْ يُطَلِّقَهَا طَاهِرًا مِنْ غَيْرِ جِمَاعٍ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: إِنْ طَلَّقَهَا ثَلَاثًا وَهِيَ طَاهِرٌ فَإِنَّهُ يَكُونُ لِلسُّنَّةِ أَيْضًا، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ: وقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا تَكُونُ ثَلَاثًا لِلسُّنَّةِ إِلَّا أَنْ يُطَلِّقَهَا وَاحِدَةً وَاحِدَةً، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ،

وَإِسْحَاقَ، وَقَالُوا فِي طَلَاقِ الحَامِلِ: يُطَلِّقُهَا مَتَى شَاءَ، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وقَالَ بَعْضُهُمْ: يُطَلِّقُهَا عِنْدَ كُلِّ شَهْرٍ تَطْلِيقَةً.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیری ئەوانیش کە: تەڵاقی سوننەت ئەوەیە کە ئافرەتەکە تەڵاق بدرێت لە کاتی پاکییەک کە تێیدا لەگەڵی جووت نەبووبێت، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: ئەگەر هاتو سێبەسێش تەڵاقی بدات کاتێک لە پاکیدایە، ئەوەش هەر تەڵاقی سوننەتە، ئەمە بۆچوونی شافیعی و ئەحمەدی کوڕی حەنبەلە، هەندێکی دیکە لە زانایان گوتوویانە: سێبەسێ تەڵاقی سوننەت نییە، تەنیا لە حاڵەتێکدا ئەگەر تەڵاقدانەکە یەک یەک بێت (نەک سێ بە سێ)، ئەمە بۆچوونی سوفیانی سەوری و ئیسحاقە، هەروەها سەبارەت بە تەڵاقدانی ئافرەتی دووگیان گوتوویانە: ئەوە تەڵاقی دەدات هەر کاتێک بیەوێت، ئەمە بۆچوونی شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە، هەندێکی دیکە لە زانایان گوتوویانە: لە هەر مانگێک بە یەک تەڵاقدان تەڵاقی دەدات.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي المُطَلَّقَةِ ثَلَاثًا لَا سُكْنَى لَهَا وَلَا نَفَقَةَ

### باسی ئەوەی هاتووە کە ئافرەتی سێبەسێ تەڵاقدراو مافی نیشتەجێی خەرجی ڕۆژانەی نییە

٢٤٥. عَنِ الشَّعْبِيِّ قَالَ: قَالَتْ فَاطِمَةُ بِنْتُ قَيْسٍ رضي الله عنها: طَلَّقَنِي زَوْجِي ثَلَاثًا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا سُكْنَى لَكِ وَلَا نَفَقَةَ».

شەعبی رضي الله عنه دەڵێت: فاتیمەی کچی قەیس رضي الله عنها گوتوویەتی: پیاوەکەم سێبەسێ تەڵاقی دام لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «نە مافی نیشتەجێت بۆ هەیە، نە خەرجی ڕۆژانەت بۆ هەیە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يُحَدِّثُ نَفْسَهُ بِطَلَاقِ امْرَأَتِهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی تەڵاقدانی ژنەکەی بەدڵیدا بێت

٢٤٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَجَاوَزَ اللَّهُ لِأُمَّتِي مَا حَدَّثَتْ بِهِ أَنْفُسَهَا مَا لَمْ تَكَلَّمْ بِهِ أَوْ تَعْمَلْ بِهِ».

ئەبو هوڕەیڕە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا چاپۆشی کردووە لە ئوممەتی من لەوەی بەدڵیاندا دێت، بەو مەرجەی بە زمان نەیگوتبێت و بە کردەوە ئەنجامی نەدات».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ: أَنَّ الرَّجُلَ إِذَا حَدَّثَ نَفْسَهُ بِالطَّلَاقِ لَمْ يَكُنْ شَيْءٌ حَتَّى يَتَكَلَّمَ بِهِ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە کە زانایان گوتوویانە: کەسێک تەڵاقدانی ژنەکەی بەدڵیدا بێت، ئەوە هیچی لەسەر نییە، هەتا بە قسە دەریدەبڕێت.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الخُلْعِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خولع (خۆداڕنینی ژن لە پیاوەکەی)

٢٤٧. عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ ﵂: أَنَّهَا اخْتَلَعَتْ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ فَأَمَرَهَا النَّبِيُّ ﷺ، أَوْ أُمِرَتْ أَنْ تَعْتَدَّ بِحَيْضَةٍ.

ڕوبەیعی کچی موعەویزی کوڕی عەفڕاء ﵂ دەڵێت: خولعی (پیاوەکەی) کرد لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێ کرد (یان گوتی: فەرمانم پێ کرا) ماوەی عیددەکەی بینیبێت یەک حەیز و پاکبوونەوە.

٢٤٨. عَنْ ثَوْبَانَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَيُّمَا امْرَأَةٍ سَأَلَتْ زَوْجَهَا طَلَاقًا مِنْ

غَيْرِ بَأْسٍ فَحَرَامٌ عَلَيْهَا رَائِحَةُ الجَنَّةِ».

سەوبان ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر ئافرەتێک بەبێ بوونی هیچ هۆکارێک داوای تەڵاق لە مێردەکەی بکات، بۆنی بەهەشتی لێ قەدەغە دەکرێت».

تێبینی:

کەواتە ئەگەر ئافرەت هیچ بیانوویەکی شەرعی بەدەستەوە نەبوو، پێویستە ئارام بگرێت و چاوەڕێی پاداشت بکات.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي مُدَارَاةِ النِّسَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دڵڕازیکردنی ئافرەتان



٢٤٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ المَرْأَةَ كَالضِّلَعِ إِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهَا كَسَرْتَهَا، وَإِنْ تَرَكْتَهَا اسْتَمْتَعْتَ بِهَا عَلَى عِوَجٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی ئافرەتان حاڵیان وەک پەراسوو وایە، ئەگەر بتەوێت ڕاستی بکەیتەوە دەیشکێنیت، ئەگەر وازیشی لێ بێنیت ئەوە هەر بەو خوارییە ژیانی لەگەڵ دەگوزەرێنیت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي اللِّعَانِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نەفرەتکردن (ی ژن و مێر لەیەکدی)

٢٥٠. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: لَاعَنَ رَجُلٌ امْرَأَتَهُ، وَفَرَّقَ النَّبِيُّ ﷺ بَيْنَهُمَا، وَأَلْحَقَ الوَلَدَ بِالأُمِّ.

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: جارێکیان پیاوێک نەفرەتکاری کرد لە ژنەکەی (نەفرەتیان لەیەکدی کرد بەهۆی تاوانبارکردن بە زینا)، پێغەمبەر ﷺ بڕیاری جیاکردنەوەی دا لە نێوانیان، ڕەچەڵەکی منداڵەکەشی دایەوە پاڵ دایکەکە.



# أَبْوَابُ الْبُيُوعِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## كۆباسی کڕین و فرۆشتن لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرْكِ الشُّبُهَاتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وازهێنان لە شتە گوماناوییەکان



٢٥١. عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «الحَلَالُ بَيِّنٌ وَالحَرَامُ بَيِّنٌ، وَبَيْنَ ذَلِكَ أُمُورٌ مُشْتَبِهَاتٌ، لَا يَدْرِي كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ أَمِنَ الحَلَالِ هِيَ أَمْ مِنَ الحَرَامِ، فَمَنْ تَرَكَهَا اسْتِبْرَاءً لِدِينِهِ وَعِرْضِهِ فَقَدْ سَلِمَ، وَمَنْ وَاقَعَ شَيْئًا مِنْهَا، يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَ الحَرَامَ، كَمَا أَنَّهُ مَنْ يَرْعَى حَوْلَ الحِمَى، يُوشِكُ أَنْ يُوَاقِعَهُ، أَلَا وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى، أَلَا وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَحَارِمُهُ».

نوعمانی کوڕی بەشیر رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «بێگومان حەڵاڵ دیار و ڕوونە، حەرامیش دیار و ڕوونە، لە نێوانیاندا هەندێک شتی گوماناوی هەیە، زۆربەی خەڵکی نایزانن ئایا حەڵاڵن یان حەرامن، هەر کەسێک دەستی لێ هەڵبگرێت بەنیازی ئەستۆپاکی لە ئایین و ئابڕووی خۆی، بێگومان پارێزراو دەبێت، هەر کەسێکیش بکەوێتە نێو شتێک لە گومانلێکراوەکان، نزیکە بکەوێتە نێو حەرامەوە، هەر وەک چۆن کەسێک بچێت لە نزیک پاوەنێک مەڕەکانی بلەوەڕێنێت، نزیکە مەڕەکانی تێدا بلەوەڕێن (بچنە نێو پاوانەکە)، ئاگادار بن هەموو

پاشایەک زەوی پاوانکراوی خۆی هەیە، ئاگادار بن پاوانی خوای گەورەش شتە حەرامکراوەکانن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَكْلِ الرِّبَا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خواردنی ڕیبا

٢٥٢. عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ آكِلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَشَاهِدَيْهِ، وَكَاتِبَهُ.

ئیبن مەسعوود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لە سووخۆر، لە بریکارەکەی، لە هەردوو شایەتیدەرەکانی، لە نووسەری گرێبەستەکەی.



## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ حَلَفَ عَلَى سِلْعَةٍ كَاذِبًا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێک بە درۆ سوێند بخوات بۆ کاڵایەکی بازرگانی

٢٥٣. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلَاثَةٌ لَا يَنْظُرُ اللَّهُ إِلَيْهِمْ يَوْمَ القِيَامَةِ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ»، قُلْنَا: مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَدْ خَابُوا وَخَسِرُوا؟ فَقَالَ: «المَنَّانُ، وَالمُسْبِلُ إِزَارَهُ، وَالمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالحَلِفِ الكَاذِبِ».

ئەبو زەڕ ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «سێ جۆرە کەس خوا لە ڕۆژی دوایی سەیریان ناکات (بە چاوی بەزەیی)، پاکیان ناکاتەوە، ئازارێکی بەئێشیان بۆ هەیە»، گوتمان: ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا؟ بەڕاستی بەدبەخت و دۆڕاون، فەرمووی: «ئەوەی لەنێو خەڵکی قسە دێنێت و دەبات (بۆ تێکدانی نێوانیان)، ئەوەی پۆشاکی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشێت (بەهۆی خۆبەزلزانین)، ئەوەی بە سوێندی بەدرۆ ڕەواج بە کاڵاکەی دەدات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّبْكِيرِ بِالتِّجَارَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کاری بازرگانی بە کاتی بەیانی زوو

٢٥٤. عَنْ صَخْرٍ الغَامِدِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لِأُمَّتِي فِي بُكُورِهَا»، قَالَ: وَكَانَ إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً، أَوْ جَيْشًا، بَعَثَهُمْ أَوَّلَ النَّهَارِ، وَكَانَ صَخْرٌ رَجُلًا تَاجِرًا، وَكَانَ إِذَا بَعَثَ تِجَارَةً بَعَثَهُمْ أَوَّلَ النَّهَارِ، فَأَثْرَى وَكَثُرَ مَالُهُ.

صەخری غامیدی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەی خوایە بەرەکەت بدە بە ئوممەتم لە کاتی سەرەتای بەیانی»، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر لەشکرێکی ڕەوانە کردبایە، لە سەرەتای بەیانی ڕەوانەی دەکرد، جا صەخر (ڕیوایەتکاری فەرمووده) کەسێکی بازرگان بوو، ئەگەر کاڵایەکی بازرگانی ڕەوانە کردبایە بۆ شوێنێک، لە سەرەتای بەیانی ڕەوانەی دەکرد، بەهۆی ئەو ڕەفتارەوە دەوڵەمەند بوو، ماڵ و سامانی زۆر بوو.



## بَابُ مَا جَاءَ لَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خەڵکی شارنشین شت بۆ خەڵکی دەشتنشین نەفرۆشێت

٢٥٥. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَبِيعُ حَاضِرٌ لِبَادٍ، دَعُوا النَّاسَ يَرْزُقُ اللَّهُ بَعْضَهُمْ مِنْ بَعْضٍ».

جابیر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «با شارنشین شتومەک بۆ لادێنشین نەفرۆشێت، واز لە خەڵکی بهێنن خوا ڕزق و ڕۆزی هەندێکیان بەهۆی هەندێکیانەوە دەدات (چونکە ئەگەر لادێییەکە بۆخۆی بیفرۆشێت، هەرزانتری دەدات و خەڵکی هەژار گرانیان لەسەر ناکەوێت)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ بَيْعِ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی فرۆشتنی شتێک کە لەلات نییە

٢٥٦. عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ ﷺ قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَأْتِينِي الرَّجُلُ يَسْأَلُنِي مِنَ البَيْعِ مَا لَيْسَ عِنْدِي، أَبْتَاعُ لَهُ مِنَ السُّوقِ، ثُمَّ أَبِيعُهُ؟ قَالَ: «لَا تَبِعْ مَا لَيْسَ عِنْدَكَ».

حەکیمی کوڕی حیزام ﷺ دەڵێت: هاتمە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتم: کەسی کڕیار دێتە لام داوای شتێکی وام لێ دەکات کە نیمە، منیش دەچم لە بازاڕ بۆی دەکڕم، ئینجا پێی دەفرۆشمەوە؟ فەرمووی: «شتێک مەفرۆشە کە نەتبێت».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ بَيْعِ الحَيَوَانِ بِالحَيَوَانِ نَسِيئَةً

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندی فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ بەشێوەی قەرز

٢٥٧. عَنْ سَمُرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الحَيَوَانِ بِالحَيَوَانِ نَسِيئَةً.

سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ بەقەرز.

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ فِي بَيْعِ الحَيَوَانِ بِالحَيَوَانِ نَسِيئَةً، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَأَهْلِ الكُوفَةِ، وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَقَدْ رَخَّصَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ فِي بَيْعِ الحَيَوَانِ بِالحَيَوَانِ نَسِيئَةً، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَإِسْحَاقَ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیری ئەوانیش کە: فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ بەشێوەی قەرز قەدەغەیە، ئەمە بۆچوونی

سوفیان سەوری و خەڵكی كوفەیە، هەروەها ئەحمەدیش هەمان شتی گوتووە، هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیری ئەوانیش ڕێگەیان داوە بە فرۆشتنی ئاژەڵ بە ئاژەڵ بەشێوەی قەرز، ئەمە بۆچوونی شافیعی و ئیسحاقە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّرْفِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئاڵوگۆڕی دراو

٢٥٨. عَنْ نَافِعٍ قَالَ: انطَلَقْتُ أَنَا وَابْنُ عُمَرَ رضي الله عنهما إِلَى أَبِي سَعِيدٍ فَحَدَّثَنَا، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعَتْهُ أُذُنَايَ هَاتَانِ يَقُولُ: «لَا تَبِيعُوا الذَّهَبَ بِالذَّهَبِ إِلَّا مِثْلًا بِمِثْلٍ، وَالفِضَّةَ بِالفِضَّةِ إِلَّا مِثْلًا بِمِثْلٍ، لَا يُشَفُّ بَعْضُهُ عَلَى بَعْضٍ، وَلَا تَبِيعُوا مِنْهُ غَائِبًا بِنَاجِزٍ».

نافیع دەڵێت: من و ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەرچووین بۆ لای ئەبو سەعید، بۆی گێڕاینەوە گوتی: بە گوێکانی خۆم لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیست دەیفەرموو: «زێڕ بە زێڕ مەفرۆشن تەنیا ئەگەر لەکێشدا وەکوو یەک وا بن، زیو بە زیو مەفرۆشن مەگەر لە کێشدا وەکوو یەک وا بن، لایەکیان بەنرختر دامەنێن لەوەکەی دی، نەکەن (زێڕ و زیوی) ئامادەنەکراو بفرۆشن بە (زێڕ و زیوی) ئامادەکراو».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي البَيِّعَيْنِ بِالخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا

### باسی ئەوەی هاتووە کە کڕیار و فرۆشیار سەرپشکن لە پەشیمانبوونەوە هەتا جیا دەبنەوە

٢٥٩. عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «البَيِّعَانِ بِالخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا، وَإِنْ كَتَمَا وَكَذَبَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا».

حەکیمی کوڕی حیزام ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کڕیار و فرۆشیار سەرپشکن لە هەڵوەشاندنەوە هەتا لەیەکدی جیا نەبوونەتەوە، جا ئەگەر ڕاستگۆ بن لەگەڵ یەکدی و کەموکورتییەکانیان بۆ یەکدی ڕوون کردەوە، ئەوە بەرەکەت دەکەوێتە کڕین و فرۆشتنەکەیان، ئەگەر کەموکورتییەکانیان شاردەوە و درۆیان لەگەڵ یەکدی کرد، ئەوە بەرەکەت لە کڕین و فرۆشتنەکەیاندا نامێنێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يُخْدَعُ فِي البَيْعِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێک کە فێڵی لێ دەکرێت لە کڕین و فرۆشتن

٢٦٠. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ رَجُلاً كَانَ فِي عُقْدَتِهِ ضَعْفٌ، وَكَانَ يُبَايِعُ، وَأَنَّ أَهْلَهُ أَتَوْا النَّبِيَّ ﷺ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، احْجُرْ عَلَيْهِ، فَدَعَاهُ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ، فَنَهَاهُ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنِّي لَا أَصْبِرُ عَنِ البَيْعِ، فَقَالَ: «إِذَا بَايَعْتَ فَقُلْ هَاءَ وَهَاءَ، وَلَا خِلَابَةَ».

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: پیاوێک هەبوو بێهێز بوو لە پێکانی (بەرژەوەندیی خۆی، فەقیرحاڵ بوو)، مامەڵەشی ئەنجام دەدا، بۆیە خانەوادەکەی هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا مامەڵەکردنی لێ قەدەغە بکە، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد و لێی قەدەغە کرد، پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، من ئارام ناگرم لەسەر مامەڵەنەکردن، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: «ئەگەر کڕین و فرۆشتنت کرد، بڵێ: ها (دەست بە دەست)، (بشڵێ:) بەبێ فرتوفێڵ (بۆئەوەی ئەگەر فێڵی تێدا بوو، دەرفەتی پەشیمانبوونەوەی هەبێت)».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، وَقَالُوا: الحَجْرُ عَلَى الرَّجُلِ الحُرِّ فِي البَيْعِ وَالشِّرَاءِ إِذَا كَانَ ضَعِيفَ العَقْلِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَلَمْ يَرَ بَعْضُهُمْ أَنْ يُحْجَرَ عَلَى الحُرِّ البَالِغِ.

کارکردن لەسەر ئەم فەرموودەیە لەلای هەندێک لە زانایان، گوتوویانە:

قەدەغەکردنی کڕین و فرۆشتن (پێویستە) لەسەر کەسێکی ئازاد ئەگەر لە ڕووی ژیرییەوە لاواز بێت، ئەمە وتەی (پێشەوایان) ئەحمەد و ئیسحاقە، هەندێکی دیکە لە زانایان گوتوویانە: نابێت مامەڵە لە کەسێکی ئازاد و باڵغ قەدەغە بکرێت.

## بَابُ مَا جَاءَ إِذَا أَفْلَسَ لِلرَّجُلِ غَرِيمٌ فَيَجِدُ عِنْدَهُ مَتَاعَهُ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی قەرزدارەکەی مایەپووچ دەبێت و ماڵەکەی (کاڵاکەی) خۆی لەلای دەبینێتەوە

٢٦١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «أَيُّمَا امْرِئٍ أَفْلَسَ وَوَجَدَ رَجُلٌ سِلْعَتَهُ عِنْدَهُ بِعَيْنِهَا فَهُوَ أَوْلَى بِهَا مِنْ غَيْرِهِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک مایەپووچ بوو، کەسی خاوەن مافیش خودی کاڵاکەی خۆی لەلای بینی، ئەوە ئەو شایستەترە بەو ماڵە لە غەیری خۆی».



٢٦٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَنْ ائْتَمَنَكَ، وَلَا تَخُنْ مَنْ خَانَكَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «کەسێك کە تۆی بە ئەمیندار داناوە، سپاردەکەی بدەوە، وە خیانەت لە کەسێك مەکە کە خیانەتی لە تۆ کردووە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاحْتِكَارِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قۆرخکاری

٢٦٣. عَنْ مَعْمَرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ نَضْلَةَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَحْتَكِرُ إِلَّا خَاطِئٌ».

مەعمەری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی نەزلە ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «جگە لە گوناهبار و هەڵەکار کەس قۆرخکاری ناکات (چونکە ئەمە پیشەی ئەوانە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنِ البَيْعِ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەکردنی مامەڵە بەسەر مامەڵەی برایەکەی

٢٦٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَبِيعُ بَعْضُكُمْ عَلَى بَيْعِ بَعْضٍ، وَلَا يَخْطُبُ بَعْضُكُمْ عَلَى خِطْبَةِ بَعْضٍ».

ئیبن عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «با کەسانێکتان مامەڵە بەسەر مامەڵەی کەسانی دیکەدا نەکات، نابێت کەسێک داخوازی بەسەر داخوازی کەسی دیکەوە بکات».



## بَابُ النَّهْيِ أَنْ يُتَّخَذَ الخَمْرُ خَلًّا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەکردنی مەی کردنە سرکە

٢٦٥. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي الخَمْرِ عَشَرَةً: عَاصِرَهَا، وَمُعْتَصِرَهَا، وَشَارِبَهَا، وَحَامِلَهَا، وَالمَحْمُولَةُ إِلَيْهِ، وَسَاقِيَهَا، وَبَائِعَهَا، وَآكِلَ ثَمَنِهَا، وَالمُشْتَرِي لَهَا، وَالمُشْتَرَاةُ لَهُ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە بەهۆی شەڕاب لە دە جۆرە کەس: ئەوەی دەیگوشێت، ئەوەی بۆی دەگوشرێت، ئەوەی دەیخواتەوە، ئەوەی هەڵیدەگرێت، ئەوەی بۆی هەڵدەگیرێت و دەبردرێت، ئەوەی

دەیگێڕێت، ئەوەی دەیفرۆشێت، ئەوەی قازانجەکەی دەخوات، ئەوەی دەیکڕێت، ئەوەی بۆی دەکڕدرێت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي بَيْعِ جُلُودِ المَيْتَةِ وَالأَصْنَامِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کڕین و فرۆشتنی پێستی ئاژەڵی مردارەبوو و بتەکان

٢٦٦. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَامَ الفَتْحِ وَهُوَ بِمَكَّةَ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الخَمْرِ، وَالمَيْتَةِ، وَالخِنْزِيرِ، وَالأَصْنَامِ»، فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَرَأَيْتَ شُحُومَ المَيْتَةِ، فَإِنَّهُ يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ، وَيُدْهَنُ بِهَا الجُلُودُ، وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ، قَالَ: «لَا هُوَ حَرَامٌ»، ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عِنْدَ ذَلِكَ: «قَاتَلَ اللَّهُ اليَهُودَ، إِنَّ اللَّهَ حَرَّمَ عَلَيْهِمُ الشُّحُومَ فَأَجْمَلُوهُ، ثُمَّ بَاعُوهُ، فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ».

واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ساڵی ڕزگارکردنی مەککە کە لە مەککە بوو، فەرمووی: «بێگومان خوا و پێغەمبەری خوا ﷺ فرۆشتنی عارەق و مردارەبوو و بەراز و بتیان حەرام کردووە»، لەو کاتەدا گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی دەربارەی چەوری مردارەوەبوو چی دەفەرموویت، کە لە ڕاستیدا کەشتی پێ چەور دەکرێت و پێستەی پێ خۆش و چەور دەکرێت و خەڵکی بۆ ڕووناکی لە چراکاندا دایدەگیرسێنن؟ فەرمووی ﷺ: «نەخێر (دروست نییە) ئەوانە حەرامن»، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «خوا جوولەکەکان لەناو بەرێت، چونکە بەڕاستی خوا چەوری (ماڵاتی) لەسەر حەرام کردن، ئەوانیش دەهاتن دەیانتواندەوە و پاشان دەیانفرۆشت و نرخ و بەهاکەیان وەردەگرت و دەیانخوارد».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّجُوعِ فِي الهِبَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پەشیمانبوونەوە لە خەڵات

٢٦٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭬ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ لَنَا مَثَلُ السُّوءِ العَائِدُ فِي هِبَتِهِ كَالكَلْبِ يَعُودُ فِي قَيْئِهِ».

ئیبن عەبباس ﭬ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە ئێمە ناوەشێتەوە ئەو نموونە نەشیاوە: ئەو کەسەی لە خەڵات و بەخشینی خۆی پەشیمان دەبێتەوە وەک سەگێکە بگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەی خۆی و بیخواتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي مَطْلِ الغَنِيِّ أَنَّهُ ظُلْمٌ



### باسی ئەوەی هاتووە کە دواخستنی قەرز لەلایەن دەوڵەمەند ستەمە

٢٦٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ: عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَطْلُ الغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيٍّ فَلْيَتْبَعْ».

ئەبو هورەیرە ﭬ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «دواخستنی دانەوەی قەرز لەلایەن کەسێکی دەوڵەمەندەوە ستەمە، هەرکاتێك یەکێك لە ئێوە ڕەوانەی لای کەسێکی دەوڵەمەند کرا، با بچێت (بۆ وەرگرتنەوەی قەرزەکە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْعِيرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دانانی نرخ (لەسەر کەلوپەل)

٢٦٩. عَنْ أَنَسٍ ﭬ قَالَ: غَلَا السِّعْرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ

اللَّهِ، سَعِّرْ لَنَا، فَقَالَ: «إِنَّ اللَّهَ هُوَ المُسَعِّرُ، القَابِضُ، البَاسِطُ، الرَّزَّاقُ، وَإِنِّي لأَرْجُو أَنْ أَلْقَى رَبِّي وَلَيْسَ أَحَدٌ مِنْكُمْ يَطْلُبُنِي بِمَظْلِمَةٍ فِي دَمٍ وَلَا مَالٍ».

ئەنەس ﷺ دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ نرخی شت بەرز بووەوە (گران بوو)، خەڵکی گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، نرخمان بۆ دیاری بکە، فەرمووی: «خوا خۆی نرخدانەرە، ڕزق دەگرێتەوە و زیادی دەکات، هەر ئەو ڕزق و ڕۆزیدەرە، بێگومان من ئومێد دەکەم کە کاتێك بە پەروەردگارم دەگەم، هیچ یەکێک نەبێت کە داواکاری ستەملێکردنی خوێن و ماڵی لەسەرم هەبێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الغِشِّ فِي البُيُوعِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی فێڵ لە کڕین و فرۆشتن

٢٧٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ مَرَّ عَلَى صُبْرَةٍ مِنْ طَعَامٍ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهَا، فَنَالَتْ أَصَابِعُهُ بَلَلًا، فَقَالَ: «يَا صَاحِبَ الطَّعَامِ، مَا هَذَا؟»، قَالَ: أَصَابَتْهُ السَّمَاءُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «أَفَلَا جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ حَتَّى يَرَاهُ النَّاسُ»، ثُمَّ قَالَ: «مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنَّا». ١٧٢

واتە: ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بەلای (خواردنێکی لەسەر یەك کەڵەکەبوو) تێپەڕی، دەستی خستە نێوی (ژێرەوەی)، پەنجەکانی تەڕ بوون، فەرمووی: «ئا ئەمە چییە ئەی خاوەنی خواردن؟!»، گوتی: باران تەڕی کردووە ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: «ئەی بۆچی لە سەرەوەی خواردنەکە داتنەناوە و دەرتنەخستووە بۆئەوەی خەڵك ببینێت؟!»، پاشان فەرمووی: «هەر کەسێك فێڵ بکات لە ئێمە نییە».

تێبینی:

واتە: ئەم کردەوەی ئەو کەسە کە فێڵکردنە لە ڕەفتاری موسوڵمان ناچێت! نەك لە

ئیسلام دەربچێت و کافر بێت، مەگەر فێڵەکەی، فێڵێك بێت لە عەقیدە تەواو نەبێت و زیانی عەقیدەیی لە موسوڵمانان بدات، ئا ئەوە حوکمەکەی جیاواز دەبێت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي اسْتِقْرَاضِ البَعِيرِ أَوِ الشَّيْءِ مِنَ الحَيَوَانِ أَوِ السِّنِّ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قەرز وەرگرتنی وشتر یان هەر ئاژەڵێکی دیکە

٢٧١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: اسْتَقْرَضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ سِنًّا، فَأَعْطَاهُ سِنًّا خَيْرًا مِنْ سِنِّهِ، وَقَالَ: «خِيَارُكُمْ أَحَاسِنُكُمْ قَضَاءً».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وشترێکی بەقەرز وەرگرت، جا لەجیاتی وشترەکەی وشترێکی چاکتری (بە خاوەن قەرز) دایەوە، فەرمووی: «چاکترینتان ئەو کەسەیە قەرزەکەی بەچاکترین شێوە دەداتەوە».



٢٧٢. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «غَفَرَ اللَّهُ لِرَجُلٍ كَانَ قَبْلَكُمْ، كَانَ سَهْلاً إِذَا بَاعَ، سَهْلاً إِذَا اشْتَرَى، سَهْلاً إِذَا اقْتَضَى».

جابیر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا لە پێش ئێوە لە کەسێک خۆش بوو، ئەو لێبووردە و ئاسان بوو لە کاتی فرۆشتن، لێبووردە و ئاسان بوو لە کاتی کڕین، لێبووردە و ئاسان بوو لە کاتی دانەوەی قەرز».



# أَبْوَابُ الْأَحْكَامِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی حوکمەکان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

٢٧٣. عَنِ ابْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْقُضَاةُ ثَلَاثَةٌ: قَاضِيَانِ فِي النَّارِ، وَقَاضٍ فِي الْجَنَّةِ، رَجُلٌ قَضَى بِغَيْرِ الْحَقِّ فَعَلِمَ ذَاكَ فَذَاكَ فِي النَّارِ، وَقَاضٍ لَا يَعْلَمُ فَأَهْلَكَ حُقُوقَ النَّاسِ فَهُوَ فِي النَّارِ، وَقَاضٍ قَضَى بِالْحَقِّ فَذَلِكَ فِي الْجَنَّةِ».



ئیبن بورەیدە، لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «دادوەران سێ جۆرن: دوو دادوەریان لە ئاگری دۆزەخدان، دادوەرێکیشیان لە بەهەشتدایە، کەسێک دادوەری بکات بەناڕاستی و بشزانێت، ئەوە لە ئاگردایە، دادوەرێک بەنەزانین دادوەری بکات و مافی خەڵکی بفەوتێنێت، ئا ئەوەش لە ئاگردایە، دادوەرێک بەهەق بڕیار بدات، ئەوە لە بەهەشتدایە».

٢٧٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ وَلِيَ الْقَضَاءَ، أَوْ جُعِلَ قَاضِيًا بَيْنَ النَّاسِ فَقَدْ ذُبِحَ بِغَيْرِ سِكِّينٍ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێك لەلایەن فەرمانڕەواوە بە دادوەر دانرا لە نێوان خەڵکدا، ئەوە بەبێ چەقۆ سەر بڕدراوە (بۆ خۆپاراستن و ئاگاداربوونە)».

تێبینی:

لە بارەی ئەو وێنەهێنانەوەی پێغەمبەر ﷺ گوتراوە: دادوەر پیشە و بەرپرسیاریتییەکی زۆر قورسە، بەردەوام لە نێوان دوو سزادایە، سزای دونیا: ئەگەر بێتو بەهەق دادوەری بکات، ئەگەری هەیە لایەنی دووەم (کە بڕیارەکە لە زیانیەتی) لە کاردانەوەی بڕیارەکە زیانێک بە دادوەر بگەیەنن، سزای قیامەت: خۆ ئەگەر بێتو بەناهەق دادوەری بکات و بشزانێت، ئەوە بێگومان سزایەکی سەخت لە قیامەت چاوەڕێیەتی.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي القَاضِي يُصِيبُ وَيُخْطِئُ

### باسی ئەوەی هاتووە دادوەر لە بڕیاریدا ڕاست دەکات و هەڵەش دەکات

٢٧٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا حَكَمَ الحَاكِمُ فَاجْتَهَدَ فَأَصَابَ، فَلَهُ أَجْرَانِ، وَإِذَا حَكَمَ فَأَخْطَأَ، فَلَهُ أَجْرٌ وَاحِدٌ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر دادوەر کۆششی کرد و بڕیاری دا و پێکای، ئەوە دوو پاداشتی بۆ هەیە (پاداشتی کۆشش و پێکانەکە)، ئەگەر کۆششی کرد و بڕیاری دا و نەیپێکا پاداشتێکی بۆ هەیە (پاداشتی کۆششەکە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِمَامِ الرَّعِيَّةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێشەوای خەڵک

٢٧٦. قَالَ عَمْرُو بْنُ مُرَّةَ لِمُعَاوِيَةَ رضي الله عنه: إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ إِمَامٍ يُغْلِقُ بَابَهُ دُونَ ذَوِي الحَاجَةِ، وَالخَلَّةِ، وَالمَسْكَنَةِ إِلَّا أَغْلَقَ اللَّهُ أَبْوَابَ السَّمَاءِ دُونَ خَلَّتِهِ، وَحَاجَتِهِ، وَمَسْكَنَتِهِ»، فَجَعَلَ مُعَاوِيَةُ رَجُلًا عَلَى حَوَائِجِ النَّاسِ.

عەمری کوڕی موڕڕە بە موعاویەی رضي الله عنه گوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو

دەیفەرموو: «هەر پێشەوایەک دەرگای دابخات بەڕووی خاوەن پێویستی و داواکار و هەژار، بەدڵنیاییی خوا دەرگاکانی ئاسمانی بەڕوودا دادەخات لە کاتی داواکاری و پێویستی و هەژاری ئەودا»، لەدوای ئەوە موعاویە کەسێکی دامەزراند تایبەت بە پێویستیی خەڵک.

## بَابُ مَا جَاءَ لَا يَقْضِي القَاضِي وَهُوَ غَضْبَانُ

### باسی ئەوەی هاتووە نابێت دادوەر دادوەری بکات لە کاتی تووڕەییدا

٢٧٧. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ ﵁ قَالَ: كَتَبَ أَبِي إِلَى عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ وَهُوَ قَاضٍ: أَنْ لَا تَحْكُمْ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَأَنْتَ غَضْبَانُ، فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَحْكُمُ الحَاكِمُ بَيْنَ اثْنَيْنِ وَهُوَ غَضْبَانُ».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە ﵁ دەڵێت: باوکم نووسراوێکی نووسی بۆ عوبەیدوڵڵای کوڕی ئەبو بەکرە کە دادوەر بوو: کە نەکەیت دادوەری لە نێوان دوو کەسدا بکەیت لە کاتێکدا تووڕەیت، چونکە من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «با هیچ دادوەرێک دادوەری لە نێوان دوو کەسدا نەکات لە کاتێکدا تووڕەیە».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّاشِي وَالمُرْتَشِي فِي الحُكْمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەشوەدەر و ڕەشوەوەرگر لە دادوەریدا

٢٧٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الرَّاشِيَ وَالمُرْتَشِيَ فِي الحُكْمِ.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لە ڕەشوەدەر و لە ڕەشوەوەرگر لە دادوەریدا.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَنَّ البَيِّنَةَ عَلَى المُدَّعِي، وَاليَمِينَ عَلَى المُدَّعَى عَلَيْهِ

### باسی ئەوەی هاتووە کە شایەتی لەسەر بانگەشەکارە و سوێند لەسەر داوالەسەرکراوە

٢٧٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَضَى أَنَّ اليَمِينَ عَلَى المُدَّعَى عَلَيْهِ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا کە سوێند لەسەر داوالەسەرکراوە (ئەگەر داواکار بەڵگەی نەبوو).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي اليَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سوێند لەگەڵ شایەتی

٢٨٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِاليَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ الوَاحِدِ، قَالَ رَبِيعَةُ: وَأَخْبَرَنِي ابْنٌ لِسَعْدِ بْنِ عُبَادَةَ قَالَ: وَجَدنَا فِي كِتَاب سَعْدٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَضَى بِاليَمِينِ مَعَ الشَّاهِدِ.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا بە وەرگرتنی سوێندی داواکار لەگەڵ بوونی یەک شایەت، ڕەبیعە گوتی: کوڕێکی سەعدی کوڕی عوبادە پێی ڕاگەیاندم و گوتی: لە نووسراوێکی (نامەیەکی) سەعد دەستمان کەوتووە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری دا بە وەرگرتنی سوێند (ی داواکار) لەگەڵ شایەتێک.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي العُمْرَى

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەخشین بەدرێژایی تەمەن

٢٨١. عَنْ سَمُرَةَ ﵁: أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «العُمْرَى جَائِزَةٌ لِأَهْلِهَا، أَوْ مِيرَاثٌ لِأَهْلِهَا».

سەمورە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خەڵات و بەخشین بەدرێژایی تەمەن بۆ ئەو کەسەیە کە بۆی بەدیاری کراوە، یان میراتێکە بۆ خانەوادەکەی (ئەوەی پێی دراوە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّقْبَى

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەخشین بەچاوەڕوانی

٢٨٢. عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «العُمْرَى جَائِزَةٌ لِأَهْلِهَا، وَالرُّقْبَى جَائِزَةٌ لِأَهْلِهَا».

جابیر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەخشین بەدرێژایی تەمەن دروست و حەڵاڵە بۆ ئەو کەسەی کە پێی دراوە، بەخشین بەچاوەڕوانی (کە کێ زووتر بمرێت دیارییەکە بۆ ئەوەی دیکە بێت)، دروست و حەڵاڵە بۆ ئەو کەسەی کە پێی دراوە».



* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ الرُّقْبَى جَائِزَةٌ مِثْلَ العُمْرَى، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَفَرَّقَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَهْلِ الكُوفَةِ وَغَيْرِهِمْ، بَيْنَ العُمْرَى، وَالرُّقْبَى، فَأَجَازُوا العُمْرَى، وَلَمْ يُجِيزُوا الرُّقْبَى: وَتَفْسِيرُ الرُّقْبَى: أَنْ يَقُولَ هَذَا الشَّيْءُ لَكَ مَا عِشْتَ، فَإِنْ مُتَّ قَبْلِي فَهِيَ رَاجِعَةٌ إِلَيَّ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و جگە لەوانیش کە: بەخشین بەچاوەڕوانی دروستە وەک بەخشین بەدرێژایی تەمەن، ئەمەش بۆچوونی ئەحمەد و ئیسحاقە، هەندێکی دیکە لە زانایانی خەڵکی کوفە و کەسانی دیکەش جیاوازییان کردووە لە نێوان بەخشینی بەدرێژایی تەمەن و بەخشین بەچاوەڕوانی، بەدرێژایی تەمەن لایان دروستە و ڕێپێدراوە، بەڵام بەخشین بەچاوەڕوانی لەلایان نادروستە و ڕێپێدراو نییە. مانای وشەی (الرُّقْبَى) ئەوەیە: کەسێک بڵێت: ئەم شتە بۆ تۆ بێت ئەوەندەی لە ژیاندا بیت، ئەگەر هاتوو پێش من

مردیت، ئەوە بۆ من دەگەڕێتەوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَخْيِيرِ الغُلَامِ بَيْنَ أَبَوَيْهِ إِذَا افْتَرَقَا

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سەرپشککردنی منداڵ لە نێوان باوک و دایکیدا ئەگەر جیا بوونەوە

٢٨٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَيَّرَ غُلَامًا بَيْنَ أَبِيهِ وَأُمِّهِ.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ منداڵێکی سەرپشک کرد لە نێوان باوک و دایکیدا (کامیان هەڵدەبژێرێت بە دڵی خۆی).

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ قَالُوا: يُخَيَّرُ الغُلَامُ بَيْنَ أَبَوَيْهِ إِذَا وَقَعَتْ بَيْنَهُمَا المُنَازَعَةُ فِي الوَلَدِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَقَالَا: مَا كَانَ الوَلَدُ صَغِيرًا فَالأُمُّ أَحَقُّ بِهِ، فَإِذَا بَلَغَ الغُلَامُ سَبْعَ سِنِينَ خُيِّرَ بَيْنَ أَبَوَيْهِ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و جگە لەوانیش گوتوویانە: منداڵ سەرپشک دەکرێت لە نێوان باوک و دایکیدا ئەگەر ناکۆکی کەوتە نێوانیان سەبارەت بە منداڵەکە، ئەمەش بۆچوونی ئەحمەد و ئیسحاقە کە گوتوویانە: ئەگەر منداڵەکە بچووک بوو، ئەوە دایک شیاوترە بەو منداڵە، ئەگەر گەیشتە تەمەنی حەوت ساڵی، ئەوکاتە سەرپشک دەکرێت لە نێوان دایک و باوکیدا.

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الوَالِدَ يَأْخُذُ مِنْ مَالِ وَلَدِهِ

## باسی ئەوەی هاتووە کاتێك باوک لە ماڵ و سامانی منداڵەکەی دەبات

٢٨٤. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلْتُمْ مِنْ كَسْبِكُمْ، وَإِنَّ أَوْلَادَكُمْ مِنْ كَسْبِكُمْ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «باشترین و پاکترین شتێک کە لێی بخۆن ئەو شتەیە کە بۆخۆتان (بە ڕەنجی شانتان) پەیدای دەکەن، وە بێگومان مناڵەکانتان بەشێکن لە هەوڵ و کۆششی خۆتان».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الشُّفْعَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هەڵگرتنەوەی بەشی هاوبەش (شەریك)

٢٨٥. عَنْ سَمُرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «جَارُ الدَّارِ أَحَقُّ بِالدَّارِ».

سەمورە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دراوسێی خانوو شایستەترە بە خانووەکە (بۆ کڕینەوەی لە کاتێکدا ویسترا بفرۆشرێت)».

٢٨٦. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الجَارُ أَحَقُّ بِشُفْعَتِهِ، يُنْتَظَرُ بِهِ وَإِنْ كَانَ غَائِبًا، إِذَا كَانَ طَرِيقُهُمَا وَاحِدًا».

جابیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دراوسێ شایستەترە بە هەڵگرتنەوە و کڕینی خانووی دراوسێیەکەی، چاوەڕێی بڕیاری دەکرێت ئەگەر لە کاتی گەشتیش بێت، بە مەرجێک ڕێگەیان بەسەر یەک ڕێگاوە بێت».



## بَابٌ فِي الوَقْفِ

### باسێک دەربارەی ماڵی وەقفکراو

٢٨٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثٍ: صَدَقَةٌ جَارِيَةٌ، وَعِلْمٌ يُنْتَفَعُ بِهِ، وَوَلَدٌ صَالِحٌ يَدْعُو لَهُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێک مرۆڤ دەمرێت کارەکانی کۆتایی دێت جگە لە سێ شت: بەخشینێک کە بەردەوام بێت (وەك: پرد، مزگەوت، بنکەی لەبەرکردنی قورئان)، زانستێک سوودی لێ وەربگیرێت (نووسینی پەرتووکێکی باش، یان وانەگوتنەوە)، منداڵێکی چاکەکار

کە دوعای بۆ بکات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الغَرْسِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێز و گەورەیی دارچاندن

٢٨٨. **عَنْ أَنَسٍ** رضي الله عنه **عَنِ النَّبِيِّ** صلى الله عليه وسلم **قَالَ:** «مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا، أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا، فَيَأْكُلُ مِنْهُ إِنْسَانٌ، أَوْ طَيْرٌ، أَوْ بَهِيمَةٌ، إِلَّا كَانَتْ لَهُ صَدَقَةٌ».

ئەنەس رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر موسوڵمانێك دارێک بچێنێت، یان دانەوێڵەیەک تۆ بکات، جا مرۆڤێک یان باڵندەیەک یان گیاندارێک لێی بخوات، بەدڵنیاییەوە بە چاکە بۆی هەژمار دەکرێت».



## بَابٌ مِنَ الْمُزَارَعَةِ

### باسێك دەربارەی کشتوکاڵکردن

٢٨٩. **عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ** رضي الله عنهما**: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ** صلى الله عليه وسلم **لَمْ يُحَرِّمِ الْمُزَارَعَةَ، وَلَكِنْ أَمَرَ أَنْ يَرْفُقَ بَعْضُهُمْ بِبَعْضٍ.**

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کارکردن لە زەوی بەرانبەر بە شتێک لە داهاتەکەی قەدەغە نەکردووە، بەڵام داوای کردووە خەڵکی لێبووردە بن بەرانبەر بە یەکدی (نەوەک لایەک سوود ببینێت و لایەکەی دیکە زیان)

# أَبْوَابُ الدِّيَاتِ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ

## کۆباسی خوێنباییەکان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ



### بَابُ مَا جَاءَ فِي دِيَةِ الأَصَابِعِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خوێنبایی پەنجەکان

٢٩٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ «فِي دِيَةِ الأَصَابِعِ اليَدَيْنِ وَالرِّجْلَيْنِ سَوَاءٌ، عَشْرٌ مِنَ الإِبِلِ لِكُلِّ أُصْبُعٍ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دەربارەی خوێنبایی پەنجەکانی دەستەکان و پێیەکان وەکوو یەکن، دە سەر وشتر بۆ هەر پەنجەیەکە».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي تَشْدِيدِ قَتْلِ المُؤْمِنِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هەڕەشەی توند لە کوشتنی بڕوادار (بەناهەق)

٢٩١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَزَوَالُ الدُّنْيَا أَهْوَنُ عَلَى اللَّهِ مِنْ قَتْلِ رَجُلٍ مُسْلِمٍ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «تێکچوونی

دونیا لەلای خوا سادە و ئاسانترە لە کوشتنی پیاوێک (ئافرەت)ێکی موسوڵمان».

## بَابُ الحُكْمِ فِي الدِّمَاءِ

### باسی دادگاییکردن دەربارەی خوێن (کوشتن)

٢٩٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحْكَمُ بَيْنَ العِبَادِ فِي الدِّمَاءِ».

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی یەکەم شت (لە ڕۆژیی دوایی) دادگایی لەسەر دەکرێت لەنێو خەڵکی، دەربارەی کوشتن و خوێنڕشتنە».



٢٩٣. عَنْ أَبَا سَعِيدٍ الخُدْرِيَّ، وَأَبَا هُرَيْرَةَ ﵄ يَذْكُرَانِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْ أَنَّ أَهْلَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ اشْتَرَكُوا فِي دَمِ مُؤْمِنٍ لَأَكَبَّهُمُ اللَّهُ فِي النَّارِ».

ئەبو سەعیدی خودری و ئەبو هوڕەیڕە ﵄ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: «بێگومان ئەگەر خەڵکی ئاسمان و زەوی بەشدار بن لە خوێنی بڕوادارێک (کوشتنی بەناهەق)، بێگومان خوا هەموویان دەخاتە نێو ئاگری دۆزەخەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يَقْتُلُ نفْسًا مُعَاهِدَةً

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی کەسێکی خاوەن پەیمان دەکوژێت

٢٩٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَلَا مَنْ قَتَلَ نَفْسًا مُعَاهِدًا لَهُ ذِمَّةُ اللَّهِ وَذِمَّةُ رَسُولِهِ، فَقَدْ أَخْفَرَ بِذِمَّةِ اللَّهِ، فَلَا يُرَحْ رَائِحَةَ الجَنَّةِ، وَإِنَّ رِيحَهَا لَيُوجَدُ مِنْ مَسِيرَةِ سَبْعِينَ خَرِيفًا».

ئەبو هوڕەیڕە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ئاگادار بن هەر کەسێک

کەسێکی پەیمانپێدراو بکوژێت (کە پاراستنی گیانی) لە ئەستۆی خوا و پێغەمبەرەکەیدا ﷺ بێت، بەڕاستی پێشێلی کردووە بەرانبەر بە لە ئەستۆگرتنی خوا، بێگومان بۆنی بەهەشت ناکات، لە کاتێکدا بۆنی بەهەشت لە دووری حەفتا پاییزەوە دێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنِ الْمُثْلَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەکردن لە هەتک و شێواندن (ی مردوو)

٢٩٥. عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا بَعَثَ أَمِيرًا عَلَى جَيْشٍ أَوْصَاهُ فِي خَاصَّةِ نَفْسِهِ بِتَقْوَى اللَّهِ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ خَيْرًا، فَقَالَ: «اغْزُوا بِسْمِ اللَّهِ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، قَاتِلُوا مَنْ كَفَرَ بِاللَّهِ، اغْزُوا وَلَا تَغُلُّوا، وَلَا تَغْدِرُوا، وَلَا تُمَثِّلُوا، وَلَا تَقْتُلُوا وَلِيدًا».

سولەیمانی کوڕی بوڕەیدە، لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک فەرمانڕەوایەکی ڕەوانە کردبایە لەگەڵ لەشکرێک، ئامۆژگاری دەکرد کە پارێزکار بێت بەرانبەر خوا و ئەو موسوڵمانانەی کە لەگەڵیدان، جا دەیفەرموو: «جەنگ بکەن بە ناوی خوا، لەپێناوی خوا، بجەنگێن لەگەڵ هەرکەسێک بێباوەڕ بێت بە خوا، جەنگ بکەن و دزی مەکەن لە دەستکەوتی جەنگ، پەیمان مەشکێنن، هەتکی کوژراو مەکەن، منداڵ مەکوژن».



## بَابُ مَا جَاءَ لَا يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ

### باسی ئەوەی هاتووە کە موسوڵمان ناکوژرێتەوە (بەهۆی کوشتنی کەسی) بێبڕوا

٢٩٦. عَنْ أَبِي جُحَيْفَةَ قَالَ: قُلْتُ لِعَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، هَلْ عِنْدَكُمْ سَوْدَاءُ فِي بَيْضَاءَ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ؟ قَالَ: لَا وَالَّذِي فَلَقَ الْحَبَّةَ، وَبَرَأَ النَّسَمَةَ، مَا عَلِمْتُهُ إِلَّا فَهْمًا يُعْطِيهِ اللَّهُ رَجُلًا فِي الْقُرْآنِ، وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ، قُلْتُ: وَمَا فِي الصَّحِيفَةِ؟ قَالَ:

العَقْلُ، وَفِكَاكُ الأَسِيرِ، وَأَنْ لَا يُقْتَلَ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ.

ئەبو جوحەیفە دەڵێت: بە عەلیم ﵁ گوت: ئەی فەرمانڕەوای بڕواداران، ئایا هیچ نووسراوێکتان لەلا هەیە (دەربارەی وەحی) جگە لە قوڕئانی پیرۆز؟ گوتی: نەخێر، سوێند بەو کەسەی دانەوێڵەی شین کردووە و گیانی دروست کردووە نەمزانیوە جگە لە تێگەیشتن لە قوڕئانی پیرۆز نەبێت کە خوا بە کەسێکی بدات، یاخود ئەوەی لەو پەڕاوە نووسراوەتەوە؟ گوتم: ئەو پەڕاوە چی تێدایە؟ گوتی: باسی تۆڵەدانەوەی خوێن، ئازادکردنی بەندی (دیل)، نەکوشتنەوەی موسوڵمان لەبری بێبڕوا.

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ

### باسی ئەوەی هاتووە هەر کەسێک بکوژرێت بەهۆی بەرگری لە ماڵەکەی شەهیدە



٢٩٧. عَنْ سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ قُتِلَ دُونَ مَالِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دِينِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ دَمِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ، وَمَنْ قُتِلَ دُونَ أَهْلِهِ فَهُوَ شَهِيدٌ».

سەعیدی کوڕی زەید ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «هەر کەسێک بەهۆی بەرگری لە ماڵی بکوژرێت ئەوە شەهیدە، هەرکەسێک بەرگری لە ئایینی بکات و بکوژرێت ئەوە شەهیدە، هەر کەسێک بەرگری لە خوێن و گیانی خۆی بکات و بکوژرێت شەهیدە، هەر کەسێک بەرگری لە خانەوادەی بکات و بکوژرێت ئەوە شەهیدە».

# أَبْوَابُ الْحُدُودِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی سزا شەرعییەکان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ



### بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ لَا يَجِبُ عَلَيْهِ الحَدُّ

باسی ئەوەی هاتووە کەوا کەسێک سزای سنووورداری لەسەر نییە

٢٩٨. عَنْ عَلِيٍّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «رُفِعَ القَلَمُ عَنْ ثَلَاثَةٍ: عَنِ النَّائِمِ حَتَّى يَسْتَيْقِظَ، وَعَنِ الصَّبِيِّ حَتَّى يَشِبَّ، وَعَنِ المَعْتُوهِ حَتَّى يَعْقِلَ».

عەلی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پێنووسی (گوناهـ و هەڵە) هەڵگیراوە لەسەر سێ چین: لەسەر خەوتوو هەتا بەئاگا دێت، لەسەر منداڵ هەتا پێدەگات (باڵغ دەبێت)، لەسەر شێت هەتا ژیریی دێتەوە بەر».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّتْرِ عَلَى المُسْلِمِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی داپۆشینی موسوڵمان

٢٩٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ نَفَّسَ عَنْ مُؤْمِنٍ كُرْبَةً مِنْ

كُرَبِ الدُّنْيَا، نَفَّسَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الآخِرَةِ، وَمَنْ سَتَرَ عَلَى مُسْلِمٍ، سَتَرَهُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ، وَاللَّهُ فِي عَوْنِ العَبْدِ، مَا كَانَ العَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک ناخۆشییەک لە ناخۆشییەکانی دونیا لەسەر موسوڵمانێک لاببات، خوا ناخۆشییەک لە ناخۆشییەکانی ڕۆژی دوایی لەسەر لادەبات، هەر کەسێک موسوڵمانێک دابپۆشێت، خوا لە دونیا و دواڕۆژ دایدەپۆشێت، خوا هەمیشە لە یارمەتیدانی بەندەدایە، هەتا بەندەکە لە یارمەتیدانی براکەیدا بێت».

٣٠٠. عَنْ سَالِمٍ، عَنْ أَبِيهِ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «المُسْلِمُ أَخُو المُسْلِمِ، لَا يَظْلِمُهُ، وَلَا يُسْلِمُهُ، وَمَنْ كَانَ فِي حَاجَةِ أَخِيهِ كَانَ اللَّهُ فِي حَاجَتِهِ، وَمَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْلِمٍ كُرْبَةً فَرَّجَ اللَّهُ عَنْهُ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ القِيَامَةِ، وَمَنْ سَتَرَ مُسْلِماً سَتَرَهُ اللَّهُ يَوْمَ القِيَامَةِ».



سالیم، لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «موسوڵمان برای موسوڵمانە، ستەمی لێ ناکات، نایداتە دەست دوژمنی، هەر کەسێک لە یارمەتیدانی پێویستیی براکەیدا بێت، خوا لە یارمەتیدانی پێویستیی ئەودا دەبێت، هەر کەسێک ناخۆشییەک لەسەر موسوڵمانێک لابدات، خوا ناخۆشییەک لە ناخۆشییەکانی دواڕۆژی لەسەر لادەبات، هەر کەسێک موسوڵمانێک دابپۆشیت، خوا لە ڕۆژی دواییدا دایدەپۆشێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ أَنْ يُشَفَّعَ فِي الحُدُودِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی تکاکردن بۆ سزا شەرعییەکان

٣٠١. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ قُرَيْشاً أَهَمَّهُمْ شَأْنُ المَرْأَةِ المَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ، فَقَالُوا: مَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالُوا: مَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلَّا أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ حِبُّ

رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ؟»، ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ، فَقَالَ: «إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الحَدَّ، وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: قوڕەیشییەکان پەرۆشی حاڵی ئافرەتێکی مەخزوومی بوون کە دزی کردبوو، گوتیان: کێ تکای بۆ بکات لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ؟ گوتیان: کێ هەیە جورئەت بکات جگە لە ئوسامەی کوڕی زەید، کە کەسێکی خۆشویستراوە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ، ئوسامەی کوڕی زەید (چوو بۆ خزمەتی و) قسەی لەگەڵ کرد (کە دەستی ئافرەتەکە نەبڕێت)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئایا تکا دەکەیت تا سزایەکی دیاریکراوی خوا جێبەجێ نەکرێت؟!»، ئینجا هەستایەوە و وتارێکی دا، فەرمووی: «بەڕاستی هۆی لەناوچوونی گەلانی پێش ئێوە هەر بەهۆی ئەوە بووە کاتێک کەسێکی پایەدار دزی کردبا، وازیان لێ دەهێنا و سزایان نەدەدا، ئەگەر کەسێکی بێهێزیش دزی کردبا، سزایان دەدا، سوێند بە خوا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات، بێگومان دەستی دەبڕم».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي رَجْمِ أَهْلِ الكِتَابِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەردباران کردنی خاوەنی کتێبەکان

٣٠٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ رَجَمَ يَهُودِيًّا وَيَهُودِيَّةً.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ پیاوێک و ئافرەتێکی جوولەکەی بەردباران کرد (بەهۆی زیناکردن).

تێبینی:

ئەوان هاتن بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بۆئەوەی دادگەر بێت لەم کێشەیە،

پێغەمبەر ﷺ داوای کرد سزای شەرعییان بەپێی تەورات لەسەر جێبەجێ بکرێت و بینییان سزای زیناکردن لە تەورات بریتییە لە بەردبارانکردن.

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الحُدُودَ كَفَّارَةٌ لِأَهْلِهَا

## باسی ئەوەی هاتووە کە سزای شەرعی دەبێتە کەفارەت بۆ خاوەنەکەی

٣٠٣. عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ رضي الله عنه قَالَ: كُنَّا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فِي مَجْلِسٍ، فَقَالَ: «تُبَايِعُونِي عَلَى أَنْ لَا تُشْرِكُوا بِاللَّهِ شَيْئًا، وَلَا تَسْرِقُوا، وَلَا تَزْنُوا - قَرَأَ عَلَيْهِمُ الآيَةَ - {فَمَنْ وَفَّى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ} الشورى: ٤٠، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ عَلَيْهِ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَسَتَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ، فَهُوَ إِلَى اللَّهِ، إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ، وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ».

عوبادەی کوڕی صامیت رضي الله عنه دەڵێت: لەخزمەت پێغەمبەر ﷺ بووین لە دانیشتنێک، فەرمووی: «ئایا پەیمانم پێ دەدەن کە هیچ شتێك نەکەنە هاوبەش بۆ خوا، دزی نەکەن، زینا نەکەن، جا ئەم ئایەتەی بۆ خوێندنەوە: {فَمَنْ وَفَّى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ}، واتە: هەر کەسێک لە ئێوە بەڵێنی هێنایە جێ، پاداشتی لەلای خوایە. هەر کەسێک دووچاری شتێک لەو تاوانانە هات، بەهۆیەوە سزا درا ئەوە بۆی دەبێتە کەفارەت، هەر کەسێکیش دووچاری شتێک لەو تاوانانە هات و خوا بۆی داپۆشی، ئەوە بڕیاری لەلای خوایە، ئەگەر ویستی سزای دەدات، ئەگەر ویستی لێی خۆش دەبێت».

* قَالَ الشَّافِعِيُّ: وَأُحِبُّ لِمَنْ أَصَابَ ذَنْبًا فَسَتَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ أَنْ يَسْتُرَ عَلَى نَفْسِهِ وَيَتُوبَ فِيمَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ رَبِّهِ وَكَذَلِكَ رُوِيَ عَنْ أَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ رضي الله عنهما أَنَّهُمَا أَمَرَا رَجُلاً أَنْ يَسْتُرَ عَلَى نَفْسِهِ.

شافیعی گوتوویەتی: هەر کەسێک دووچاری تاوانێک دەبێت، جا خوای گەورەش

دایدەپۆشێت، پێمخۆشە ئەویش لەسەر خۆی دایبپۆشێت و تەوبە بکات لە نێوان خۆی و خوای، هەروەها ڕیوایەت کراوە لە ئەبو بەکر و عومەر ﭭ کە هەردووکیان فەرمانیان داوە بەکەسێک کە تاوانی خۆی دابپۆشێت (تەوبە بکات لە نێوان خۆی و خوای).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي حَدِّ السَّكْرَانِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سزای سەرخۆش

٣٠٤. عَنْ أَنَسٍ ﭬ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ أُتِيَ بِرَجُلٍ قَدْ شَرِبَ الخَمْرَ فَضَرَبَهُ بِجَرِيدَتَيْنِ نَحْوَ الأَرْبَعِينَ.

ئەنەس ﭬ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێکیان هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کە مەی خواردبۆیەوە، بە دوو قامچی لە دارخورما نزیکەی چل جاران لێی دا (وا پێ دەچێت فەرمانی کردبێت هاوەڵان دارکارییان کردبێت، نەك خودی خۆی ﷺ).

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ حَدَّ السَّكْرَانِ ثَمَانُونَ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و جگە لەوانیش، سزای دیاریکراوی سەرخۆش هەشتا جەڵدە (بەڵام وەك پێشەوا عەلی ﭬ لێی گێڕدراوەتەوە سزای شەرعی بۆ مەیخۆر دیاری نەکراوە و جێ هێڵراوە بۆ دەسەڵاتی شەرعی).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الخَائِنِ، وَالمُخْتَلِسِ، وَالمُنْتَهِبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپاك و فێڵباز و تاڵانچی

٣٠٥. عَنْ جَابِرٍ ﭬ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ عَلَى خَائِنٍ، وَلَا مُنْتَهِبٍ، وَلَا مُخْتَلِسٍ قَطْعٌ».

جابیر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: « کەسی ناپاك و تاڵانچی و فێڵباز دەستبڕینیان لەسەر نییە».

## بَابُ مَا جَاءَ لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ

### باسی ئەوەی هاتووە بەروبووم بە دارەوە و کرۆکی دارخورما دەستیان لەسەر نابڕدرێت

٣٠٦. عَنْ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ وَلَا كَثَرٍ».

ڕافیعی کوڕی خەدیج ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەو بەروبوومەی کە بە دارەوەیە و لێ نەکراوەتەوە و کرۆکی دارخورماش دەستبڕینی لەسەر نییە».



## بَابُ مَا جَاءَ أَنْ لَا تُقْطَعُ الأَيْدِي فِي الغَزْوِ

### باسی ئەوەی هاتووە کە دەستەکان نابڕدرێن (بەهۆی دزین) لە کاتی جەنگدا

٣٠٧. عَنْ بُسْرِ بْنِ أَرْطَاةَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «لَا تُقْطَعُ الأَيْدِي فِي الغَزْوِ».

بوسری کوڕی ئەڕتات ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو، دەیفەرموو: «دزینی کاتی جەنگ دەستبڕینی لەسەر نییە».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْهُمْ: الأَوْزَاعِيُّ: لَا يَرَوْنَ أَنْ يُقَامَ الحَدُّ فِي الغَزْوِ بِحَضْرَةِ العَدُوِّ مَخَافَةَ أَنْ يَلْحَقَ مَنْ يُقَامُ عَلَيْهِ الحَدُّ بِالعَدُوِّ، فَإِذَا خَرَجَ الإِمَامُ مِنْ أَرْضِ الحَرْبِ وَرَجَعَ إِلَى دَارِ الإِسْلَامِ أَقَامَ الحَدَّ عَلَى مَنْ أَصَابَهُ

كَذَلِكَ قَالَ الأَوْزَاعِيُّ.

كاركردن لەسەر ئەوەیە لەلای هەندێک لە زانایان لەوانە ئەوزاعی: بۆچوونیان وایە کە سزا دیاریکراوەکان لە کاتی جەنگ و ئامادەبوونی دوژمن جێبەجێ نەکرێت، ئەمەش لەترسی ئەوەی نەوەک سزادراو ڕابکات بۆ نێو دوژمن، جا کاتێک ئیمام لەخاک و مەیدانی جەنگ دەرچوو و گەڕایەوە نێو خاکی ئیسلام، ئەوکات سزاکەی لەسەر جێبەجێ دەکات، هەر ئاوای گوتووە ئەوزاعی.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي حَدِّ اللُّوطِيِّ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سزای نێربازی

٣٠٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الفَاعِلَ وَالمَفْعُولَ بِهِ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێکتان دیت کاری نەتەوەی لووطی دەکرد (نێربازی)، ئەوەی کارەکە دەکات و ئەوەشی کارەکەی لەگەڵ دەکرێت هەردووکیان بکوژن».

تێبینی:

پێویستە خوێنەری بەڕێز ئاگاداری ئەوە بێت جێبەجێکردنی ئەو سزا شەرعییانە نابێت تاك پێی هەڵسێت و هەر کەس لەخۆیەوە جێبەجێیان بکات، بەڵکوو دەبێت دەسەڵات و دەوڵەت پێی هەڵسێت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي المُرْتَدِّ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هەڵگەڕانەوە (لە ئایینی ئیسلام)

٣٠٩. عَنْ عِكْرِمَةَ: أَنَّ عَلِيًّا ﷺ حَرَّقَ قَوْمًا ارْتَدُّوا عَنِ الإِسْلَامِ، فَبَلَغَ ذَلِكَ ابْنَ عَبَّاسٍ ﷺ فَقَالَ: لَوْ كُنْتُ أَنَا لَقَتَلْتُهُمْ بِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ بَدَّلَ دِينَهُ فَاقْتُلُوهُ»، وَلَمْ أَكُنْ لِأُحَرِّقَهُمْ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُعَذِّبُوا بِعَذَابِ اللَّهِ»، فَبَلَغَ ذَلِكَ عَلِيًّا، فَقَالَ: صَدَقَ ابْنُ عَبَّاسٍ.

عیکریمە دەگێڕێتەوە: عەلی ﷺ کەسانێکی سووتاند بەهۆی هەڵگەڕانەوەیان لە ئیسلام (چونکە دەیانگوت: عەلی تۆ خوای)، ئەم باسە بە ئیبن عەبباس ﷺ گەیشتەوە، ئەویش گوتی: ئەگەر من بوومایە دەمکوشتن بەهۆی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ: «هەر کەسێک لە موسوڵمانان ئایینی خۆی گۆڕی، بیکوژن»، نەمدەسووتاندن بەهۆی فەرموودەی پێغەمبەری خوا ﷺ: «کەس ئازار مەدەن بە ئازاری خوا (سووتان)»، جا کاتێک وتەکەی ئیبن عەبباس بە عەلی گەیشتەوە، گوتی: ئیبن عەبباس ڕاست دەکات.

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ فِي المُرْتَدِّ، وَاخْتَلَفُوا فِي المَرْأَةِ إِذَا ارْتَدَّتْ عَنِ الإِسْلَامِ، فَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ: تُقْتَلُ، وَهُوَ قَوْلُ الأَوْزَاعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ. وَقَالَتْ طَائِفَةٌ مِنْهُمْ: تُحْبَسُ وَلَا تُقْتَلُ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَغَيْرِهِ مِنْ أَهْلِ الكُوفَةِ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان سەبارەت بە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، زانایان ڕایان جیاوازە سەبارەت بە ئافرەت ئەگەر هەڵگەڕایەوە، کۆمەڵێک لە زانایان گوتوویانە: ئەوە دەکوژرێت، ئەمە بۆچوونی ئەوزاعی و ئەحمەد و ئیسحاقە، کۆمەڵێکی دیکە گوتوویانە: بەند دەکرێت و ناکوژرێت، ئەمە بۆچوونی سوفیان سەوری و جگە لەوە لە خەڵکی کوفە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ شَهَرَ السِّلَاحَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێک چەک هەڵبگرێت

٣١٠. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَمَلَ عَلَيْنَا السِّلَاحَ فَلَيْسَ مِنَّا».

ئەبو مووسا ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە دژی ئێمە چەک هەڵبگرێت، ئەوە لە ئێمە نییە».



# أَبْوَابُ الصَّيْدِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی ڕاوکردن له پێغەمبەری خواوه ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَرْمِي الصَّيْدَ فَيَغِيبُ عَنْهُ

### باسی ئەوەی هاتووه دەربارەی کەسێک شتێک داوێت بۆ نێچیرێک و لێی ون دەبێت



٣١١. عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رضي الله عنه قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ الصَّيْدِ، فَقَالَ: «إِذَا رَمَيْتَ بِسَهْمِكَ فَاذْكُرِ اسْمَ اللَّهِ، فَإِنْ وَجَدْتَهُ قَدْ قُتِلَ فَكُلْ إِلَّا أَنْ تَجِدَهُ قَدْ وَقَعَ فِي مَاءٍ فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّكَ لَا تَدْرِي المَاءُ قَتَلَهُ أَوْ سَهْمُكَ».

عەدی کوڕی حاتیم رضي الله عنه دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ڕاوکردن، فەرمووی: «ئەگەر تیرەکەت هاویشت ناوی خوای لێ بهێنە، جا ئەگەر بە کوژراوی دۆزیتەوە بیخۆ، ئەگەر بینیت کەوتۆتە نێو ئاو، ئەوە مەیخۆ، چونکە نازانیت ئاوەکە کوشتوویەتی (خنکاوە) یان تیرەکەت».



# أَبْوَابُ الأَطْعِمَةِ

## کۆباسی خواردنەکان

### بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ أَكْلِ المَصْبُورَةِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی خواردنی گیانداری نیشانەکراو



٣١٢. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَكْلِ المُجَثَّمَةِ، وَهِيَ الَّتِي تُصْبَرُ بِالنَّبْلِ.

ئەبو دەرداء ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی گۆشتی گیانداری نیشانەکراوی قەدەغە کردووە، ئەوەی بە ڕم و تیر دەکرێتە نیشانە.

### بَابُ مَا قُطِعَ مِنَ الحَيِّ فَهُوَ مَيِّتٌ

باسی ئەو بەشەی لە ئاژەڵی زیندوو دەبڕدرێت بە مردارەوەبوو دادەنرێت

٣١٣. عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ ﵁ قَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ المَدِينَةَ وَهُمْ يَجُبُّونَ أَسْنِمَةَ الإِبِلِ، وَيَقْطَعُونَ أَلْيَاتِ الغَنَمِ، فَقَالَ: «مَا قُطِعَ مِنَ البَهِيمَةِ وَهِيَ حَيَّةٌ فَهِيَ مَيْتَةٌ».

ئەبو واقیدی لەیسی ﷺ دەڵێت: کاتێک پێغەمبەر ﷺ هاتە شاری مەدینە ئەوان سەرەتەپۆڵکەی وشتریان دەبڕیەوە، دونگی مەڕەکانیان دەبڕیەوە، جا فەرمووی: «ئەو بەشەی لە ئاژەڵی زیندوو دەبڕدرێت، (ئەو بەشە) بە مردارەوەبوو دادەنرێت».



# أَبْوَابُ الْأَحْكَامِ وَالْفَوَائِدِ

## کۆباسی فەرمانەکان و سوودەکان



### بَابُ مَا جَاءَ فِي قَتْلِ الحَيَّاتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کوشتنی مارەکان

٣١٤. عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْتُلُوا الحَيَّاتِ، وَاقْتُلُوا ذَا الطُّفْيَتَيْنِ، وَالأَبْتَرَ، فَإِنَّهُمَا يَلْتَمِسَانِ البَصَرَ، وَيُسْقِطَانِ الحُبْلَى».

سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا، لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «مارەکان بکوژن، ئەو مارانە بکوژن کە خاوەن دوو خەتن، ئەوانەی کە شینەمارن، کە چاوەکان دەکەنە ئامانج، دەبنە هۆی لەبارچوونی منداڵ».

### بَابُ مَا جَاءَ مَنْ أَمْسَكَ كَلْباً مَا يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِهِ

### باسی ئەوەی هاتووە کە کەسێک سەگێک ڕابگرێت، چ پاداشتێکی لێ کەم دەبێتەوە

٣١٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ اقْتَنَى كَلْباً أَوْ اتَّخَذَ كَلْباً لَيْسَ

بِضَارٍ وَلَا كَلْبَ مَاشِيَةٍ نَقَصَ مِنْ أَجْرِهِ كُلَّ يَوْمٍ قِيرَاطَانِ».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک سەگێک ڕابگرێت، کە سەگی ڕاوکردن و شوانی ئاژەڵان نەبێت، ئەو کەسە هەموو ڕۆژێک بەئەندازەی دوو قیڕات لە چاکەکانی کەم دەبێتەوە».



# أبْوَابُ الأَضَاحِيِّ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی قوربانییەکان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ



### بَابُ مَا جَاءَ فِي الأُضْحِيَّةِ بِكَبْشَيْنِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قوربانیکردن بە دوو بەران

٣١٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: ضَحَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ، ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ، وَسَمَّى وَكَبَّرَ وَوَضَعَ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قوربانی بە دوو بەرانی بۆرەکەی قۆچدار کرد، بە دەستی خۆی سەری بڕین، ناوی خوای لێ هێنا و (الله أكبر)ی کرد، پێی موبارەکی لە سەر لاملیان دانا.

### بَابُ مَا لَا يَجُوزُ مِنَ الأَضَاحِيِّ

باسی ئەوەی دروست نییە بۆ کردنە قوربانی

٣١٧. عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﷺ رَفَعَهُ قَالَ: لَا يُضَحَّى بِالعَرْجَاءِ بَيِّنٌ ظَلَعُهَا، وَلَا

بِالعَوْرَاءِ بَيِّنٌ عَوَرُهَا، وَلَا بِالمَرِيضَةِ بَيِّنٌ مَرَضُهَا، وَلَا بِالعَجْفَاءِ الَّتِي لَا تُنْقِي.

بەڕائى كوڕى عازيب ﷺ بەرزى كردۆتەوە بۆ پێغەمبەرى خوا ﷺ و دەڵێت: (چوار جۆر) بۆ قوربانى نابێت: ئاژەڵێكى شەل كە بەئاشكرا بشەلێت، ئاژەڵێكى كوێر كە كوێراتييەكەى ديار بێت، ئاژەڵێكى نەخۆش كە نەخۆشييەكەى ديار بێت، ئەو ئاژەڵەى كە مێشكى نەماوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاشْتِرَاكِ فِي الأُضْحِيَّةِ

### باسى ئەوەى هاتووە دەربارەى هاوبەشيكردن لە قوربانى

٣١٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي سَفَرٍ فَحَضَرَ الأَضْحَى فَاشْتَرَكْنَا فِي البَقَرَةِ سَبْعَةً، وَفِي البَعِيرِ عَشَرَةً.



ئيبن عەبباس ﷺ دەڵێت: جارێكيان لەگەڵ پێغەمبەرى خوا ﷺ بووين لە گەشتێك، جا كاتى قوربانى داهات، بە حەوت كەس بەهاوبەشى مانگايەكمان دەكردە قوربانى، بۆ وشتريش بە دە كەس.

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الشَّاةَ الوَاحِدَةَ تُجْزِي عَنْ أَهْلِ البَيْتِ

### باسى ئەوەى هاتووە كە قوربانى بە سەرە مەڕێك دروستە بۆ خانەوادەيەك

٣١٩. عَنْ عَطَاء بْنَ يَسَارٍ يَقُولُ: سَأَلْتُ أَبَا أَيُّوبَ الأَنْصَارِيَّ ﷺ: كَيْفَ كَانَتِ الضَّحَايَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ فَقَالَ: كَانَ الرَّجُلُ يُضَحِّي بِالشَّاةِ عَنْهُ وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِهِ، فَيَأْكُلُونَ وَيُطْعِمُونَ حَتَّى تَبَاهَى النَّاسُ، فَصَارَتْ كَمَا تَرَى.

عەتائى كوڕى يەسار دەڵێت: پرسيارم لە ئەبو ئەيووبى ئەنصارى ﷺ كرد: لە سەردەمى پێغەمبەرى خوا ﷺ قوربانيكردن چۆن بووە؟ ئەبو ئەيووبى ئەنصارى ﷺ

گوتی: کاتی خۆی کەسێک لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ، قوربانی بە مەڕێک دەکرد بۆ خۆی و خانەوادەکەی، جا لێیان دەخوارد و دەیانبەخشی و ئینجا خەڵکی دەستیان کرد بە خۆهەڵکێشان، هەر وەکوو ئێستا کە دەیبینیت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي العَقِيقَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هۆزەبانە

٣٢٠. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَمَرَهُمْ عَنِ الغُلَامِ شَاتَانِ مُكَافِئَتَانِ، وَعَنِ الجَارِيَةِ شَاةٌ.

عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کردوون (بۆ هۆزەبانە) دوو مەڕ بۆ کوڕ سەر ببڕن، بۆ کچیش مەڕێک.

٣٢١. عَنْ سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ الضَّبِّيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَعَ الغُلَامِ عَقِيقَةٌ، فَأَهْرِيقُوا عَنْهُ دَمًا، وَأَمِيطُوا عَنْهُ الأَذَى».

سەلمانی کوڕی عامیری زەببی رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لەگەڵ هەر منداڵێک (کچ بێت یان کوڕ) هۆزەبانە هەیە، جا خوێنیان بۆ بڕێژن بە کوشتنەوەی ئاژەڵ و پیسی و چەپەڵییان لێ لابدەن».

تێبینی:

(أَمِيطُوا عَنْهُ الأَذَى): واتە: مووی سەریان بتاشن و خاوێنیان بکەنەوە لەدوای حەوت ڕۆژەکە.

٣٢٢. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الأَضْحَى بِالمُصَلَّى، فَلَمَّا قَضَى خُطْبَتَهُ نَزَلَ عَنْ مِنْبَرِهِ، فَأُتِيَ بِكَبْشٍ، فَذَبَحَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِيَدِهِ، وَقَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ، وَاللَّهُ أَكْبَرُ، هَذَا عَنِّي وَعَمَّنْ لَمْ يُضَحِّ مِنْ أُمَّتِي».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵁ دەڵێت: ئامادە بووم لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە جەژنی قوربان لە شوێنی نوێژکردنی جەژن، کاتێ وتاری تەواو کرد لەسەر مینبەر دابەزی، بەرانێکیان بۆ هێنا، پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستەکانی سەری بڕی و فەرمووی: «بە ناوی خوا (الله أكبر)، ئەمە بۆ منە و بۆ ئوممەتەکەمە ئەوانەی کە قوربانییان نەکردووە».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: أَنْ يَقُولَ الرَّجُلُ إِذَا ذَبَحَ: بِسْمِ اللَّهِ وَاللَّهُ أَكْبَرُ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیری ئەوانیش کە: ئەگەر کەسێک ئاژەڵی سەر بڕی، با بڵێت: (بِسْمِ اللهِ وَاللَّهُ أَكْبَرُ).



## بَابٌ مِنَ الْعَقِيقَةِ

### باسێک دەربارەی هۆزەبانە

٣٢٣. عَنْ سَمُرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الغُلَامُ مُرْتَهَنٌ بِعَقِيقَتِهِ يُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ السَّابِعِ، وَيُسَمَّى، وَيُحْلَقُ رَأْسُهُ».

سەموڕە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «منداڵ بارمتەکراوە بە هۆزەبانەکەی، لە ڕۆژی حەوتەم بۆی سەر دەبڕدرێت، ناوی لێ دەنرێت، مووی سەری دەتاشرێت».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ يَسْتَحِبُّونَ أَنْ يُذْبَحَ عَنِ الغُلَامِ العَقِيقَةُ يَوْمَ السَّابِعِ، فَإِنْ لَمْ يَتَهَيَّأْ يَوْمَ السَّابِعِ فَيَوْمَ الرَّابِعَ عَشَرَ، فَإِنْ لَمْ يَتَهَيَّأْ عُقَّ عَنْهُ يَوْمَ حَادٍ وَعِشْرِينَ، وَقَالُوا: لَا يُجْزِئُ فِي العَقِيقَةِ مِنَ الشَّاةِ إِلَّا مَا يُجْزِئُ فِي الأُضْحِيَّةِ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان: بە پەسندیان داناوە کە لە ڕۆژی حەوتەم

منداڵ هۆزەبانەکەی بۆ بکرێت، ئەگەر ڕۆژی حەوتەم نەکرا، ئەوە با ڕۆژی چواردەیەم بێت، ئەگەر ڕۆژی چواردەیەم نەکرا، با هۆزەبانەکەی ڕۆژی بیست و یەک بێت، هەروەها گوتوویانە: تەنیا ئەو مەڕەی بۆ قوربانی دەبێت بۆ هۆزەبانە دروستە و دەبێت (ئاژەڵێک بۆ قوربانی نەبێت بۆ هۆزەبانەش نابێت).

## بَابُ تَرْكِ أَخْذِ الشَّعْرِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ

### باسی دەستکارینەکردنی مووەکان بۆ کەسێک ویستی قوربانی هەبێت

٣٢٤. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ رَأَى هِلَالَ ذِي الحِجَّةِ، وَأَرَادَ أَنْ يُضَحِّيَ، فَلَا يَأْخُذَنَّ مِنْ شَعْرِهِ، وَلَا مِنْ أَظْفَارِهِ».

ئوم سەلەمە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک سەرەتای مانگی زولحیجەی بینی، مەبەستی بوو قوربانی بکات، با مووەکانی لێ نەکاتەوە و نینۆکەکانی نەقرتێنێت».



# أَبْوَابُ النُّذُورِ وَالأَيْمَانِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی نەزر و سوێندخواردنەکان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنْ لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ

### باسی ئەوەی هاتووە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە نەزر بۆ کاری تاوان دانامەزرێت



٣٢٥. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا نَذْرَ فِي مَعْصِيَةٍ، وَكَفَّارَتُهُ كَفَّارَةُ يَمِينٍ».

عائیشە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نەزرکردن بۆ کاری تاوان دانامەزرێت، کەفارەتەکەشی هەمان کەفارەتی سوێندە».

### بَابُ مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ

### باسی هەر کەسێک نەزر بکات کە ملکەچیی خوا بکات با ملکەچی ببێت

٣٢٦. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ نَذَرَ أَنْ يُطِيعَ اللَّهَ فَلْيُطِعْهُ، وَمَنْ نَذَرَ أَنْ يَعْصِيَ اللَّهَ فَلَا يَعْصِهِ».

عائیشە ﵂ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک ملکەچبوونی خوا لەسەر خۆی نەزر بکات، با کارەکە بکات و بۆی ملکەچ ببێت، هەر کەسێک سەرپێچیکردنی خۆی بەرانبەر بە خوا لەسەر خۆی نەزر بکات، با سەرپێچییەکە نەکات».

✎ تێبینی:

کاتێک موسوڵمانێك نەزرێکی کرد، ئەگەر نەزرەکە گوناهی تێدا بوو، ئەوە نابێت پێیەوە پابەند بێت و پێویستە وازی لێ بێنێت.

* وَهُوَ قَوْلُ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ، وَبِهِ يَقُولُ مَالِكٌ، وَالشَّافِعِيُّ قَالُوا: لَا يَعْصِي اللَّهَ وَلَيْسَ فِيهِ كَفَّارَةُ يَمِينٍ إِذَا كَانَ النَّذْرُ فِي مَعْصِيَةٍ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیری ئەوانیش، مالیک و شافیعی بەپێی ئەوەیان گوتووە، گوتوویانە: سەرپێچی خوا ناکات، هەروەها کەفارەتی وەک کەفارەتی سوێندیش نادات، ئەگەر هاتو نەزرکردنەکە کارێکی تاوان بێت (نەزرەکە ناکات و کەفارەتیشی نادات).



## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا

### باسی ئەوەی هاتووە کەسێک سوێندی لە سەر شتێک خوارد، دواتر بینیی شتێکی چاکتر لەوە هەیە

٣٢٧. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ، لَا تَسْأَلِ الإِمَارَةَ، فَإِنَّكَ إِنْ أَتَتْكَ عَنْ مَسْأَلَةٍ وُكِلْتَ إِلَيْهَا، وَإِنْ أَتَتْكَ عَنْ غَيْرِ مَسْأَلَةٍ أُعِنْتَ عَلَيْهَا، وَإِذَا حَلَفْتَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَيْتَ غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ، وَلْتُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِكَ».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەموڕە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەی عەبدوڕڕەحمان، داوای فەرمانڕەوایی مەکە، چونکە ئەگەر بەهۆی داواکردنی خۆتەوە پێت درا، ئەوە دەخرێیتە ژێر باڵیەوە، ئەگەر بەبێ داواکردنی خۆت پێت درا، ئەوکات هاوکاری دەکرێیت، ئەگەر سوێندت لە سەر شتێک خوارد، زانیت شتێکی لەوە چاکتر هەیە، ئەوە ئەنجام بدە کە چاکترە، (سوێندەکەت بشکێنە و) کەفاڕەتی بۆ بدە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاسْتِثْنَاءِ فِي اليَمِينِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هەڵاوردن لە سوێندخواردندا

٣٢٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ، فَقَالَ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ فَقَدِ اسْتَثْنَى، فَلَا حِنْثَ عَلَيْهِ».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک سوێند بخوات لەسەر شتێک، ئینجا بڵێت: بە ویستی خوا (إن شاءالله)، کەفاڕەتی لەسەر نییە (سوێندەکە جێبەجێ بکات، یاخود نا، سوێندەکەی ناکەوێت)».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ الِاسْتِثْنَاءَ إِذَا كَانَ مَوْصُولًا بِاليَمِينِ فَلَا حِنْثَ عَلَيْهِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالأَوْزَاعِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَعَبْدِ اللَّهِ بْنِ المُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیر ئەوانیش، ئەگەر هاتو سوێندەکەی بەستەوە بە گوتنی: بە ویستی خوا (إن شاء الله)، ئەوە سوێندە (کەفاڕەتی) شکاندنی لەسەر نییە، ئەمە بۆچوونی سوفیانی سەوری و ئەوزاعی و مالیکی کوڕی ئەنەس و عەبدوڵڵای کوڕی موبارەک و شافیعی و ئەحمەد و ئیسحاقە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الحَلِفِ بِغَيْرِ اللَّهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی سوێندخواردن بە جگە لە خوا

٣٢٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ أَدْرَكَ عُمَرَ وَهُوَ فِي رَكْبٍ وَهُوَ يَحْلِفُ بِأَبِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ لِيَحْلِفْ حَالِفٌ بِاللَّهِ أَوْ لِيَسْكُتْ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتۆتە لای عومەر، لەو کاتەدا لەگەڵ کۆمەڵە سوارێک بووە، عومەر سوێندی بە باوکی دەخوارد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئاگادار بن خوا قەدەغەتان دەکات لە سوێندخواردن بە باوک و باپیرانتان، هەر کەسێک ویستی سوێندێک بخوات، با سوێندەکەی بە خوا بخوات یان با بێدەنگ بێت».



## بَابُ فِي كَرَاهِيَةِ النَّذْرِ

### باسێک دەربارەی ناپەسندیی نەزرکردن

٣٣٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَنْذِرُوا فَإِنَّ النَّذْرَ لَا يُغْنِي مِنَ القَدَرِ شَيْئًا، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ البَخِيلِ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نەزر مەکەن، چونکە نەزرکردن هیچ شتێک لە قەدەری خوا ناگۆڕێت، بەڵکوو تەنیا شتێکە لە کەسی ڕەزیل دەسەندرێت».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ كَرِهُوا النَّذْرَ وقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ المُبَارَكِ: مَعْنَى الكَرَاهِيَةِ فِي النَّذْرِ فِي الطَّاعَةِ وَالمَعْصِيَةِ، وَإِنْ نَذَرَ الرَّجُلُ بِالطَّاعَةِ فَوَفَّى بِهِ فَلَهُ فِيهِ أَجْرٌ وَيُكْرَهُ لَهُ النَّذْرُ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ و غەیری ئەوانیش: نەزرکردنیان بە ناپەسند داناوە، عەبدوڵڵای کوڕی موبارەک گوتوویەتی: مەبەست لە ناپەسندیی نەزرکردن، کارەکە چاکە بێت یان خراپە، ئەگەر کەسێک نەزری کرد بە کاری چاکە و نەزرەکەی هێنایە جێ، ئەوە پاداشتی بۆ دەنووسرێت و لەگەڵ ئەوەشدا نەزرکردنەکەی هەر ناپەسندە.

## بَابُ مَا جَاءَ كَيْفَ كَانَ يَمِينُ النَّبِيِّ ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چۆنیەتی سوێندخواردنی پێغەمبەر ﷺ

٣٣١. عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: كَثِيرًا مَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَحْلِفُ بِهَذِهِ اليَمِينِ: «لَا وَمُقَلِّبِ القُلُوبِ».

سالیمی کوڕی عەبدوڵڵا، لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: بەزۆری پێغەمبەری خوا ﷺ سوێندی بەم شێوەیە دەفەرموو: نا، سوێند بەو زاتەی دڵەکان دەگۆڕێت.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي قَضَاءِ النَّذْرِ عَنِ المَيِّتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گێڕانەوەی نەزرکردن لەبری مردوو

٣٣٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ سَعْدَ بْنَ عُبَادَةَ اسْتَفْتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ تُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اقْضِ عَنْهَا».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: سەعدی کوڕی عوبادە پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد سەبارەت بە نەزرێک کە لەسەر دایکی بووە، پێش ئەوەی ئەنجامی بدات، وەفاتی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «لەبری ئەو ئەنجامی بدە».

# أبْوَابُ السِّيرَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## كۆباسی ژیاننامە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي الغَنِيمَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەستکەوتی جەنگ



٣٣٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «فُضِّلْتُ عَلَى الأَنْبِيَاءِ بِسِتٍّ: أُعْطِيتُ جَوَامِعَ الكَلِمِ، وَنُصِرْتُ بِالرُّعْبِ، وَأُحِلَّتْ لِيَ الغَنَائِمُ، وَجُعِلَتْ لِيَ الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، وَأُرْسِلْتُ إِلَى الخَلْقِ كَافَّةً، وَخُتِمَ بِيَ النَّبِيُّونَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ڕێز و پلەی زیاترم پێ دراوە بەسەر پێغەمبەرانی دیکەدا بە شەش تایبەتمەندی: وشەی کۆکەرەوەی پڕواتام پێ دراوە، سەرکەوتنم پێ دراوە بەهۆی ترسانی دوژمن لێم، دەستکەوتی جەنگم بۆ حەڵاڵ کراوە، زەویم بۆ کراوە بە شوێنی نوێژکردن و پاککەرەوە، بۆ گشت خەڵکی ڕەوانە کراوم ، بە ناردنی من پێغەمبەرایەتی کۆتایی پێ هاتووە».

## بَابُ فِي سَهْمِ الْخَيْلِ

### باسێك دەربارەی پشکی ئەسپ (لە دەستکەوتی جەنگدا)

٣٣٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَسَمَ فِي النَّفَلِ لِلْفَرَسِ بِسَهْمَيْنِ، وَلِلرَّجُلِ بِسَهْمٍ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەسکەوتەکانی دابەش کرد، بۆ ئەسپەکە دوو پشک، بۆ کەسەکە پشکێک.

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالأَوْزَاعِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَابْنِ المُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ قَالُوا: لِلْفَارِسِ ثَلَاثَةُ أَسْهُمٍ، سَهْمٌ لَهُ، وَسَهْمَانِ لِفَرَسِهِ، وَلِلرَّاجِلِ سَهْمٌ.



کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیری ئەوانیش، ئەمە بۆچوونی سوفیانی سەوری، ئەوزاعی، مالیکی کوڕی ئەنەس، ئیبن موبارەک، شافیعی، ئەحمەد و ئیسحاقە، کە گوتوویانە: کەسی سوار سێ پشکی بۆ هەیە، پشکێک بۆ خۆی، دوو پشک بۆ ئەسپەکەی، کەسی پیادەش پشکێکی بۆ هەیە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَهْلِ الذِّمَّةِ يَغْزُونَ مَعَ المُسْلِمِينَ هَلْ يُسْهَمُ لَهُمْ؟

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خاوەن پەیمان کە بەشداری جەنگ بکەن، ئایا پشکیان بەردەکەوێت؟

٣٣٥. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ خَرَجَ إِلَى بَدْرٍ حَتَّى إِذَا كَانَ بِحَرَّةِ الوَبَرَةِ لَحِقَهُ رَجُلٌ مِنَ المُشْرِكِينَ يَذْكُرُ مِنْهُ جُرْأَةً وَنَجْدَةً، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ؟»، قَالَ: لَا، قَالَ: «ارْجِعْ، فَلَنْ أَسْتَعِينَ بِمُشْرِكٍ».

عائیشه ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ بەدر هەتا گەیشتە بیحەڕەوەبڕە، پیاوێک لە هاوبەشدانەران دوای کەوت (بۆ بەشداریکردنی جەنگ) کە بە ئازا و جوامێر و بەهاناوەچوو باس دەکرا، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بڕوات هەیە بە خوا و پێغەمبەرەکەی؟»، گوتی: نەخێر، فەرمووی: «بگەڕێوە داوای یارمەتی ناکەم لە کەسانی هاوبەش بۆخوادانەر».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ، قَالُوا: لَا يُسْهَمُ لِأَهْلِ الذِّمَّةِ، وَإِنْ قَاتَلُوا مَعَ المُسْلِمِينَ العَدُوَّ، وَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: أَنْ يُسْهَمَ لَهُمْ إِذَا شَهِدُوا القِتَالَ مَعَ المُسْلِمِينَ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای هەندێک لە زانایان، گوتوویانە: خاوەن پەیمان پشکیان بۆ نییە، ئەگەر بەشداری جەنگیش بن لەگەڵ موسوڵمانان دژ بە دوژمن، بەڵام هەندێک لە زانایان پێیان وایە کە پشکیان بۆ دەبێت ئەگەر ئامادەی جەنگ بوون لەگەڵ موسوڵمانان.

٣٣٦. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁ قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي نَفَرٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ خَيْبَرَ، فَأَسْهَمَ لَنَا مَعَ الَّذِينَ افْتَتَحُوهَا.

ئەبو مووسا ﵁ دەڵێت: هاتینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ کۆمەڵێک لە هۆزی ئەشعەرییەکان لە کاتی جەنگی خەیبەر، جا پشکی پێ داین لەگەڵ ئەو کەسانەی کە بەشداری ئازادکردنی خەیبەر بوون.

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ قَالَ الأَوْزَاعِيُّ: مَنْ لَحِقَ بِالمُسْلِمِينَ قَبْلَ أَنْ يُسْهَمَ لِلْخَيْلِ أُسْهِمَ لَهُ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای هەندێک لە زانایان، ئەوزاعی گوتوویەتی: هەر کەسێک بەدوای موسوڵمانان بکەوێت پێش ئەوەی پشک بۆ ئەسپ دیاری بکرێت، ئەوە پشک بۆ ئەویش دادەنرێت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ سَلَبُهُ

## باسی ئەوەی هاتووە هەر کەسێک کەسێکی کوشت (لە جەنگدا) کەلوپەلەکەی بۆ ئەو دەبێت

٣٣٧. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَتَلَ قَتِيلاً لَهُ عَلَيْهِ بَيِّنَةٌ فَلَهُ سَلَبُهُ».

ئەبو قەتادە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک کەسێکی کوشت (لە کاتی جەنگدا)، بەڵگەی بەدەستەوە بێت لە سەر کوشتنەکەی، ئەوە کەلوپەلەکەی بۆ ئەو دەبێت».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ، وَهُوَ قَوْلُ الأَوْزَاعِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ وقَالَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ: لِلإِمَامِ أَنْ يُخْرِجَ مِنَ السَّلَبِ الخُمُسَ وقَالَ الثَّوْرِيُّ: النَّفَلُ أَنْ يَقُولَ الإِمَامُ: مَنْ أَصَابَ شَيْئًا فَهُوَ لَهُ، وَمَنْ قَتَلَ قَتِيلاً فَلَهُ سَلَبُهُ، فَهُوَ جَائِزٌ، وَلَيْسَ فِيهِ الخُمُسُ، وقَالَ إِسْحَاقُ: السَّلَبُ لِلْقَاتِلِ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ شَيْئًا كَثِيرًا فَرَأَى الإِمَامُ أَنْ يُخْرِجَ مِنْهُ الخُمُسَ، كَمَا فَعَلَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیری ئەوانیش، ئەمە بۆچوونی ئەوزاعی و شافیعی و ئەحمەدە، هەندێک لە زانایان گوتوویانە: پێشەوا مافی هەیە کە لە دەستکەوتی جەنگاوەر پێنجیەکی لێ وەربگرێت، سەوری گوتوویەتی: پێشەوا بۆی هەیە بڵێت: هەر جەنگاوەرێک هەر شتێکی دەست بکەوێت بۆ ئەو دەبێت، هەر کەسێک کەسێکی کوشت چەک و کەلوپەلی بۆ ئەو دەبێت، ئەمە دروستە، ئەوکات پێنجیەکی تێدا نابێت، ئیسحاق گوتوویەتی: چەک و کەلوپەلی کوژراو بۆ بکوژەکەیەتی، مەگەر هاتو زۆر بێت، ئەوکات پێشەوا بۆی هەیە پێنجیەکی لێ وەربگرێت، هەر وەک عومەری کوڕی

خەتتاب وای کردوە (ڕەزا و ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێت).

## بَابُ فِي كَرَاهِيَةِ بَيْعِ المَغَانِمِ حَتَّى تُقْسَمَ

## باسێک دەربارەی ناپەسندیی فرۆشتنی دەستکەوت پێش دابەشکردنی

٣٣٨. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ شِرَاءِ المَغَانِمِ حَتَّى تُقْسَمَ.

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ کڕینەوەی ماڵی دەستکەوتی جەنگی قەدەغەی کرد هەتا دوای دابەشکردنی.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي طَعَامِ المُشْرِكِينَ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆراکی هاوبەشدانەران



٣٣٩. عَنْ قَبِيصَةِ بْنِ هُلْبٍ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ طَعَامِ النَّصَارَى؟ فَقَالَ: «لَا يَتَخَلَّجَنَّ فِي صَدْرِكَ طَعَامٌ ضَارَعْتَ فِيهِ النَّصْرَانِيَّةَ».

قەبیسەی کوڕی هولب لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە خۆراکی نەصڕانییەکان؟ فەرمووی: «با هیچ گومان لە دڵت نەبێت سەبارەت بە خۆراکیان (دروستە)، ئەگەرنا ئەوە (لە توندینواندن) وەک نەصڕانییەکانت کردووە».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنَ الرُّخْصَةِ فِي طَعَامِ أَهْلِ الكِتَابِ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان لە ڕێپێدان بە خواردنی خۆراکی کەسانی ئەهلی کتاب.

## بَابُ فِي كَرَاهِيَةِ التَّفْرِيقِ بَيْنَ السَّبْيِ

### باسێک دەربارەی قەدەغەکردنی لەیەکجیاکردنەوەی کۆیلەی جەنگ

٣٤٠. عَنْ أَبِي أَيُّوبَ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ فَرَّقَ بَيْنَ وَالِدَةٍ وَوَلَدِهَا فَرَّقَ اللَّهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ أَحِبَّتِهِ يَوْمَ القِيَامَةِ».

ئەبو ئەیووب ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «هەر کەسێک منداڵ و دایکی لەیەک جیا بکاتەوە، خوا لە ڕۆژی دواییدا لە خۆشەویستانی جیا دەکاتەوە».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ، كَرِهُوا التَّفْرِيقَ بَيْنَ السَّبْيِ بَيْنَ الوَالِدَةِ وَوَلَدِهَا، وَبَيْنَ الوَلَدِ وَالوَالِدِ، وَبَيْنَ الإِخْوَةِ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیری ئەوانیش کە: بە ناپەسەندیان داناوە لە کۆیلەکانی جەنگ دایک و منداڵ، کوڕ و باوک، برا و برا لەیەک جیا بکرێنەوە.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي قَتْلِ الأُسَارَى وَالفِدَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کوشتنی دیلەکان و وەرگرتنی فیدیە

٣٤١. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَدَى رَجُلَيْنِ مِنَ المُسْلِمِينَ بِرَجُلٍ مِنَ المُشْرِكِينَ.

عیمرانی کوڕی حوصەین ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دوو کەسی موسوڵمانی ئازاد کرد لە بەرانبەر ئازادکردنی کەسێکی هاوبەشدانەر.

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ العِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ أَنَّ لِلإِمَامِ

أَنْ يَمُنَّ عَلَى مَنْ شَاءَ مِنَ الأُسَارَى، وَيَقْتُلَ مَنْ شَاءَ مِنْهُمْ، وَيَفْدِي مَنْ شَاءَ.

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و غەیری ئەوانیش، کەوا: پێشەوا بۆی هەیە دیلەکان ئازاد بکات ئەوانەی ویستی بەبێ بەرانبەر، ئەوانی دیکە بکوژێت کە خواستی لەسەرە، تۆڵە وەربگرێت لەوانەی خواستی لەسەرە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی کوشتنی ئافرەتان و منداڵان

٣٤٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ امْرَأَةً وُجِدَتْ فِي بَعْضِ مَغَازِي رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَقْتُولَةً، فَأَنْكَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَلِكَ، وَنَهَى عَنْ قَتْلِ النِّسَاءِ وَالصِّبْيَانِ.



ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: لە یەکێك لە جەنگەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتێک بەکوژراوی دۆزرایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نکووڵی کرد لەو کارە، (پاشان) کوشتنی ئافرەتان و منداڵانی قەدەغە کرد.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الغُلُولِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دزینی دەستکەوتی جەنگ

٣٤٣. عَنْ ثَوْبَانَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ مَاتَ وَهُوَ بَرِيءٌ مِنْ ثَلَاثٍ: الكِبْرِ، وَالغُلُولِ، وَالدَّيْنِ دَخَلَ الجَنَّةَ».

سەوبان رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر موسوڵمانێک بمرێت و لە سێ شت دوور بێت (ئەوانیش): خۆبەزلزانین، دزینی دەستکەوتی جەنگ، قەرزداری، ئەوە ئەو کەسە دەچێتە بەهەشتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي خُرُوجِ النِّسَاءِ فِي الحَرْبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەرچوونی ئافرەتان بۆ جەنگ

٣٤٤. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَغْزُو بِأُمِّ سُلَيْمٍ وَنِسْوَةٍ مَعَهَا مِنَ الأَنْصَارِ يَسْقِينَ المَاءَ وَيُدَاوِينَ الجَرْحَى.

ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەشداری بە ئوم سولەیم و ئافرەتانی دیکەی ئەنصاری دەکرد لە جەنگ، بۆ ئەوەی ئاودان و تیماری بریندارەکان بکەن.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الغَدْرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی غەدر و ناپاکی



٣٤٥. عَنْ سُلَيْمِ بْنِ عَامِرٍ يَقُولُ: كَانَ بَيْنَ مُعَاوِيَةَ وَبَيْنَ أَهْلِ الرُّومِ عَهْدٌ، وَكَانَ يَسِيرُ فِي بِلَادِهِمْ، حَتَّى إِذَا انْقَضَى العَهْدُ أَغَارَ عَلَيْهِمْ، فَإِذَا رَجُلٌ عَلَى دَابَّةٍ أَوْ عَلَى فَرَسٍ، وَهُوَ يَقُولُ: اللَّهُ أَكْبَرُ، وَفَاءٌ لَا غَدْرٌ، وَإِذَا هُوَ عَمْرُو بْنُ عَبَسَةَ، فَسَأَلَهُ مُعَاوِيَةُ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ قَوْمٍ عَهْدٌ فَلَا يَحُلَّنَّ عَهْدًا، وَلَا يَشُدَّنَّهُ حَتَّى يَمْضِيَ أَمَدُهُ أَوْ يَنْبِذَ إِلَيْهِمْ عَلَى سَوَاءٍ»، قَالَ: فَرَجَعَ مُعَاوِيَةُ.

سولەیمی کوڕی عامیر ﵁ دەڵێت: لە نێوان موعاویە و خەڵکی ڕۆم پەیمانی ئاشتی هەبوو (بۆ ماوەیەکی دیاریکراو)، موعاویە لە وڵاتی ئەوان دەسووڕایەوە، تا ئەگەر ماوەی پەیمانەکە کۆتایی هات هێرش بکاتە سەریان، پیاوێک لەسەر پشتی ئاژەڵێک یان ئەسپێک بوو دەیگوت: الله أکبر وەفاداری نەک غەدرکاری، دەرکەوت ئەو کەسە عەمری کوڕی عەبەسە بوو، موعاویە پرسیاری لێ کرد سەبارەت بەوەی گوتی؟ ئەویش گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «هەر کەسێک لە نێوان خۆی و کەسانێکی دیکە پەیمانی ئاشتی هەبوو، با پەیمانەکە هەڵنەوەشێنێتەوە،

گۆڕانکاری تێدا نەکات تا ماوەکەی تەواو دەبێت، یان ئاگاداریان دەکاتەوە لە هەڵوەشاندنەوەی (کاتێک ئەگەر هەست کرا بە فێڵ و غەدریان)»، گوتی: جا موعاویە بەهۆی ئەوەوە گەڕایەوە.

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءً يَوْمَ القِيَامَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە بۆ هەموو غەدرکارێک ئاڵایەک بەرز دەکرێتەوە لە ڕۆژی دوایی

٣٤٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ الغَادِرَ يُنْصَبُ لَهُ لِوَاءٌ يَوْمَ القِيَامَةِ».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «بەڕاستی ئاڵایەک بەرز دەکرێتەوە بۆ کەسی غەدرکار لە ڕۆژی دوایی (وەک نیشانە بۆ تاوانەکانیان)».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَخْذِ الجِزْيَةِ مِنَ المَجُوسِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سەرانە وەرگرتن لە ئاگرپەرستان

٣٤٧. عَنْ بَجَالَةَ: أَنَّ عُمَرَ ﷺ كَانَ لَا يَأْخُذُ الجِزْيَةَ مِنَ المَجُوسِ، حَتَّى أَخْبَرَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَخَذَ الجِزْيَةَ مِنْ مَجُوسِ هَجَرَ.

بەجالە دەگێڕێتەوە: عومەر ﷺ لە پێشوودا سەرانەی وەرنەدەگرت لە ئاگرپەرستان، تا عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف پێی ڕاگەیاند کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەرانەی وەرگرتووە لە ئاگرپەرستانی هەجەر.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الهِجْرَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کۆچکردن

٣٤٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ: «لَا هِجْرَةَ بَعْدَ الفَتْحِ، وَلَكِنْ جِهَادٌ وَنِيَّةٌ، وَإِذَا اسْتُنْفِرْتُمْ فَانْفِرُوا».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: لە کاتی ئازادکردنی شاری مەککەی پیرۆز پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «کۆچکردن نییە (لە مەککە) لەدوای ئازادکردنی، بەڵام ئەمەی دەمێنێت جیهادکردن و نیازی کۆچکردنە (لەپێناو ئیسلام)، جا ئەگەر داوای ڕاپەڕینتان لێ کرا، ئەوکات هەمووتان ڕاپەڕن (بۆ جیهاد لەپێناو ئیسلام)».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي بَيْعَةِ النَّبِيِّ ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەڵێندان بە پێغەمبەر ﷺ

٣٤٩. عَنْ يَزِيدَ بْنِ أَبِي عُبَيْدٍ قَالَ: قُلْتُ لِسَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ عَلَى أَيِّ شَيْءٍ بَايَعْتُمْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ الحُدَيْبِيَةِ؟ قَالَ: «عَلَى المَوْتِ».

یەزیدی کوڕی ئەبو عوبەید دەڵێت: بە سەلمەی کوڕی ئەکوەعم ﵁ گوت: لەسەر چی بەڵێنتان بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە لە ڕۆژی حودەیبیە؟ گوتی: لەسەر مەرگ (بەرگری بکەین تا مردن).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي نَكْثِ البَيْعَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هەڵوەشاندنەوەی بەڵێن و پەیمان

٣٥٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمُ اللَّهُ يَوْمَ

الْقِيَامَةِ، وَلَا يُزَكِّيهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ: رَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا فَإِنْ أَعْطَاهُ وَفَى لَهُ، وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ لَمْ يَفِ لَهُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سێ کۆمەڵ هەن خوا لە ڕۆژی دوایی قسەیان لەگەڵ ناکات و پاکیان ناکاتەوە و ئازارێکی بەئێشیشیان دەدا (یەکێک لەوانە): کەسێک پەیمان بدات بە پێشەوایەک، جا ئەگەر ماڵی پێ بدات، ئەوە وەفای هەبێت بۆی، ئەگەر پێی نەدات، ئەوە وەفای بۆی نەبێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي بَيْعَةِ النِّسَاءِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چۆنیەتی بەڵێنوەرگرتن لە ئافرەتان

٣٥١. عَنْ أُمَيْمَةَ بِنْتِ رُقَيْقَةَ ﵂ تَقُولُ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي نِسْوَةٍ، فَقَالَ لَنَا: «فِيمَا اسْتَطَعْتُنَّ وَأَطَقْتُنَّ»، قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَرْحَمُ بِنَا مِنَّا بِأَنْفُسِنَا، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، بَايِعْنَا، - قَالَ سُفْيَانُ: تَعْنِي صَافِحْنَا، - فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا قَوْلِي لِمِائَةِ امْرَأَةٍ كَقَوْلِي لِامْرَأَةٍ وَاحِدَةٍ».

ئومەیمەی کچی ڕوقەیقە ﵂ دەڵێت: لەنێو ئەو ئافرەتانە بوومە کە بەڵێنیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە، پێمانی فەرموو: «ئەوەی لە تواناتاندایە و بۆتان دەکرێت»، گوتم: خوا و پێغەمبەرەکەی بەسۆزترن بەرانبەر بە ئێمە لە خۆمان، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، بەڵێنمان لێ وەربگرە -سوفیان دەڵێت: واتە دەست لەنێو دەست و تەوقەکردن-، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «قسەم بۆ سەد ئافرەت وەک ئەو وتەمە کە بۆ یەک ئافرەت بێت».

تێبینی:

مەبەست لەو برگەی کۆتایی ئەوەیە، من تەوقە ناکەم لەگەڵ ئافرەتان بۆ بەیعەت

لێوەرگرتنیان وەك چۆن لەگەڵ پیاوان تەوقە دەکەم و دەست دەخەمە نێو دەستیان، بەڵکوو تەنها بە زمان و قسەکردن دەڵێم: ئەوە بەڵێنم خستنە ئەستۆ و پەیمان لە نێوانمان بەپێی ئەوەی لە تواناتاندا هەیە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الخُمُسِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێدانی پێنجیەک (لە دەستکەوتی جەنگ)

٣٥٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِوَفْدِ عَبْدِ القَيْسِ: «آمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا خُمُسَ مَا غَنِمْتُمْ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بە نێردراوی هۆزی عەبدولقەیسی فەرموو: «فەرمانتان پێ دەکەم بە پێدانی پێنجیەک لەوەی دەستتان دەکەوێت لە جەنگ».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرِكَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی پێغەمبەری خوا ﷺ

٣٥٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: جَاءَتْ فَاطِمَةُ ﵂ إِلَى أَبِي بَكْرٍ ﵁ فَقَالَتْ: مَنْ يَرِثُكَ؟ قَالَ: أَهْلِي، وَوَلَدِي، قَالَتْ: فَمَا لِي لَا أَرِثُ أَبِي؟ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا نُورَثُ»، وَلَكِنِّي أَعُولُ مَنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُولُهُ، وَأُنْفِقُ عَلَى مَنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُنْفِقُ عَلَيْهِ.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: (خاتوو) فاتیمە ﵂ هاتە لای ئەبو بەکر ﵁ گوتی: کێ میراتت لێ دەگرێت؟ گوتی: خانەوادەم و منداڵم، گوتی: باشە بۆ من میرات ناگرم لە باوکم؟ ئەبو بەکر گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە، دەیفەرموو: «ئێمە ماڵ

و سامانمان لێ بەمیرات ناگیرێت (بەهۆی پێغەمبەرایەتییەوە)»، بەڵام ئەوانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەئەستۆی دەگرتن و خەرجی بۆ دەکردن، منیش لەئەستۆیان دەگرم و خەرجییان بۆ دەکەم.



# أَبْوَابُ فَضَائِلِ الْجِهَادِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی پێگە و گەورەیی جیهاد لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الجِهَادِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێگە و پاداشتی جیهادکردن



٣٥٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا يَعْدِلُ الجِهَادَ؟ قَالَ: «إِنَّكُمْ لَا تَسْتَطِيعُونَهُ»، فَرَدُّوا عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ، أَوْ ثَلَاثًا، كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ: «لَا تَسْتَطِيعُونَهُ»، فَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ: «مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مَثَلُ القَائِمِ الصَّائِمِ الَّذِي لَا يَفْتُرُ مِنْ صَلَاةٍ وَلَا صِيَامٍ، حَتَّى يَرْجِعَ الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا، چ شتێک لە پاداشتدا وەک جیهادە؟ فەرمووی: «بەڕاستی ئێوە ناتوانن»، جا دووجار یان سێ جار پرسیاریان لێ کرد، ئەویش هەر دەیفەرموو: «ناتوانن»، جا بۆ جاری سێیەم فەرمووی: «وێنەی موجاهید لەپێناوی خوا وەک وێنەی کەسێکە کە بەردەوام لە شەودا نوێژ بکات و لە ڕۆژدا بەڕۆژوو بێت، پشوو نەدات و بەردەوام بێت لە نوێژکردن و بەڕۆژووبوون، تا کەسی موجاهید لەپێناوی خوا دەگەڕێتەوە (بۆ شوێنی خۆی)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ مَنْ مَاتَ مُرَابِطًا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێز و پاداشتی کەسێک بمرێت بەپاسەوانکاری

٣٥٥. **عَنْ فَضَالَةَ بْن عُبَيْدٍ ﵁ يُحَدِّثُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ:** «كُلُّ مَيِّتٍ يُخْتَمُ عَلَى عَمَلِهِ إِلَّا الَّذِي مَاتَ مُرَابِطًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَإِنَّهُ يُنْمَى لَهُ عَمَلُهُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ، وَيَأْمَنُ مِنْ فِتْنَةِ القَبْرِ»، **وَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ:** «المُجَاهِدُ مَنْ جَاهَدَ نَفْسَهُ».

فەزالەی کوڕی عوبەید ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەموو مردوویەک (لەگەڵ مردنی) کۆتایی دەهێنرێت بە کارەکانی، تەنیا ئەو کەسە نەبێت کە دەمرێت لە کاری پاسەوانی لەپێناوی خوا، بەڕاستی ئەو کەسە کارەکانی لە گەشە و زیادبوونە تا ڕۆژی دوایی، دڵنیایی پێ دەدرێت (لە پارێزرانی) لە سزای نێو گۆڕ»، هەروەها گوێبیستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم دەیفەرموو: «موجاهید ئەو کەسەیە کە لە دژی نەفس و ئارەزووی بجەنگێت (بۆ گرتنەبەری ڕاستەڕێ)».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الصَّوْمِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێگە و پاداشتی بەڕۆژووبوون لەپێناو خوا

٣٥٦. **عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ:** «مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ زَحْزَحَهُ اللَّهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک ڕۆژێک لەپێناوی خوا بەڕۆژوو بێت، خوا بەئەندازەی حەفتا پاییز (ڕۆژەڕێ) لە ئاگری دۆزەخی دوور دەخاتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ النَّفَقَةِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێگە و پاداشتی خەرجکردنی ماڵ لەڕێگای خوا

٣٥٧. عَنْ خُرَيْمِ بْنِ فَاتِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ أَنْفَقَ نَفَقَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ كُتِبَتْ لَهُ بِسَبْعِ مِائَةِ ضِعْفٍ».

خوڕەیمی کوڕی فاتیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک خەرجییەک بکات لەپێناوی خوا، پاداشتەکەی بە حەوت سەد هێندە بۆ دەنووسرێت (واتە: لە کاتی جیهاد ماڵ وسامانی خەرج بکات بۆ پێویستییەکانی جیهاد)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێگە و پاداشتی کەسێک پێداویستیی موجاهیدێک دابین بکات



٣٥٨. عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ جَهَّزَ غَازِيًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَقَدْ غَزَا، وَمَنْ خَلَفَ غَازِيًا فِي أَهْلِهِ فَقَدْ غَزَا».

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک پێداویستیی موجاهیدێک دابین بکات لەپێناو خوا بەڕاستی پاداشتی جیهادی بەدەست هێناوە (گەر بەشداریشی نەکردبێت)، هەر کەسێک چاودێری خانەوادەی موجاهیدێک بکات، بەڕاستی پاداشتی جیهادی بەدەست هێناوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ مَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێگە و پاداشتی کەسێک مووی سپی بکات لەپێناو خوا

٣٥٩. عَنْ شُرَحْبِيل بْن السِّمْطِ قَالَ: يَا كَعْبُ بْنَ مُرَّةَ، حَدِّثْنَا عَنْ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَاحْذَرْ، قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ شَابَ شَيْبَةً فِي الإِسْلَامِ كَانَتْ لَهُ نُورًا يَوْمَ القِيَامَةِ».

شورەحبیلی کوڕی سیمت ﷺ دەڵێت: ئەی کەعبی کوڕی موڕڕە، فەرموودەی پێغەمبەری خوامان ﷺ بۆ باس بکە، بەڵام ئاگاداری خۆت بە (هەڵەی تێدا نەکەیت)، ئەویش گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «هەر کەسێک مووی گەنجایەتی سپی کرد لە سایەی ئیسلامدا، ئەمە بۆی دەبێتە ڕووناکی لە ڕۆژی دواییدا».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي ثَوَابِ الشُّهَدَاءِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاداشتی شەهیدان

٣٦٠. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «القَتْلُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يُكَفِّرُ كُلَّ خَطِيئَةٍ»، فَقَالَ جِبْرِيلُ: إِلَّا الدَّيْنَ ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِلَّا الدَّيْنَ».

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کوژران لەپێناوی خوا دەبێتە کەفارەتی هەموو گوناهێک»، جیبریل فەرمووی: تەنیا قەرز نەبێت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «تەنیا قەرز نەبێت».

٣٦١. عَنْ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَرْوَاحَ الشُّهَدَاءِ فِي طَيْرٍ خُضْرٍ تَعْلُقُ مِنْ ثَمَرِ الجَنَّةِ أَوْ شَجَرِ الجَنَّةِ».

کەعبی کوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی ڕووحی شەهیدان لەنێو باڵندەیەکی سەوزن لەسەر بەروبوومی بەهەشت یان داری بەهەشت دەنیشێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يُقَاتِلُ رِيَاءً وَلِلدُّنْيَا

### باسی ئەوەی هاتووە کەسێک بجەنگێت بۆ ڕیابازی و دونیا

٣٦٢. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنِ الرَّجُلِ يُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً، فَأَيُّ ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ قَالَ: «مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ».

ئەبو مووسا ﵁ دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە کەسێک جەنگ دەکات لەپێناو نیشاندانی ئازایەتی، جەنگ دەکات لەپێناو دەمارگیری، جەنگ دەکات لەپێناو خۆدەرخستن، کام لەمانە لەپێناو خوا هەژمار دەکرێت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «هەر کەسێک بجەنگێت تا وشەی خوا زاڵ و بەرز بێت، ئا ئەوە لەپێناوی خوایە».



٣٦٣. عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَّةِ، وَإِنَّمَا لِامْرِئٍ مَا نَوَى، فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَإِلَى رَسُولِهِ، فَهِجْرَتُهُ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِهِ، وَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا، أَوْ امْرَأَةٍ يَتَزَوَّجُهَا، فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ».

عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دروستیی کارەکانی بەندایەتی بەستراوەتەوە بە نیاز و مەبەستەوە، بەڕاستی هەر مرۆڤێک هەر ئەوەی بۆ دەبێت کە نیاز و مەبەستی بووە، هەر کەسێک کۆچەکەی بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی بێت، ئەوە کۆچەکەی بۆ لای خوا و پێغەمبەرە، هەر کەسێکیش

کۆچەکەی بۆ دەستکەوتێکی دونیا بێت تا بەدەستی بێنێت، یان بۆ ئافرەتێک بێت تا هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات، ئەوە کۆچەکەی بۆ ئەو شتەیە کە لەپێناویدا کۆچی کردووە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێک بریندار بکرێت لەپێناو خوا

٣٦٤. **عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُكْلَمُ أَحَدٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَنْ يُكْلَمُ فِي سَبِيلِهِ، إِلَّا جَاءَ يَوْمَ القِيَامَةِ اللَّوْنُ لَوْنُ الدَّمِ، وَالرِّيحُ رِيحُ المِسْكِ».**

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بریندار بکرێت لەپێناو خوا، بێگومان خوا زاناترە بەوەی کێ لەپێناو ئەودا بریندار کراوە، بەدڵنیاییەوە لە ڕۆژی دوایی دێت ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە، بۆنەکەی بۆنی میسکە».

٣٦٥. **عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَاتَلَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ مِنْ رَجُلٍ مُسْلِمٍ فُوَاقَ نَاقَةٍ وَجَبَتْ لَهُ الجَنَّةُ، وَمَنْ جُرِحَ جُرْحًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أَوْ نُكِبَ نَكْبَةً، فَإِنَّهَا تَجِيءُ يَوْمَ القِيَامَةِ كَأَغْزَرِ مَا كَانَتْ لَوْنُهَا الزَّعْفَرَانُ وَرِيحُهَا كَالمِسْكِ».**

موعازی کوڕی جەبەل ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە موسوڵمانان ئەگەر بەئەندازەی ماوەی گوشینی گوانی وشترێک (با ماوەیەکی کەمیش بێت) بجەنگێت لەپێناو خوا، ئەوە بەهەشتی بۆ مسۆگەر دەبێت، هەر کەسێک دووچاری برینێک یان دووچاری ڕووداوێک هات لەپێناو خوا، ئەو کەسە لە ڕۆژی دوایی دێت (برینەکەی) خوێنی لێ دەچۆڕێت بەبەهێزی، ڕەنگەکەی وەکوو زەعفەرانە، بۆنەکەی وەکوو میسکە».

## بَابُ مَا جَاءَ أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟

## باسی ئەوەی هاتووە ئایا باشترین کار کامەیە؟

٣٦٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ، أَوْ أَيُّ الأَعْمَالِ خَيْرٌ؟ قَالَ: «إِيمَانٌ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ»، قِيلَ: ثُمَّ أَيُّ شَيْءٍ؟ قَالَ: «الجِهَادُ سَنَامُ العَمَلِ»، قِيلَ: ثُمَّ أَيُّ شَيْءٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «ثُمَّ حَجٌّ مَبْرُورٌ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ باشترین کار کامەیە؟ یاخود خێرترین کار کامەیە؟ فەرمووی: «بڕواهێنان بە خوا و پێغەمبەرەکەی»، گوترا: پاشان چی دیکە؟ فەرمووی: «جیهادکردن لوتکەی بەرزی کارەکانە»، گوترا: پاشان چ شتێکی دیکە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: «ئینجا حەجێکی وەرگیراو».



## بَابُ مَا جَاءَ أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی باشترینی خەڵك کێیە؟

٣٦٧. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَيُّ النَّاسِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «رَجُلٌ يُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»، قَالُوا: ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ: «ثُمَّ مُؤْمِنٌ فِي شِعْبٍ مِنَ الشِّعَابِ يَتَّقِي رَبَّهُ وَيَدَعُ النَّاسَ مِنْ شَرِّهِ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا چاکترین کەس کێیە؟ فەرمووی: «کەسێکە لەپێناوی خوا جیهاد دەکات»، گوتیان: لەپاش ئەو؟ فەرمووی: «پاشان بڕوادارێکە لە شیوێک لە شیوەکاندا پەروەردگاری بپەرستێت، خۆی بەدوور بگرێت لە خراپەکردن لەگەڵ خەڵکی».

## بَابٌ فِي ثَوَابِ الشَّهِيدِ

### باسێک دەربارەی پاداشتی شەهید

٣٦٨. عَنْ أَنَسِ بْن مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ أَحَدٍ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ يَسُرُّهُ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا غَيْرُ الشَّهِيدِ، فَإِنَّهُ يُحِبُّ أَنْ يَرْجِعَ إِلَى الدُّنْيَا، يَقُولُ: حَتَّى أُقْتَلَ عَشْرَ مَرَّاتٍ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، مِمَّا يَرَى مِمَّا أَعْطَاهُ اللَّهُ مِنَ الْكَرَامَةِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هیچ کەسێک نییە لە خەڵکی بەهەشت پێیخۆش بێت بگەڕێتەوە بۆ ژیانی دونیا جگە لە شەهید، بەڕاستی ئەو حەز دەکات بگەڕێتەوە دونیا، (شەهیدەکە) دەڵێت: تا دە جاری دیکە بکوژرێمەوە لەپێناو خوا، ئەمەش بەهۆی بینینی ئەو ڕێزەی کە خوا پێی داوە (لە بەهەشت)».





# أَبْوَابُ الْجِهَادِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## كۆباسی جیهادکردن له پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ خَرَجَ فِي الغَزْوِ وَتَرَكَ أَبَوَيْهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی چووە بۆ جەنگ و دایک و باوکی جێ هێشتووە



٣٦٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَسْتَأْذِنُهُ فِي الجِهَادِ، فَقَالَ: «أَلَكَ وَالِدَانِ؟»، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَفِيهِمَا فَجَاهِدْ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر رضي الله عنهما دەڵێت: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و داوای ڕێپێدانی لێ کرد بێت بۆ جیهاد، پێی فەرموو: «ئایا دایک و باوکت هەیە؟»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «دە بۆ بەرژەوەندیی ئەوان جیهاد بکە (لەبری جیهاد خزمەتی ئەوان بکە)».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ أَنْ يُسَافِرَ الرَّجُلُ وَحْدَهُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی گەشتکردنی کەسێک بەتەنیا

٣٧٠. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْ أَنَّ النَّاسَ يَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ مِنَ

الْوِحْدَةِ مَا سَارَ رَاكِبٌ بِلَيْلٍ»، يَعْنِي: وَحْدَهُ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر خەڵک بزانێت ئەمەی من دەیزانم لە (مەترسییەکانی) دەرچوون بەتەنیایی، ئەوکات هیچ سوارێک بە شەو دەرنەدەچوو (بەتەنیا)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ فِي الكَذِبِ وَالخَدِيعَةِ فِي الحَرْبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێگەدان بە درۆ و فێڵ لە جەنگدا

٣٧١. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الحَرْبُ خُدْعَةٌ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جەنگ بریتییە لە فێڵ و پیلانی جەنگی».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي غَزَوَاتِ النَّبِيِّ ﷺ، وَكَمْ غَزَا؟

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی جەنگەکانی پێغەمبەر ﷺ، ژمارەشیان چەند بووە؟

٣٧٢. عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: كُنْتُ إِلَى جَنْبِ زَيْدِ بْنِ أَرْقَمَ ﵁ فَقِيلَ لَهُ: كَمْ غَزَا النَّبِيُّ ﷺ مِنْ غَزْوَةٍ؟ قَالَ: تِسْعَ عَشْرَةَ، فَقُلْتُ: كَمْ غَزَوْتَ أَنْتَ مَعَهُ؟ قَالَ: سَبْعَ عَشْرَةَ، قُلْتُ: أَيَّتُهُنَّ كَانَ أَوَّلَ؟ قَالَ: ذَاتُ العُشَيْرِ، أَوِ العُشَيْرَةِ.

ئەبو ئیسحاق دەڵێت: جارێکیان لە تەنیشت زەیدی کوڕی ئەرقەم ﵁ بووم، پرسیاری لێ کرا: پێغەمبەری خوا ﷺ چەند غەزای کردووە؟ گوتی: نۆزدە، گوتم: لە چەند غەزا تۆ لەگەڵیدا بوویت؟ گوتی: لە حەڤدە غەزا، گوتم: یەکەم دانە کامەیان بوو؟ گوتی: زات عوشەیر یان عوشەیرە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الدُّعَاءِ عِنْدَ القِتَالِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دوعاکردن لە کاتی جەنگ

٣٧٣. عَنِ ابْنِ أَبِي أَوْفَى ﵁ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَقُولُ يَعْنِي النَّبِيَّ ﷺ يَدْعُو عَلَى الأَحْزَابِ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الكِتَابِ، سَرِيعَ الحِسَابِ، اهْزِمِ الأَحْزَابَ، اللَّهُمَّ اهْزِمْهُمْ، وَزَلْزِلْهُمْ».

ئیبن ئەبو ئەوفا ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوو، دوعای دەکرد لە کۆمەڵەکان (ی جەنگی ئەحزاب)، دەیفەرموو: خوایە ئەی دابەزێنەری قورئان، (ئەی ئەو زاتەی) لێپرسینەوەت خێرایە، (ئەی) تێکشکێنەری چین و کۆمەڵەکان، خوایە تێکیان بشکێنە و لەرز و ترس بخە نێویانەوە.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الفِطْرِ عِنْدَ القِتَالِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆژووشکاندن لە کاتی جەنگ

٣٧٤. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: لَمَّا بَلَغَ النَّبِيُّ ﷺ عَامَ الفَتْحِ مَرَّ الظَّهْرَانِ، فَآذَنَنَا بِلِقَاءِ العَدُوِّ فَأَمَرَنَا بِالفِطْرِ، فَأَفْطَرْنَا أَجْمَعُونَ.

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێت: کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە ساڵی ئازادکردنی مەککەی پیرۆز گەیشتە مەڕە زەهڕان، ئاگاداری کردینەوە بە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن، جا فەرمانی پێ کردین ڕۆژوو بشکێنین، ئێمەش هەمووومان ڕۆژوومان شکاند.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الخُرُوجِ عِنْدَ الفَزَعِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەرچوون لە کاتی بوونی ترس

٣٧٥. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ مِنْ أَجْرَأِ النَّاسِ، وَأَجْوَدِ النَّاسِ، وَأَشْجَعِ النَّاسِ، قَالَ: وَقَدْ فَزِعَ أَهْلُ المَدِينَةِ لَيْلَةً سَمِعُوا صَوْتًا، قَالَ: فَتَلَقَّاهُمُ النَّبِيُّ ﷺ عَلَى فَرَسٍ لِأَبِي طَلْحَةَ عُرْيٍ، وَهُوَ مُتَقَلِّدٌ سَيْفَهُ، فَقَالَ: «لَمْ تُرَاعُوا، لَمْ تُرَاعُوا»، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَجَدْتُهُ بَحْرًا».

ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە هەموو کەس بوێرتر بوو، لە هەموو کەسیش بەخشەرتر بوو، ئازاترین کەسیش بوو، (ئەنەس) ﵁ (ڕاوی دەڵێت بەردەوام) ئەنەس گوتی: شەوێکیان خەڵکی مەدینە کەوتنە ترسەوە بەهۆی بیستنی دەنگێکی (ترسناکەوە)، خەڵک بەدواداچوونیان کرد، بینییان پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر پشتی ئەسپی ئەبو تەلحەیە بەبێ کورتان، شمشێرەکەی لەخۆ بەستبوو، فەرمووی: «مەترسن، مەترسن»، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەوەی بینیم (ئەسپەکە) وەکوو دەریا وا بوو (لە ڕاکردنی بەخێرایی و بەبێ وەستان)».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الِاسْتِفْتَاحِ بِصَعَالِيكِ المُسْلِمِينَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی داواکردن بە چینی هەژاری موسوڵمانان

٣٧٦. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «ابْغُونِي ضُعَفَاءَكُمْ، فَإِنَّمَا تُرْزَقُونَ وَتُنْصَرُونَ بِضُعَفَائِكُمْ».

ئەبو دەرداء ﵁ دەڵێت: گوێبیستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم دەیفەرموو: «کەسە بێناز و بێهێزەکانتانم بۆ دیاری بکەن، چونکە بەڕاستی پێدانی ڕزق و ڕۆزی و سەرکەوتنتان بەهۆی ئەوانەوەیە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِمَامِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێشەوا

٣٧٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَلَا كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، فَالأَمِيرُ الَّذِي عَلَى النَّاسِ رَاعٍ، وَمَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَالمَرْأَةُ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ بَعْلِهَا، وَهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُ، وَالعَبْدُ رَاعٍ عَلَى مَالِ سَيِّدِهِ، وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُ، أَلَا فَكُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ».

ئیبن عومەر ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ئاگادار بن هەمووتان سەرپەرشتیارن، هەمووتان بەرپرسیارن لە خەڵکی ژێر دەستتان، ئەو فەرماندەیەی سەرپەرشتیاری خەڵکە، بەرپرسە لەو خەڵکەی لەژێر فەرمانیەتی، پیاوێک سەرپەرشتیارە لەسەر خانەوادەکەی، بەرپرسە بەرامبەریان، ئافرەت سەرپەرشتیارە لەسەر ماڵی مێردەکەی، ئەو لێی بەرپرسیارە، خزمەتکار سەرپەرشتیارە لەسەر ماڵی خاوەنەکەی، ئەو لێی بەرپرسیارە، ئاگادار بن هەمووتان سەرپەرشتیارن، هەمووشتان بەرپرسن لەوەی لە ژێر دەستتاندایە».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي طَاعَةِ الإِمَامِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی فەرمانبەرداری بۆ پێشەوا

٣٧٨. عَنْ أُمِّ الحُصَيْنِ الأَحْمَسِيَّةِ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَخْطُبُ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ، وَعَلَيْهِ بُرْدٌ قَدِ التَفَعَ بِهِ مِنْ تَحْتِ إِبْطِهِ، قَالَتْ: فَأَنَا أَنْظُرُ إِلَى عَضَلَةِ عَضُدِهِ تَرْتَجُّ، سَمِعْتُهُ يَقُولُ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا اللَّهَ، وَإِنْ أُمِّرَ عَلَيْكُمْ عَبْدٌ حَبَشِيٌّ مُجَدَّعٌ فَاسْمَعُوا لَهُ، وَأَطِيعُوا مَا أَقَامَ لَكُمْ كِتَابَ اللَّهِ».

ئوم حوصەینی ئەحمەسیە ﵂ دەڵێت: گوێبیستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم وتاری دەدا لە حەجیماڵئاوایی، عەبایەکی لەژێر شانیەوە لە خۆی پێچابوو، گوتی: کە من سەیرم دەکرد لاشەی دەهەژایەوە، گوێبیستی بووم دەیفەرموو: «ئەی خەڵکینە پارێزکار بن بەرانبەر (سنوورەکانی) خوا، ئەگەر بەندەیەکی حەبەشی گوێبڕاو و لووتبڕاو کرا بە فەرمانڕەواتان، گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریی بکەن، مادام بەپێی کتێبی خوا فەرمانڕەواییتان بەسەردا دەکات».

## بَابُ مَا جَاءَ لَا طَاعَةَ لِمَخْلُوقٍ فِي مَعْصِيَةِ الخَالِقِ

### باسی ئەوەی هاتووە فەرمانبەرداری نییە بۆ کەس لە سەرپێچی خوادا

٣٧٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «السَّمْعُ وَالطَّاعَةُ عَلَى المَرْءِ المُسْلِمِ فِيمَا أَحَبَّ وَكَرِهَ مَا لَمْ يُؤْمَرْ بِمَعْصِيَةٍ، فَإِنْ أُمِرَ بِمَعْصِيَةٍ فَلَا سَمْعَ عَلَيْهِ وَلَا طَاعَةَ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری لەسەر کەسی موسوڵمان پێویستە لەوەی پێیخۆشە و لەوەش کە پێیخۆش نییە، جگە لەوەی فەرمانی پێ بکرێت بە سەرپێچیی خوا، جا ئەگەر فەرمانی بە سەرپێچیی خوا پێ کرا، ئەوە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری دروست نییە و نامێنێت».

# أَبْوَابُ اللِّبَاسِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی پۆشاك له پێغەمبەری خواوه ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَرِيرِ وَالذَّهَبِ

### باسی ئەوەی هاتووه دەربارەی پۆشاکی ئاوریشم و زێڕ

٣٨٠. عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «حُرِّمَ لِبَاسُ الحَرِيرِ وَالذَّهَبِ عَلَى ذُكُورِ أُمَّتِي وَأُحِلَّ لِإِنَاثِهِمْ».

ئەبو مووسای ئەشعەری رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پۆشاکی ئاوریشم و زێڕ بۆ پیاوانی ئوممەتم قەدەغە کراوه و بۆ ئافرەتانی حەڵاڵ کراوه».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي لُبْسِ الصُّوفِ

### باسی ئەوەی هاتووه دەربارەی پۆشاکی خوری

٣٨١. عَنْ أَبِي بُرْدَةَ رضي الله عنه قَالَ: أَخْرَجَتْ إِلَيْنَا عَائِشَةُ رضي الله عنها كِسَاءً مُلَبَّدًا، وَإِزَارًا غَلِيظًا، فَقَالَتْ: قُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي هَذَيْنِ.

ئەبو بوڕده رضي الله عنه دەڵێت: عائیشه رضي الله عنها کراسێکی پینەکراو و ئیزارێکی ئەستوور و زبری

پیشان داین، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێک گیانی پاکی لێ وەرگیرایەوە لەنێو ئەو دوو پۆشاکە بووە.

## بَابٌ فِي سَدْلِ العِمَامَةِ بَيْنَ الكَتِفَيْنِ

### باسێک دەربارەی بەردانەوەی مێزەر لە نێوان شانەکان

٣٨٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا اعْتَمَّ سَدَلَ عِمَامَتَهُ بَيْنَ كَتِفَيْهِ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر مێزەری پێچابایەوە لەسەری، ئەوە لایەکی دەهێنایە خوارەوە لە نێوان شانەکانی.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي المُصَوِّرِينَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وێنەکێشەکان

٣٨٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَوَّرَ صُورَةً عَذَّبَهُ اللَّهُ حَتَّى يَنْفُخَ فِيهَا - يَعْنِي الرُّوحَ - وَلَيْسَ بِنَافِخٍ فِيهَا، وَمَنْ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ وَهُمْ يَفِرُّونَ مِنْهُ صُبَّ فِي أُذُنِهِ الْآنُكُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک وێنەیەک بکێشێت، خوا بەهۆیەوە ئازاری دەدات هەتا فووی تێدەکات و گیانی دێنێتە بەر، کە ناشتوانێت گیانی بێنێتە بەر، هەر کەسێک گوێ بگرێت لە گفتوگۆی خەڵکێک، لە کاتێک ئەوان لە بیستنی ئەو ڕادەکەن (نایانەوێت گوێبیستیان بێت)، قوڕقوشمی تواوە دەڕژێنرێتە نێو گوێچکەکانی لە ڕۆژی دوایی».

تێبینی:

مەبەست لە وێنەکێشان وەك زانایان باسیان کردوە، بریتییە لە دروستکردنی پەیکەر

و بەگەورە و پیرۆزدانانی وەك پەرستراو، نەك ئەو وێنەیەی بە وێنەگر دەگیرێت و لەنێو خەڵكدا باوە، كاتی خۆی هاوبەشدانەران وێنەی پەیكەریان دەكێشا و دەیانپەرست، نەسرانییەكانیش ئێستاشی لەگەڵدا بێت وێنەی پێغەمبەر عیسا ﷺ و دایكی دەكێشن بە جۆرەها شێوە، هەم وەك پەیكەر و هەم وەك وێنە دەیپەرستن.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الخِضَابِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەنگكردنی مووی سپی

٣٨٤. عنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «غَيِّرُوا الشَّيْبَ وَلَا تَشَبَّهُوا بِاليَهُودِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕەنگی مووی سپی بگۆڕن، خۆتان بە جوولەكەكان مەچوێنن».

٣٨٥. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَحْسَنَ مَا غُيِّرَ بِهِ الشَّيْبُ الحِنَّاءُ وَالكَتَمُ».

ئەبو زەڕ ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «بەڕاستی چاكترین شت كە ڕەنگی مووی سپی پێ بگۆڕن، خەنە و گەڵای كەتمە».

## بَابُ مَا يَقُولُ إِذَا لَبِسَ ثَوْبًا جَدِيدًا

### باسی ئەوەی دەگوترێت ئەگەر بەرگێكی نوێ بپۆشێت

٣٨٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا اسْتَجَدَّ ثَوْبًا سَمَّاهُ بِاسْمِهِ، عِمَامَةً، أَوْ قَمِيصًا، أَوْ رِدَاءً، ثُمَّ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ، أَسْأَلُكَ

خَيْرَهُ وَخَيْرَ مَا صُنِعَ لَهُ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ».

ئەبو سەعید ﷺ دەڵێت: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ بەرگێکی نوێی پیرۆز کردبا لە کاتی دوعاکردنی ناوەکەی دەهێنا، مێزەر بووایە، یان کراس یان پۆشاکی خوارەوە، ئینجا دەیفەرموو: «ئەی خوایە سوپاس بۆ تۆ، تۆی پۆشتەت کردووم، داوات لێ دەکەم لە خێر و بێرەکەی و ئەو سوودەی بۆی دروست کراوە، پەنات پێ دەگرم لە خراپەکەی و ئەو خراپەیەی بۆی دروست کراوە».



# أبْوَابُ الأَطْعِمَةِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی خواردنەکان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ



### بَابُ مَا جَاءَ فِي أَكْلِ لُحُومِ الخَيْلِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خواردنی گۆشتی ئەسپ

٣٨٧. عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: أَطْعَمَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لُحُومَ الخَيْلِ، وَنَهَانَا عَنْ لُحُومِ الحُمُرِ.

جابیر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی گۆشتی ئەسپی پێ داوین، قەدەغەشی کردین لە خواردنی گۆشتی گوێدرێژ.

### بَابُ مَا جَاءَ فِي الأَكْلِ فِي آنِيَةِ الكُفَّارِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خواردن لە قاپی بێبڕوایاندا

٣٨٨. عَنْ أَبِي ثَعْلَبَةَ الخُشَنِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا بِأَرْضِ أَهْلِ الكِتَابِ، فَنَطْبُخُ فِي قُدُورِهِمْ، وَنَشْرَبُ فِي آنِيَتِهِمْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنْ لَمْ تَجِدُوا

غَيْرَهَا فَارْحَضُوهَا بِالمَاءِ».

ئەبو سەعلەبەی خوشەنی ﷺ دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە لە وڵاتی ئەهلی کتێبین (خاوەن کتێبی ئاسمانی)، لە مەنجەڵەکانیان خواردن دەکوڵێنین، لەنێو قاپەکانیان دەخۆینەوە (ئایا ئەو کارە ڕێگەپێدراوە؟)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەگەر جگە لەوەتان دەست نەکەوت، بە ئاو پاکی بکەنەوە (ئینجا بەکاری بهێنن)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّهْيِ عَنِ الأَكْلِ وَالشُّرْبِ بِالشِّمَالِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قەدەغەکردن لە خواردن و خواردنەوە بە دەستی چەپ

٣٨٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَا يَأْكُلْ أَحَدُكُمْ بِشِمَالِهِ، وَلَا يَشْرَبْ بِشِمَالِهِ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ يَأْكُلُ بِشِمَالِهِ، وَيَشْرَبُ بِشِمَالِهِ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «با هیچ کەس لە ئێوە بە دەستی چەپی نەخوات، بە دەستی چەپی نەخواتەوە، چونکە شەیتان بە دەستی چەپی دەخوات، بە دەستی چەپیشی دەخواتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي اللُّقْمَةِ تَسْقُطُ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پارووێک (لە دەست) بەربێتەوە

٣٩٠. عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ طَعَامًا فَسَقَطَتْ لُقْمَتُهُ فَلْيُمِطْ مَا رَابَهُ مِنْهَا، ثُمَّ لْيَطْعَمْهَا وَلَا يَدَعْهَا لِلشَّيْطَانِ».

جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان خواردنێکی خوارد و پارووێکی لە دەست کەوت، با ئەو بەشەی گومانی پیسبوونی لێی هەیە، لای بدات و ئەوەی دیکە بخوات، با بۆ شەیتانی بەجێ نەهێڵێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَخْمِيرِ الإِنَاءِ وَإِطْفَاءِ السِّرَاجِ وَالنَّارِ عِنْدَ المَنَامِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی داپۆشینی قاپ و قاچاغ و کوژاندنەوەی چراو ئاگر لە کاتی نوستن

٣٩١. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَغْلِقُوا البَابَ، وَأَوْكِئُوا السِّقَاءَ، وَأَكْفِئُوا الإِنَاءَ، أَوْ خَمِّرُوا الإِنَاءَ، وَأَطْفِئُوا المِصْبَاحَ، فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَفْتَحُ غَلَقًا، وَلَا يَحِلُّ وِكَاءً، وَلَا يَكْشِفُ آنِيَةً، وَإِنَّ الفُوَيْسِقَةَ تُضْرِمُ عَلَى النَّاسِ بَيْتَهُمْ».

جابیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «دەرگاکان دابخەن (لە شەودا)، سەری کوندەی ئاو بگرن، قاپ و قاچاغی خواردن داپۆشن، ئاگرەکان بکوژێننەوە، چونکە شەیتان ناتوانێت دەرگای داخراو بکاتەوە، ناتوانێت سەری کوندەی ئاو بکاتەوە، ناتوانێت سەری قاپ و قاچاغی خواردن لابدات، گیانلەبەرە زیانبەخشەکە (مشک) بەهۆی ئاگری چراکان ئاگر لە ماڵی خەڵک بەردەدات».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَمْدِ عَلَى الطَّعَامِ إِذَا فُرِغَ مِنْهُ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سوپاسگوزاری خوا لەسەر خواردن دوای ئەوەی تەواو بوو

٣٩٢. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ لَيَرْضَى عَنِ العَبْدِ أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ، أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ، فَيَحْمَدَهُ عَلَيْهَا».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی خوای گەورە ڕازی دەبێت لەو بەندەیەی کە خواردنێک دەخوات، یان خواردنەوەیەک دەخواتەوە و ستاییشی خوای لەسەر دەکات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي طَعَامِ الوَاحِدِ يَكْفِي الِاثْنَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خواردنی کەسێک بەشی دوو کەس دەکات

٣٩٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «طَعَامُ الِاثْنَيْنِ كَافِي الثَّلَاثَةِ، وَطَعَامُ الثَّلَاثَةِ كَافِي الأَرْبَعَةِ».

ئەبو هورەیرە رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خواردنی دوو کەس بەشی سێ کەس دەکات، خواردنی سێ کەس بەشی چوار کەس دەکات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَكْلِ لُحُومِ الجَلَّالَةِ وَأَلْبَانِهَا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خواردنی گۆشت و شیری ئەو ئاژەڵانەی خۆراکیان شتی پیسە

٣٩٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ أَكْلِ الجَلَّالَةِ وَأَلْبَانِهَا.

ئیبن عومەر رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە خواردنی گۆشت و شیری ئەو ئاژەڵانەی خۆراکیان شتی پیسە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي حُبِّ النَّبِيِّ ﷺ الحَلْوَاءَ وَالعَسَلَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێخۆشبوونی پێغەمبەر ﷺ بۆ شیرینی و هەنگوین

٣٩٥. عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحِبُّ الحَلْوَاءَ وَالعَسَلَ.

عائیشە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ حەزی لە شیرینی و هەنگوین بوو.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الثَّرِيدِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تایبەتمەندیی تێگوشیو

٣٩٦. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «كَمُلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِيرٌ، وَلَمْ يَكْمُلْ مِنَ النِّسَاءِ إِلَّا مَرْيَمُ ابْنَةُ عِمْرَانَ، وَآسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ، وَفَضْلُ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ».

ئەبو مووسا ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «زۆر لە پیاوان کامڵ و تەواو بوون، بەڵام لە ئافرەتان تەنها مەریەمی کچی عیمڕان و ئاسیەی خێزانی فیرعەون کامڵ و تەواو بوون، بێگومان فەزڵ و گەورەیی عائیشە بەسەر ئافرەتاندا وەکوو فەزڵ و گەورەیی تێگوشیوی گۆشتاو وایە بەسەر تەواوی خواردنەکاندا (ئەوەش لەبەر ئەوەی کە تێگوشیوی گۆشتاو لە خواردنە هەرەخۆش و بەتامەکان بووە لەلای پێغەمبەر ﷺ)».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَكْلِ الزَّيْتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خواردنی زەیت

٣٩٧. عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُوا الزَّيْتَ وَادَّهِنُوا بِهِ فَإِنَّهُ مِنْ شَجَرَةٍ مُبَارَكَةٍ».

عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە ڕۆنی (زەیتوون) بخۆن، خۆتانی پێ چەور بکەن، چونکە بەری دارێکی پیرۆزە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ إِطْعَامِ الطَّعَامِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی خواردن بەخشین

٣٩٨. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اعْبُدُوا الرَّحْمَنَ، وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ، وَأَفْشُوا السَّلَامَ، تَدْخُلُوا الجَنَّةَ بِسَلَامٍ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوای بەبەزەیی بپەرستن، خواردن ببەخشن، سڵاو بڵاو بکەنەوە، دەچنە بەهەشت بەسەلامەتی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْمِيَةِ عَلَى الطَّعَامِ



### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی (بسم الله) کردن لە پێش خواردن

٣٩٩. عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ رضي الله عنه: أَنَّهُ دَخَلَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَعِنْدَهُ طَعَامٌ قَالَ: «ادْنُ يَا بُنَيَّ، وَسَمِّ اللَّهَ وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ».

عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: کە چووە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ خواردنی لەلا بووە، فەرموویەتی: «نزیک بکەوە ئەی کوڕەکەم، ناوی خوای لێ بێنە و بە دەستی ڕاستت بخۆ، لەپێش خۆتەوە بخۆ».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ البَيْتُوتَةِ وَفِي يَدِهِ رِيحُ غَمَرٍ

### باسی ئەوەی هاتووە کە ناپەسندە بخەوێت و دەستیشت بۆنی خواردنی لێ بێت

٤٠٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ بَاتَ وَفِي يَدِهِ رِيحُ غَمَرٍ

فَأَصَابَهُ شَيْءٌ فَلَا يَلُومَنَّ إِلَّا نَفْسَهُ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بخەوێت و دەستی بۆنی (خواردنی) لێ بێت، ئەگەر تووشی هەر شتێک هات، با لۆمەی کەس نەکات جگە لە خۆی».

تێبینی:

یەکێک لە مەبەستەکانی ئەو فەرموودەیە ئەوەیە، بۆن و بەرامی خواردن هۆکارێکە بۆ پەلکێشکردنی زیندەوەری زیانبەخش بۆ لای خۆت و زیان بەرکەوتنت.



# أَبْوَابُ الْأَشْرِبَةِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی خواردنەوەکان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي شَارِبِ الخَمْرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی مەیخۆر

٤٠١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، وَمَنْ شَرِبَ الخَمْرَ فِي الدُّنْيَا فَمَاتَ وَهُوَ يُدْمِنُهَا لَمْ يَشْرَبْهَا فِي الآخِرَةِ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەموو سەرخۆشکەرێک مەییە، هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەکراوە، هەر کەسێک لە دونیا بیخواتەوە و تا دەمرێت لەسەری بەردەوام بێت، لە بەهەشت نایخواتەوە».

### بَابُ مَا جَاءَ كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ

### باسی ئەوەی هاتووە هەموو سەرخۆشکەرێک قەدەغەکراوە

٤٠٢. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنِ البِتْعِ فَقَالَ: «كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر جۆرە خواردنەوەیەک (مرۆڤ) سەرخۆش بکات، ئەوە قەدەغەکراوە».

## بَابُ مَا جَاءَ مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ، فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هەر شتێک زۆرەکەی سەرخۆشکەر بێت، کەمەکەشی حەرامە

٤٠٣. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەوەی زۆر خواردنەوەی مرۆڤ سەرخۆش بکات، کەمەکەشی هەر حەرامە».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الرُّخْصَةِ أَنْ يُنْبَذَ فِي الظُّرُوفِ

### باسی ئەوەی هاتووە لە خۆشکردنی ئاو لەنێو کەرەستەی دروستکردن و هەڵگرتنی مەی

٤٠٤. عَنْ سُلَيْمَانَ بْنِ بُرَيْدَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي كُنْتُ نَهَيْتُكُمْ عَنِ الظُّرُوفِ، وَإِنَّ ظَرْفًا لَا يُحِلُّ شَيْئًا وَلَا يُحَرِّمُهُ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ».

سولەیمانی کوڕی بوڕەیدە لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «من ڕێگریم کردبوون لە بەکارهێنانی کەلوپەلی دروستکردن و هەڵگرتنی مەی، ئەم کەلوپەلانە حەڵاڵ و حەرام ناکەن، (بەڵام بزانن) هەموو سەرخۆشکەرێک حەرامە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحُبُوبِ الَّتِي يُتَّخَذُ مِنْهَا الخَمْرُ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو دانەوێڵانەی مەییان لێ دروست دەکرێت

٤٠٥. عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنَ الحِنْطَةِ خَمْرًا، وَمِنَ الشَّعِيرِ خَمْرًا، وَمِنَ التَّمْرِ خَمْرًا، وَمِنَ الزَّبِيبِ خَمْرًا، وَمِنَ العَسَلِ خَمْرًا».

نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی لە گەنم مەی دروست دەکرێت، لە جۆ مەی دروست دەکرێت، لە خورما مەی دروست دەکرێت، لە مێوژ مەی دروست دەکرێت، لە هەنگوین مەی دروست دەکرێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّنَفُّسِ فِي الإِنَاءِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هەناسەدان لەنێو قاپدا



٤٠٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَتَنَفَّسُ فِي الإِنَاءِ ثَلَاثًا وَيَقُولُ: «هُوَ أَمْرَأُ وَأَرْوَى».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ قاپێک ئاوی بە سێ هەناسە دەخواردەوە، دەیفەرموو: ئاوا کاراترە، تێنووشکێنترە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ النَّفْخِ فِي الشَّرَابِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی فووکردن لە خواردنەوە

٤٠٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى أَنْ يُتَنَفَّسَ فِي الإِنَاءِ أَوْ يُنْفَخَ فِيهِ.

ئیبن عەبباس ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ڕێگریی کردووە کە هەناسە بکرێتە نێو

قاپی ئاوەوە یاخود فووی تێدا بکرێت.

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الْأَيْمَنِينَ أَحَقُّ بِالشُّرْبِ

### باسی ئەوەی هاتووە کە لای ڕاست شایستەترە بە خواردنەوە لەپێشدا

٤٠٨. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِلَبَنٍ قَدْ شِيبَ بِمَاءٍ وَعَنْ يَمِينِهِ أَعْرَابِيٌّ وَعَنْ يَسَارِهِ أَبُو بَكْرٍ فَشَرِبَ ثُمَّ أَعْطَى الأَعْرَابِيَّ وَقَالَ: «الأَيْمَنَ فَالأَيْمَنَ».

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: شیر هێنرا بۆ پێغەمبەر ﷺ کە ئاوی لەگەڵ تێکەڵ کرابوو، لای ڕاستی پێغەمبەر ﷺ دەشتەکییەک بوو، لای چەپیشی ئەبو بەکر بوو، (پێغەمبەر ﷺ) لە شیرەکەی خواردەوە، پاشان دایە دەشتەکییەکە و فەرمووی: لە ڕاستەوە بۆ ڕاست (واتە: لەلای ڕاستەوە دەستی پێ کرد).



## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ سَاقِيَ الْقَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْبًا

### باسی ئەوەی هاتووە کە ئەوەی ئاو دەدات بە خەڵکانێك کۆتا کەس خۆی دەیخواتەوە

٤٠٩. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «سَاقِي القَوْمِ آخِرُهُمْ شُرْبًا».

ئەبو قەتادە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ئاوگێڕ دوایین کەسە ئاوەکە دەخواتەوە».

# أَبْوَابُ البِرِّ وَالصِّلَةِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی چاکەکاری و پەیوەندیی خزمایەتی لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي بِرِّ الوَالِدَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چاکبوون لەگەڵ دایک و باوک



٤١٠. عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الأَعْمَالِ أَفْضَلُ؟ قَالَ: «الصَّلَاةُ لِمِيقَاتِهَا»، قُلْتُ: ثُمَّ مَاذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «بِرُّ الوَالِدَيْنِ»، قُلْتُ: ثُمَّ مَاذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ»، ثُمَّ سَكَتَ عَنِّي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَوْ اسْتَزَدْتُهُ لَزَادَنِي.

ئیبن مەسعوود رضي الله عنه دەڵێت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا باشترین کار کامەیە؟ فەرمووی: «نوێژکردن لە کاتی خۆیدا»، گوتم: پاشان چی دی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: «چاکبوون لەگەڵ دایک و باوک»، گوتم: پاشان چی دی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: «جیهاد لەپێناو خوا»، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو، ئەگەر داوای زیاترم لێی کردبایە زیاتری بۆ باس دەکردم.

## بَابُ مَا جَاءَ مِنَ الفَضْلِ فِي رِضَا الوَالِدَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی ڕەزامەندیی دایک و باوک

٤١١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «رِضَى الرَّبِّ فِي رِضَى الوَالِدِ، وَسَخَطُ الرَّبِّ فِي سَخَطِ الْوَالِدِ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ڕەزامەندی پەروەردگار لە ڕەزامەندی دایك و باوکە، توڕەیی پەروەردگار لە توڕەیی دایك و باوکە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي عُقُوقِ الوَالِدَيْنِ



### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەزیەتدانی دایک و باوک

٤١٢. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا أُحَدِّثُكُمْ بِأَكْبَرِ الكَبَائِرِ؟». قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «الإِشْرَاكُ بِاللَّهِ، وَعُقُوقُ الوَالِدَيْنِ»، قَالَ: وَجَلَسَ وَكَانَ مُتَّكِئًا، فَقَالَ: «وَشَهَادَةُ الزُّورِ، أَوْ قَوْلُ الزُّورِ»، فَمَا زَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقُولُهَا حَتَّى قُلْنَا لَيْتَهُ سَكَتَ.

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرە لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئایا دەربارەی گەورەترین تاوانەکان هەواڵتان پێ بدەم؟»، گوتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: «هاوبەشدانان بۆ خوا، ئەزیەتدانی دایک و باوک، لە کاتێک کە پاڵ کەوتبوو ئینجا هەستایەوە و دانیشت»، فەرمووی: «ئاگادار بن شایەتیدانی ناڕاست و قسەی درۆ، ئیدی بەردەوام بوو لە گوتنەوەی هەتا گوتمان: خۆزگە بێدەنگ دەبوو (هێندە خۆی ئەزیەت نەدەدا)».

٤١٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مِنَ الكَبَائِرِ أَنْ يَشْتُمَ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَهَلْ يَشْتُمُ الرَّجُلُ وَالِدَيْهِ؟ قَالَ: «نَعَمْ، يَسُبُّ أَبَا الرَّجُلِ فَيَشْتُمُ أَبَاهُ وَيَشْتُمُ أُمَّهُ فَيَسُبُّ أُمَّهُ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە تاوانە گەورەکانە کەسێک جوێن بدات بە دایک و باوکی خۆی»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا کاری وا هەیە کەسێک جوێن بدات بە دایک و باوکی؟ فەرمووی: «بەڵێ، ئەو کەسەی جوێن دەدات بە باوکی کەسێک ئەویش جوێن دەداتەوە بە باوکی ئەو، جوێن دەدات بە دایکی کەسێک، ئەویش جوێن دەداتەوە بە دایکی ئەو».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِكْرَامِ صَدِيقِ الوَالِدِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێز گرتن لە دۆستی باوک



٤١٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ أَبَرَّ البِرِّ أَنْ يَصِلَ الرَّجُلُ أَهْلَ وُدِّ أَبِيهِ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «لە ڕاستیدا باشترین چاکەکاری (کە کەسێک بیکات) پەیوەندیی کۆمەڵایەتی و خۆشەویستییە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە خۆشەویست و هاوڕێی باوکی بووە، (ئەو پەیوەندییەش) لەدوای نەمانی باوکەوە (دەست پێ دەکات)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي بِرِّ الخَالَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چاکە لەگەڵ خوشکی دایک

٤١٥. عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الخَالَةُ بِمَنْزِلَةِ الأُمِّ».

بەڕائی كوڕی عازیب ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: «خوشكی دایك لە جێگەی دایكە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي قَطِيعَةِ الرَّحِمِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتی

٤١٦. عَنْ أَبِي سَلَمَةَ قَالَ: اشْتَكَى أَبُو الرَّدَّادِ فَعَادَهُ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ ﷺ فَقَالَ: خَيْرُهُمْ وَأَوْصَلُهُمْ مَا عَلِمْتُ أَبَا مُحَمَّدٍ، فَقَالَ عَبْدُ الرَّحْمَنِ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «قَالَ اللَّهُ: أَنَا اللَّهُ، وَأَنَا الرَّحْمَنُ، خَلَقْتُ الرَّحِمَ وَشَقَقْتُ لَهَا مِنْ اسْمِي، فَمَنْ وَصَلَهَا وَصَلْتُهُ، وَمَنْ قَطَعَهَا بَتَتُّهُ».

ئەبو سەلەمە دەڵێت: ئەبو ریداد نەخۆش كەوت، عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف ﷺ سەردانی كرد، ئەویش گوتی: ئەوەندەی من بزانم چاكترین و پەیوەندی پارێزترین كەس باوكی موحەممەدە (واتە: عەبدوڕڕەحمان)، جا عەبدوڕڕەحمان گوتی: گوێبیستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم دەیفەرموو: «خوا فەرموویەتی: من خوام، من خاوەنی بەزەییم و بەزەییم دروست كردووە، ناوێكم بۆی داتاشیوە لە ناوی خۆم، جا هەر كەسێك پەیوەندیی خزمایەتی بپارێزێت منیش پەیوەندی لەگەڵ دەپارێزم، هەر كەسێك بیپچڕێنێت منیش دەیپچڕێنم».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صِلَةِ الرَّحِمِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پەیوەندیی خزمایەتی

٤١٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَيْسَ الوَاصِلُ بِالْمُكَافِئِ، وَلَكِنَّ الوَاصِلَ الَّذِي إِذَا انْقَطَعَتْ رَحِمُهُ وَصَلَهَا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر رضي الله عنهما لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «گەیاندنی پەیوەندیی خزمایەتی بە بەرانبەر نییە (ئەو هات تۆش بچیت بۆ لای)، بەڵام ئەوەیە ئەگەر کەسێك سەردانی نەکرا، ئەو سەردانی بکات».

٤١٨. عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعٌ».

جوبەیری کوڕی موتعیم رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ناچێتە بەهەشت ئەوەی پەیوەندیی خزمایەتی پچڕاندووە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّفَقَةِ عَلَى البَنَاتِ وَالأَخَوَاتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خەرجیکێشانی کچ و خوشك

٤١٩. عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ دَخَلْتُ أَنَا وَهُوَ الجَنَّةَ كَهَاتَيْنِ»، وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْهِ.

ئەنەس رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک دوو کچۆڵە بەخێو بکات، کاتێك کە دەچمە بەهەشت من و ئەو کەسە بەیەکەوە وەکوو ئەم دوو پەنجەیەین»، ئاماژەی کرد بە هەردوو پەنجەکانی.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي رَحْمَةِ الصِّبْيَانِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەزەییهاتنەوە بە منداڵان

٤٢٠. عَنْ أَنَسِ بْن مَالِكٍ رضي الله عنه يَقُولُ: جَاءَ شَيْخٌ يُرِيدُ النَّبِيَّ ﷺ فَأَبْطَأَ القَوْمُ عَنْهُ أَنْ يُوَسِّعُوا لَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا وَيُوَقِّرْ كَبِيرَنَا».

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێت: جارێکیان پیاوێکی بەتەمەن ویستی بێتە خزمەت

پێغەمبەر ﷺ، خەڵک سستییان کرد لە کردنەوەی جێگا بۆی (تاکوو بێتە خزمەتی)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە ئێمەی موسوڵمانان نییە، کەسێک بەزەیی نەنوێنێت بەرانبەر بە منداڵانمان، ڕێزیش نەگرێت لە گەورەکانمان».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي رَحْمَةِ الْمُسْلِمِينَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەبەزەییبوون بۆ موسوڵمانان

٤٢١. عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَا يَرْحَمُ النَّاسَ لَا يَرْحَمُهُ اللَّهُ».

جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەوەی بەبەزەیی نەبێت بەرانبەر خەڵکی، خوا بەبەزەیی نابێت لەگەڵی».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّصِيحَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دڵسۆزی

٤٢٢. عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَلَى إِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالنُّصْحِ لِكُلِّ مُسْلِمٍ.

جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: بەڵێنم داوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەنجامدانی نوێژ و زەکاتدان و دڵسۆزبوون بۆ هەموو موسوڵمانێک.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي شَفَقَةِ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پەرۆشی موسوڵمان بۆ موسوڵمان

٤٢٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لَا يَخُونُهُ

وَلَا يَكْذِبُهُ، وَلَا يَخْذُلُهُ، كُلُّ الْمُسْلِمِ عَلَى الْمُسْلِمِ حَرَامٌ، عِرْضُهُ وَمَالُهُ وَدَمُهُ، التَّقْوَى هَاهُنَا، بِحَسْبِ امْرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْتَقِرَ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ».

ئەبو هوڕەیڕە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «موسوڵمان برای موسوڵمانە خیانەتی لێ ناکات، درۆی لەگەڵ ناکات، خەجاڵەتی ناکات، بۆ هەر موسوڵمانێک بەرانبەر بە موسوڵمانێکی دی ئابڕووی و ماڵی و خوێنی قەدەغە کراوە، (بزانن) پارێزکاری ئا لێرەیە (لەنێو دڵە)، کەسێک ئەوەندەی بەسە لە خراپە کە بەکەم و بێڕێزی سەیری برا موسوڵمانەکەی خۆی بکات».

٤٢٤. عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمُؤْمِنُ لِلْمُؤْمِنِ كَالْبُنْيَانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضًا».

ئەبو مووسای ئەشعەری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بڕوادار بۆ بڕوادار وەک دیواری بینایەکی پتەو وایە هەندێکی هەندێکی دیکەی بەهێز دەکات».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الذَّبِّ عَنْ عِرْضِ الْمُسْلِمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بەرگریکردن لە ئابڕووی موسوڵمان

٤٢٥. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ رَدَّ عَنْ عِرْضِ أَخِيهِ رَدَّ اللَّهُ عَنْ وَجْهِهِ النَّارَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

ئەبو دەڕداء ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک بەرگری بکات لە ئابڕووی براکەی، ئەوە خوا ڕووی دەپارێزێت لە ئاگری دەزەخ لە ڕۆژی قیامەت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَسَدِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئیرەیی

٤٢٦. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقَاطَعُوا وَلَا تَدَابَرُوا وَلَا تَبَاغَضُوا وَلَا تَحَاسَدُوا وَكُونُوا عِبَادَ اللَّهِ إِخْوَانًا، وَلَا يَحِلُّ لِمُسْلِمٍ أَنْ يَهْجُرَ أَخَاهُ فَوْقَ ثَلَاثٍ».

ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پەیوەندییەکانتان مەپچڕێنن، پشت لە یەکدی مەکەن، ڕقتان لەیەکدی نەبێتەوە، ئیرەیی بەیەکدی مەبەن، بەندەی خوابن بۆ یەکدی برا بن، دروست نییە موسوڵمان لە سێ ڕۆژ زیاتر دەنگی لەگەڵ برامەی ببڕێت و قسەی لەگەڵ نەکات».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّبَاغُضِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕقبوونەوە لەیەکدی

٤٢٧. عَنْ جَابِرٍ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ الشَّيْطَانَ قَدْ يَئِسَ أَنْ يَعْبُدَهُ الْمُصَلُّونَ، وَلَكِنْ فِي التَّحْرِيشِ بَيْنَهُمْ».

جابیر ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی شەیتان بێئومێد بووە کە نوێژخوێنان بیپەرستن، بەڵام بێئومێد نەبووە لە ئاژاوەنانەوە لە نێوانیان».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِصْلَاحِ ذَاتِ البَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئاشتەوایی نێوان خەڵک

٤٢٨. عَنْ أُمِّ كُلْثُومٍ بِنْتِ عُقْبَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَيْسَ

بِالكَاذِبِ مَنْ أَصْلَحَ بَيْنَ النَّاسِ، فَقَالَ خَيْرًا أَوْ نَمَى خَيْرًا».

ئوم کولسومی کچی عوقبه ﵄ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «ئەو کەسە درۆزن نییە ئاشتەوایی دەکات لە نێوان خەڵکی، جا قسەی چاک لە نێوانیان بکات، یان قسەی چاک لە نێوانیان بێنێت و ببات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الإِحْسَانِ إِلَى الخَدَمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چاکەکردن لەگەڵ خزمەتکار

٤٢٩. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِخْوَانُكُمْ جَعَلَهُمُ اللَّهُ فِتْيَةً تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَمَنْ كَانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطْعِمْهُ مِنْ طَعَامِهِ، وَلْيُلْبِسْهُ مِنْ لِبَاسِهِ، وَلَا يُكَلِّفْهُ مَا يَغْلِبُهُ، فَإِنْ كَلَّفَهُ مَا يَغْلِبُهُ فَلْيُعِنْهُ».



ئەبو زەڕ ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «(خزمەتکارانتان) برای ئێوەن، خوا ئەوانی بە لاوێتی خستۆتە ژێر دەستی ئێوە، جا هەر کەسێک برایەکی لەژێر دەستی بوو با لە خواردنی خۆی پێ بدات و لە پۆشاکی خۆی پۆشتەی بکات، ئەوەندە کاری پێ نەکات پەکی بکەوێت (لە توانای بەدەر بێت)، خۆ ئەگەر کارێکی وای پێ کرد، با یارمەتی بدات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي العَفْوِ عَنِ الخَادِمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چاوپۆشیکردن لە خزمەتکار

٤٣٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَمْ أَعْفُو عَنِ الخَادِمِ؟ فَصَمَتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَمْ أَعْفُو عَنِ الخَادِمِ؟ فَقَالَ: «كُلَّ يَوْمٍ سَبْعِينَ مَرَّةً».

عەبدوڵلای کوڕی عومەر ﷺ دەڵێت: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا تا چەند لە خزمەتکارەکەم ببوورم، پێغەمبەری خوا ﷺ بێدەنگ بوو، ئینجا (دووبارە) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تا چەند لە خزمەتکارەکەم ببوورم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: هەموو ڕۆژێک حەفتا جار (واتە لێبووردنێکی بێ ئەندازە).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي قَبُولِ الهَدِيَّةِ وَالمُكَافَأَةِ عَلَيْهَا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وەرگرتنی دیاری و خەڵاتکردنەوەی خاوەنەکەی

٤٣١. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقْبَلُ الهَدِيَّةَ وَيُثِيبُ عَلَيْهَا.

عائیشە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دیاری وەردەگرت، خاوەنەکەشی خەڵات دەکردەوە.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الشُّكْرِ لِمَنْ أَحْسَنَ إِلَيْكَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سوپاسکردنی کەسێک چاکەی لەگەڵت کردبێت

٤٣٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ لَا يَشْكُرُ النَّاسَ لَا يَشْكُرُ اللَّهَ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک سوپاسی خەڵکی نەکات، سوپاسی خواش ناکات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صَنَائِعِ المَعْرُوفِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چاکەکاری

٤٣٣. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ، وَأَمْرُكَ بِالمَعْرُوفِ وَنَهْيُكَ عَنِ المُنْكَرِ صَدَقَةٌ، وَإِرْشَادُكَ الرَّجُلَ فِي أَرْضِ الضَّلَالِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَبَصَرُكَ لِلرَّجُلِ الرَّدِيءِ البَصَرِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِمَاطَتُكَ الحَجَرَ وَالشَّوْكَةَ وَالعَظْمَ عَنِ الطَّرِيقِ لَكَ صَدَقَةٌ، وَإِفْرَاغُكَ مِنْ دَلْوِكَ فِي دَلْوِ أَخِيكَ لَكَ صَدَقَةٌ».

ئەبو زەڕ ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بە ڕووگەشیت بەرانبەر براکەت خێر و چاکەت بۆ دەنووسرێت، بە فەرمانکردنت بە چاکە و قەدەغەکردنت لە خراپە خێر و چاکەت بۆ دەنووسرێت، بە ڕێنماییکردنت بۆ کەسێک لە شوێنێک کە نیشانەی نەبێت (بۆ ناسینی ڕێگا) خێر و چاکەت بۆ دەنووسرێت، بە ڕێگا پیشاندانت بۆ کەسێکی نابینا خێر و چاکەت بۆ دەنووسرێت، بە لابردنی بەرد و دڕک و ئێسقان لەسەر ڕێگا خێر و چاکەت بۆ دەنووسرێت، بە بەتاڵکردنی سەتڵی ئاوەکەت بۆ سەتڵی ئاوی براکەت خێر و چاکەت بۆ دەنووسرێت».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّفَقَةِ عَلَى الأَهْلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خەرجی بۆ خانەوادە

٤٣٤. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «نَفَقَةُ الرَّجُلِ عَلَى أَهْلِهِ صَدَقَةٌ».

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «بە خەرجی پیاو بۆ خانەوادەکەی خێر و چاکەی بۆ دەنووسرێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي طَلَاقَةِ الوَجْهِ وَحُسْنِ البِشْرِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕووخۆشی و گەشاوەیی

٤٣٥. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ، وَإِنَّ مِنَ المَعْرُوفِ أَنْ تَلْقَى أَخَاكَ بِوَجْهٍ طَلْقٍ، وَأَنْ تُفْرِغَ مِنْ دَلْوِكَ فِي إِنَاءِ أَخِيكَ».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەموو چاکەیەک بە خێر و سەدەقە دەنووسرێت، لە کاری چاکە کە بگەیتە براکەت بە ڕوویەکی خۆش و گەشاوە، لە کاری چاکە ئاوی سەتڵەکەت بەتاڵ بکەی بۆ سەتڵی براکەت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي اللَّعْنَةِ



## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نەفرەتکردن

٤٣٦. عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَلَاعَنُوا بِلَعْنَةِ اللَّهِ، وَلَا بِغَضَبِهِ، وَلَا بِالنَّارِ».

سەموڕەی کوڕی جوندەب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نەفرەت مەکەن لە یەکدی بە نەفرەتکردنی خوا، بە توڕەیی خوا، بە ئاگری خوا».

٤٣٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ رَجُلاً لَعَنَ الرِّيحَ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «لَا تَلْعَنِ الرِّيحَ فَإِنَّهَا مَأْمُورَةٌ، وَإِنَّهُ مَنْ لَعَنَ شَيْئًا لَيْسَ لَهُ بِأَهْلٍ رَجَعَتِ اللَّعْنَةُ عَلَيْهِ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پیاوێک لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ نەفرەتی لە با کرد، ئەویش فەرمووی: «نەفرەت لە با مەکە، چونکە فەرمانپێدراوە، بەڕاستی هەر کەسێک نەفرەت بکات لە شتێک کە شیاوی نەفرەتەکە نەبێت، بێگومان ئەم نەفرەتە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الشَّتْمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی جنێودان

٤٣٨. عَنِ المُغِيرَةَ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَسُبُّوا الأَمْوَاتَ فَتُؤْذُوا الأَحْيَاءَ».

موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جنێو مەدەن بە مردووەکان، ببێتە هۆی ئەزیەتدانی کەسانی زیندوو».

٤٣٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سِبَابُ المُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جنێودان بە موسوڵمان لادانە، جەنگ لەگەڵ کردنیشی (نیشانە و هۆکاری) بێبڕواییە».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي ظَنِّ السُّوءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گومانی خراپ

٤٤٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الحَدِيثِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئاگادار بن خۆتان لە گومانی خراپ بپارێزن، چونکە گومانی خراپ درۆترین قسەوباسە (کە بە دڵی بەندەکاندا دێت)».

* قَالَ سُفْيَانُ: الظَّنُّ ظَنَّانِ: فَظَنٌّ إِثْمٌ، وَظَنٌّ لَيْسَ بِإِثْمٍ، فَأَمَّا الظَّنُّ الَّذِي هُوَ إِثْمٌ

فَالَّذِي يَظُنُّ ظَنًّا وَيَتَكَلَّمُ بِهِ، وَأَمَّا الظَّنُّ الَّذِي لَيْسَ بِإِثْمٍ فَالَّذِي يَظُنُّ وَلَا يَتَكَلَّمُ بِهِ.

پێشەوا سوفیان دەڵێت: گومان دوو جۆرە: گومانێک گوناحە، گومانەکەی دیکە گوناح نییە، ئەو گومانەی کە گوناحە ئەوەیە کەسێک گومانێک دەبات و زمانیش دەریدەبڕێت، ئەو گومانەش کە گوناح نییە ئەوەیە کەسێک گومانێک دەبات، بەڵام زمان نایدرکێنێت.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمِزَاحِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گاڵتە

٤٤١. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لَيُخَالِطُنَا حَتَّى إِنْ كَانَ لَيَقُولُ لِأَخٍ لِي صَغِيرٍ: «يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ».



ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەتەواوی تێکەڵومان دەبوو (لەگەڵ خانەوادەمان)، بەجۆرێک بە برا بچووکەکەمی دەفەرموو: «ئەی ئەبو عومەیر، چی لێ هات نوغەیر؟».

٤٤٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّكَ تُدَاعِبُنَا، قَالَ: «إِنِّي لَا أَقُولُ إِلَّا حَقًّا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆش گاڵتەمان لەگەڵ دەکەیت؟ فەرمووی: «(من جگە لە هەق هیچ شتێک ناڵێم (واتە: گاڵتەکرنیشم قسەی ڕاستن)».

٤٤٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لَهُ: «يَا ذَا الْأُذُنَيْنِ»، قَالَ مَحْمُودٌ: قَالَ أَبُو أُسَامَةَ: يَعْنِي مَازَحَهُ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووە (بەگاڵتەوە): ئەی

خاوەن دوو گوێچکە. (ڕاوی کە ناوی) مەحموودە گوتوویەتی: واتە: گاڵتەی لەگەڵ کردووە (قسەکەش ڕاستە کەسەکە دوو گوێی هەبووە).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي المُدَارَاةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆگونجاندن

٤٤٤. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: اسْتَأْذَنَ رَجُلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَنَا عِنْدَهُ فَقَالَ: «بِئْسَ ابْنُ العَشِيرَةِ أَوْ أَخُو العَشِيرَةِ»، ثُمَّ أَذِنَ لَهُ، فَأَلَانَ لَهُ القَوْلَ، فَلَمَّا خَرَجَ قُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قُلْتَ لَهُ مَا قُلْتَ، ثُمَّ أَلَنْتَ لَهُ القَوْلَ فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ، إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ مَنْ تَرَكَهُ النَّاسُ أَوْ وَدَعَهُ النَّاسُ اتِّقَاءَ فُحْشِهِ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: جارێکیان پیاوێک داوای هاتنە ژوورەوەی کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ، منیش لەلای بووم، فەرمووی: «خراپترین کەسی هۆزەکەیەتی»، ئینجا ڕێی پێ دا، پێغەمبەری خوا ﷺ بەنەرمی لەگەڵی دوا، کاتێک کەسەکە ڕۆیشت، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، لە سەرەتادا ئەوەی فەرمووت ئەوە فەرمووت، کەچی دواجار بەنەرمی لەگەڵی دوایت؟ فەرمووی: « ئەی عائیشە، بەڕاستی خراپترین کەس ئەو کەسەیە خەڵکی وازی لێ بهێنن، یان خەڵکی جێی بهێڵن بۆ خۆپاراستن لە زمانپیسی و خراپەکانی».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الكِبْرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆبەزلزانین

٤٤٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَدْخُلُ الجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ خَرْدَلٍ مِنْ كِبْرٍ، وَلَا يَدْخُلُ النَّارَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ حَبَّةٍ مِنْ إِيمَانٍ».

عەبدوڵلا ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ناچێتە بەهەشت هەر کەسێک تۆسقاڵێک لە خۆبەزلزانین لە دڵیدا هەبێت، ناچێتە دۆزەخ (بەهەمیشەیی) کەسێک تۆسقاڵێک ئیمان لە دڵیدا هەبێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي حُسْنِ الخُلُقِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەوشتجوانی

٤٤٦. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷛ قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: «مَا مِنْ شَيْءٍ يُوضَعُ فِي المِيزَانِ أَثْقَلُ مِنْ حُسْنِ الخُلُقِ، وَإِنَّ صَاحِبَ حُسْنِ الخُلُقِ لَيَبْلُغُ بِهِ دَرَجَةَ صَاحِبِ الصَّوْمِ وَالصَّلَاةِ».

ئەبو دەرداء ﷛ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هیچ شتێک نییە لە تەرازووی (کردەوە چاکەکاندا) دابنرێت کە قورستر و باشتر بێت لە ڕەوشتجوانی، بەڕاستی خاوەن ڕەوشتی جوان بەهۆیەوە دەگاتە پلەی خاوەن ڕۆژوو و نوێژ».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَيَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی شەرم و حەیا

٤٤٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الحَيَاءُ مِنَ الإِيمَانِ، وَالإِيمَانُ فِي الجَنَّةِ، وَالبَذَاءُ مِنَ الجَفَاءِ، وَالجَفَاءُ فِي النَّارِ».

ئەبو هورەیرە ﷛ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «شەرم و حەیا لە ئیمانەوەیە، (خاوەنی) ئیمانیش لە بەهەشتە، بێشەرمی لە دڵڕەقییەوەیە، (خاوەنی) دڵڕەقی لەنێو ئاگرە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الرِّفْقِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نەرمونیانی

٤٤٨. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ فَقَدْ أُعْطِيَ حَظَّهُ مِنَ الخَيْرِ، وَمَنْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الرِّفْقِ فَقَدْ حُرِمَ حَظَّهُ مِنَ الخَيْرِ».

ئەبو دەرِدا ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک بەشێکی لە نەرمونیانی پێ درابێت، بەڕاستی ئەوە بەشی خۆی لە خێر پێ دراوە، هەر کەسێکیش بێبەش کرابێت لە نەرمونیانی، بەڕاستی بێبەش کراوە لە چاکە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي دَعْوَةِ المَظْلُومِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاڕانەوەی ستەملێکراو



٤٤٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَعَثَ مُعَاذَ بْنَ جَبَلٍ إِلَى اليَمَنِ، فَقَالَ: «اتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومِ، فَإِنَّهَا لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ موعازی کوڕی جەبەلی ڕەوانە کرد بۆ یەمەن، پێی فەرموو: «خۆت بپارێزە لە نزا و پاڕانەوەی ستەملێکراو، چونکە بەڕاستی لە نێوان ئەو و خوا هیچ پەردەیەک نییە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي مَعَالِي الأَخْلَاقِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەوشتە بەرزەکان

٤٥٠. عَنْ جَابِرٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنْ أَحَبِّكُمْ إِلَيَّ وَأَقْرَبِكُمْ مِنِّي

مَجْلِسًا يَوْمَ القِيَامَةِ أَحَاسِنَكُمْ أَخْلَاقًا، وَإِنَّ أَبْغَضَكُمْ إِلَيَّ وَأَبْعَدَكُمْ مِنِّي مَجْلِسًا يَوْمَ القِيَامَةِ الثَّرْثَارُونَ وَالمُتَشَدِّقُونَ وَالمُتَفَيْهِقُونَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ عَلِمْنَا الثَّرْثَارُونَ وَالمُتَشَدِّقُونَ فَمَا المُتَفَيْهِقُونَ؟ قَالَ: «المُتَكَبِّرُونَ».

جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی خۆشەویستترینتان لەلام و نزیکترینتان لە کۆڕی دانیشتنی من لە ڕۆژی دوایی، ڕەوشت جوانترینتانە، بەڕاستی بوغزێنراوترینتان لەلای من و دوورترینتان لە کۆڕی من لە ڕۆژی دوایی: کەسانی زۆربڵێ و زماندرێژ و خۆبەگەورەزانن»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، زانیمان زۆربڵێ و زماندرێژەکان کێن، بەڵام مەبەستت چییە لە (المُتَفَيْهِقُونَ)؟ فەرمووی: «کەسانی خۆبەگەورەزانن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي اللَّعْنِ وَالطَّعْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نەفرەتکاری و تانەدان



٤٥١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا يَنْبَغِي لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يَكُونَ لَعَّانًا».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ناگونجێت بۆ بڕوادار نەفرینکار بێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَثْرَةِ الْغَضَبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی زۆر توڕەبوون

٤٥٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: عَلِّمْنِي شَيْئًا وَلَا تُكْثِرْ عَلَيَّ لَعَلِّي أَعِيهِ، قَالَ: «لَا تَغْضَبْ»، فَرَدَّدَ ذَلِكَ مِرَارًا كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ: «لَا تَغْضَبْ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: شتێکم فێر

بکە، بەڵام زۆر درێژەم بۆ پێ نەدەیت تا بەکورتی لێی تێبگەم (دیارە تێگەیشتنی زۆر باش نەبووە)، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: «تووڕە مەبە»، پیاوەکە چەند جارێک دووبارەی کردەوە، لە وەڵامدا هەر دەیفەرموو ﷺ: «تووڕە مەبە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي المُتَهَاجِرَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دابڕاوان لەیەکدی

٤٥٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «تُفَتَّحُ أَبْوَابُ الجَنَّةِ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَالخَمِيسِ فَيُغْفَرُ فِيهِمَا لِمَنْ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا إِلَّا المُهْتَجِرَيْنِ، يُقَالَ: رُدُّوا هَذَيْنِ حَتَّى يَصْطَلِحَا».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، هەموو کەسێك لێ دەبووردرێت کە هاوبەشی بۆ خوا بڕیار نەدابێت، جگە لەو کەسانەی پەیوەندییان پچڕاندووە، دەگوترێت: ئەم دووانە ڕەت بکەنەوە هەتا لەگەڵ یەکدی ئاشت دەبنەوە».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي ذِي الوَجْهَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسی دووڕوو

٤٥٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ مِنْ شَرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ القِيَامَةِ ذَا الوَجْهَيْنِ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی خراپترین کەس لەلای خوا لە ڕۆژی دوایی کەسانی دووڕوون».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي النَّمَّامِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قسەهێنان و بردن

٤٥٥. عَنْ هَمَّامِ بْنِ الحَارِثِ قَالَ: مَرَّ رَجُلٌ عَلَى حُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ ﵁ فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ هَذَا يُبَلِّغُ الأُمَرَاءَ الحَدِيثَ عَنِ النَّاسِ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «لَا يَدْخُلُ الجَنَّةَ قَتَّاتٌ».

هەمامی کوڕی حاریس دەڵێت: پیاوێک بەلای حوزەیفەی کوڕی یەمان ﵁ تێپەڕ بوو، پێی گوترا: ئەو پیاوە قسەی خەڵکی بۆ فەرمانڕەواکان دەگوازێتەوە، حوزەیفەش ﵁ گوتی: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، دەیفەرموو: «ناچێتە بەهەشت ئەو کەسەی قسە دەهێنێت و دەبات (بۆ خراپەنانەوە)».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِنَّ مِنَ البَيَانِ سِحْرًا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەوەی کە هەندێک ڕەوانبێژی جادوویە

٤٥٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَجُلَيْنِ قَدِمَا فِي زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَخَطَبَا، فَعَجِبَ النَّاسُ مِنْ كَلَامِهِمَا، فَالتَفَتَ إِلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ مِنَ البَيَانِ سِحْرًا أَوْ إِنَّ بَعْضَ البَيَانِ سِحْرٌ».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: دوو کەس لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتن (بۆ شاری مەدینە) و وتاریان دا، خەڵکی بە قسەکانیان سەرسام بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی تێ کردین و فەرمووی: «بەڕاستی هەندێک ڕەوانبێژی کاریگەری جادووی تێدایە، یان بەڕاستی بەشێک لە ڕەوانبێژی کاریگەری جادووی تێدایە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرْكِ العَيْبِ لِلنِّعْمَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەخنەنەگرتن لە نیعمەتەکان

٤٥٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: مَا عَابَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ طَعَامًا قَطُّ كَانَ إِذَا اشْتَهَاهُ أَكَلَهُ وَإِلَّا تَرَكَهُ.

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: هەرگیز پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەخنەی لە خواردن نەگرتووە، ئەگەر حەزی لێ کردبا دەیخوارد، ئەگەرنا وازی لێ دەهێنا (و نەیدەخوارد).

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْظِيمِ المُؤْمِنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕێز و گەورەیی بڕوادار



٤٥٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: صَعِدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ المِنْبَرَ فَنَادَى بِصَوْتٍ رَفِيعٍ، فَقَالَ: «يَا مَعْشَرَ مَنْ أَسْلَمَ بِلِسَانِهِ وَلَمْ يُفْضِ الإِيمَانُ إِلَى قَلْبِهِ، لَا تُؤْذُوا المُسْلِمِينَ وَلَا تُعَيِّرُوهُمْ وَلَا تَتَّبِعُوا عَوْرَاتِهِمْ، فَإِنَّهُ مَنْ تَتَبَّعَ عَوْرَةَ أَخِيهِ المُسْلِمِ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ، وَمَنْ تَتَبَّعَ اللَّهُ عَوْرَتَهُ يَفْضَحْهُ وَلَوْ فِي جَوْفِ رَحْلِهِ»، قَالَ: وَنَظَرَ ابْنُ عُمَرَ يَوْمًا إِلَى البَيْتِ أَوْ إِلَى الكَعْبَةِ فَقَالَ: مَا أَعْظَمَكِ وَأَعْظَمَ حُرْمَتَكِ، وَالمُؤْمِنُ أَعْظَمُ حُرْمَةً عِنْدَ اللَّهِ مِنْكِ.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ چۆیە سەر مینبەر و بەدەنگی بەرز فەرمووی: «ئەی ئەو کەسانەی بە زمان موسوڵمانن، بەڵام بڕوای تەواو نەگەیشتۆتە نێو دڵیان، ئەزیەتی موسوڵمانان مەدەن، عەیبداریان مەکەن، بەدوای نهێنییەکانیان مەکەون، بەدوای کەموکوڕییەکانیان مەکەون، چونکە بەڕاستی هەر کەسێک بەدوای کەموکوڕیی برا موسوڵمانەکەی بکەوێت، خوا بەدوای کەموکوڕییەکانی دەکەوێت (ئاشکرای دەکات)، هەر کەسێکیش خوا بەدوای

کەموکوڕییەکانی بکەوێت ئابڕووی دەبات ئەگەر لەنێو ناوەندی بارەگایەکەشی بێت»، (ڕاوی) گوتی: ئیبن عومەر جارێکیان سەیری کەعبەی پیرۆزی کرد گوتی: چەند گەورە و مەزنی، ڕێز و پلەت چەند مەزنە، ڕێز و پلەی بڕوادار گەورەترە لەلای خوا لە تۆ.



# أَبْوَابُ الطِّبِّ عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ

## کۆباسی پزیشکی له پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي الدَّوَاءِ وَالحَثِّ عَلَيْهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەرمان و هاندان بۆ بەکارهێنانی



٤٥٩. عَنْ أُسَامَةَ بْنِ شَرِيكٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَتِ الأَعْرَابُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَلَا نَتَدَاوَى؟ قَالَ: «نَعَمْ، يَا عِبَادَ اللَّهِ تَدَاوَوْا، فَإِنَّ اللَّهَ لَمْ يَضَعْ دَاءً إِلَّا وَضَعَ لَهُ شِفَاءً»، أَوْ قَالَ: «دَوَاءً إِلَّا دَاءً وَاحِدًا»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَا هُوَ؟ قَالَ: «الهَرَمُ».

ئوسامەی کوڕی شەریک رضي الله عنه دەڵێت: کەسانێکی دەشتەکی گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا دەرمان بەکار بهێنین؟ فەرمووی: «بەڵێ، ئەی بەندەکانی خوا دەرمان بەکار بهێنن، چونکە بەڕاستی خوا هیچ دەردێکی دانەناوە، مەگەر شیفا یان دەرمانیشی بۆ داناوە، جگە لە دەردێک»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو دەردە چییە؟ فەرمووی: «پیری و بەساڵاچوون».

## بَابُ مَا جَاءَ لَا تُكْرِهُوا مَرْضَاكُمْ عَلَى الطَّعَامِ وَالشَّرَابِ

### باسی ئەوەی هاتووە زۆر لە نەخۆش مەکەن لەسەر خواردن و خواردنەوە

٤٦٠. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الجُهَنِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُكْرِهُوا مَرْضَاكُمْ عَلَى الطَّعَامِ، فَإِنَّ اللَّهَ ﷻ يُطْعِمُهُمْ وَيَسْقِيهِمْ».

عوقبەی کوڕی عامیری جوهەنی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نەخۆشەکانتان ناچارمەکەن لەسەر خواردن، چونکە بەڕاستی خوا خۆراک و خواردنەوەیان پێ دەدات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَبَّةِ السَّوْدَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕەشکە



٤٦١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «عَلَيْكُمْ بِهَذِهِ الحَبَّةِ السَّوْدَاءِ، فَإِنَّ فِيهَا شِفَاءً مِنْ كُلِّ دَاءٍ إِلَّا السَّامَ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «دەست بگرن بە بەکارهێنانی ڕەشکە، چونکە بەڕاستی چارەسەری تێدایە بۆ هەموو دەردێک، تەنیا مەرگ نەبێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْحِجَامَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەڵەشاخکردن

٤٦٢. عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: حَدَّثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ لَيْلَةِ أُسْرِيَ بِهِ أَنَّهُ لَمْ يَمُرَّ

عَلَى مَلَإٍ مِنَ المَلَائِكَةِ إِلَّا أَمَرُوهُ أَنْ مُرْ أُمَّتَكَ بِالحِجَامَةِ.

ئیبن مەسعوود ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی بەسەرهاتی شەوی شەوڕۆیی بۆ کردین، کە بەلای هەر کۆمەڵێك لە فریشتەکان تێپەڕ دەبوو، فەرمانیان دەکرد کەوا فەرمان بکە بە ئوممەتەکەت بە ئەنجامدانی کەڵەشاخ.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَخْذِ الأَجْرِ عَلَى التَّعْوِيذِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وەرگرتنی کرێ لەسەر خوێندنی خۆپارێزی

٤٦٣. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: بَعَثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي سَرِيَّةٍ فَنَزَلْنَا بِقَوْمٍ، فَسَأَلْنَاهُمُ القِرَى فَلَمْ يَقْرُونَا، فَلُدِغَ سَيِّدُهُمْ فَأَتَوْنَا فَقَالُوا: هَلْ فِيكُمْ مَنْ يَرْقِي مِنَ العَقْرَبِ؟ قُلْتُ: نَعَمْ أَنَا، وَلَكِنْ لَا أَرْقِيهِ حَتَّى تُعْطُونَا غَنَمًا، قَالُوا: فَإِنَّا نُعْطِيكُمْ ثَلَاثِينَ شَاةً، فَقَبِلْنَا فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ: الحَمْدُ لِلَّهِ سَبْعَ مَرَّاتٍ، فَبَرَأَ وَقَبَضْنَا الغَنَمَ، قَالَ: فَعَرَضَ فِي أَنْفُسِنَا مِنْهَا شَيْءٌ فَقُلْنَا: لَا تَعْجَلُوا حَتَّى تَأْتُوا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَيْهِ ذَكَرْتُ لَهُ الَّذِي صَنَعْتُ، قَالَ: «وَمَا عَلِمْتَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ؟ اقْبِضُوا الغَنَمَ وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ بِسَهْمٍ».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەی ڕەوانە کرد لەگەڵ سوپایەک، لەلای کەسانێک بارگەمان داگرت، داوای میوانداریمان لێ کردن، بەڵام میواندارییان نەکردین، لەو ماوەیەدا گەورەکەیان دووچاری پێوەدان هات، جا هاتنە لامان گوتیان: ئایا کەستان هەیە دوعا بکات بۆ پێوەدانی دووپشک؟ گوتم: بەڵێ من، بەڵام لەسەری ناخوێنم تا چەند سەرە مەڕێکمان نەدەنێ، گوتیان: سی سەر مەڕتان دەدەینێ، ئێمەش قبووڵمان کرد، حەوت جار سووڕەتی فاتیحەم لەسەر خوێند، بەهۆیەوە چاک بۆیەوە، مەڕەکانمان وەرگرت، گوتی: شتێک بە دڵماندا هات (سەبارەت بە وەرگرتنی ئەم مەڕانە)، لەنێو یەکدی گوتمان پەلە مەکەن تا دەچینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: جا کاتێک گەڕاینەوە خزمەت پێغەمبەری خوا

ﷺ ئەوەی کردبوومان بۆمان گێڕایەوە، فەرمووی: «چۆنت زانی (فاتیحە) بخوێنیت بۆ چارەسەری؟ مەڕەکان وەربگرن و بەشی منیشی لێ بدەن».

* وَرَخَّصَ الشَّافِعِيُّ لِلْمُعَلِّمِ أَنْ يَأْخُذَ عَلَى تَعْلِيمِ القُرْآنِ أَجْرًا، وَيَرَى لَهُ أَنْ يَشْتَرِطَ عَلَى ذَلِكَ.

پێشەوا شافیعی مۆڵەتی داوە بە مامۆستا کرێ وەربگرێت لە بەرانبەر فێرکردنی قورئان، بۆی هەیە مەرج دابنێت لەسەر ئەوە، بەڵگەی هێناوەتەوە بەو فەرموودەیە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الكَمْأَةِ وَالعَجْوَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دۆمبەڵان و عەجوە



٤٦٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «العَجْوَةُ مِنَ الجَنَّةِ وَفِيهَا شِفَاءٌ مِنَ السُّمِّ، وَالكَمْأَةُ مِنَ المَنِّ وَمَاؤُهَا شِفَاءٌ لِلْعَيْنِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خورمای عەجوە سەرچاوەکەی بەهەشتە، چارەسەری ژەهری تێدایە، دۆمبەڵان سەرچاوەکەی گەزۆیە، ئاوەکەشی چارەسەرە بۆ چاو».



# أَبْوَابُ الْفَرَائِضِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی میرات له پێغەمبەری خواوە ﷺ



### بَابُ مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ ابْنَةِ الِابْنِ مَعَ ابْنَةِ الصُّلْبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی کچی کوڕ لەگەڵ کچی لە پشت

٤٦٥. عَنْ هُزَيْلِ بْنِ شُرَحْبِيلَ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى أَبِي مُوسَى، وَسَلْمَانَ بْنِ رَبِيعَةَ فَسَأَلَهُمَا عَنِ الِابْنَةِ وَابْنَةِ الِابْنِ وَأُخْتٍ لِأَبٍ وَأُمٍّ؟ فَقَالَا: لِلِابْنَةِ النِّصْفُ، وَلِلْأُخْتِ مِنَ الأَبِ وَالأُمِّ مَا بَقِيَ، وَقَالَا لَهُ: انْطَلِقْ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ، فَاسْأَلْهُ فَإِنَّهُ سَيُتَابِعُنَا، فَأَتَى عَبْدَ اللَّهِ فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ وَأَخْبَرَهُ بِمَا قَالَا: قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا، وَمَا أَنَا مِنَ الْمُهْتَدِينَ، وَلَكِنِّي أَقْضِي فِيهِمَا كَمَا قَضَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: لِلِابْنَةِ النِّصْفُ، وَلِابْنَةِ الِابْنِ السُّدُسُ تَكْمِلَةَ الثُّلُثَيْنِ، وَلِلْأُخْتِ مَا بَقِيَ.

هوزەیلی کوڕی شورەحبیل دەڵێت: پیاوێک هاتە لای ئەبو مووسا و سەلمانی کوڕی ڕەبیعە، پرسیاری لە هەردووکیان کرد سەبارەت بە میراتی کچ و کچی کوڕ و خوشکی باوک و دایک، هەردووکیان گوتیان: بۆ کچەکە نیوەیە، ئەوەی دەمێنێتەوە لە میراتەکەی بۆ خوشکی باوک و دایکە، هەروەها گوتیان: بڕۆ لای عەبدوڵڵا پرسیاری لێ بکە، بەدڵنیایی ئەویش هەمان ڕای ئێمەی هەیە، ئەویش چوو بۆ لای

عەبدوڵڵا بابەتەکەی بۆ باس کرد، وەڵامی ئەوانی پێ ڕاگەیاند، جا عەبدوڵڵا گوتی: بەڕاستی من سەرلێشێواوم و لە کەسانی ڕێنماییکراو نیم (ئەگەر هەمان ڕام هەبێت)، بەڵکو بڕیار دەدەم لە بارەیان هەروەک چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ بڕیاری داوە: نیوەی بۆ کچەکەیە، یەک لە شەش بۆ کچی کوڕەکەیە، کە دەکاتە تەواوکەری دوو لەسەر سێ، ئەوەشی دەمێنێتەوە بۆ خوشکەکەیە.

## بَابُ مِيرَاثِ الْبَنِينَ مَعَ الْبَنَاتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی کوڕان لەگەڵ کچەکان

٤٦٦. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما قَالَ: جَاءَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي وَأَنَا مَرِيضٌ فِي بَنِي سَلِمَةَ، فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، كَيْفَ أَقْسِمُ مَالِي بَيْنَ وَلَدِي؟ فَلَمْ يَرُدَّ عَلَيَّ شَيْئًا فَنَزَلَتْ: {يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ} النساء: ١١، الآيَةَ.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هەواڵپرسین سەردانی کردم کاتێك نەخۆش بووم لەنێو بەنو سەلیمە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن ماڵم دابەش بکەم لە نێوان منداڵەکانم؟ هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، دواتر ئەم ئایەتە دابەزی: {يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنْثَيَيْنِ}، واتە: خوا ڕادەستتان دەکات سەبارەت بە پشکی منداڵانتان لە میراتدا، کە بۆ کوڕ دوو هێندەی کچ بێت.

## بَابُ مِيرَاثِ الْأَخَوَاتِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی خوشکان

٤٦٧. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما يَقُولُ: مَرِضْتُ فَأَتَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي،

فَوَجَدَنِي قَدْ أُغْمِيَ عَلَيَّ، فَأَتَانِي وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَهُمَا مَاشِيَانِ، فَتَوَضَّأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَصَبَّ عَلَيَّ مِنْ وَضُوئِهِ فَأَفَقْتُ. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ أَقْضِي فِي مَالِي أَوْ كَيْفَ أَصْنَعُ فِي مَالِي؟ فَلَمْ يُجِبْنِي شَيْئًا، وَكَانَ لَهُ تِسْعُ أَخَوَاتٍ، حَتَّى نَزَلَتْ آيَةُ المِيرَاثِ: {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الكَلَالَةِ} النساء: ١٧٦، الآيَةَ، قَالَ جَابِرٌ: فِيَّ نَزَلَتْ.

جابیری کوڕی عەبدوڵلا رضي الله عنهما دەڵێت: نەخۆش کەوتم جا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لام بۆ هەواڵپرسین، بینیی کە بێهۆش بووم، کاتێك کە هات ئەبو بەکر و عومەری لەگەڵدا بوو، ئەوان پیادە بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی شوشت، هەندێك لە ئاوی دەستنوێژەکەی پرژاندە سەرم، بەهۆش خۆم هاتمەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، چۆن ڕەفتار بکەم لە ماڵ و سامانەکەمدا؟ یان چی لە ماڵ و سامانەکەم بکەم (مەبەستی دابەشکردنی میرات بووە)؟ هیچ وەڵامێکی نەدامەوە، لە کاتێك جابیر نۆ خوشکی هەبوو، تا ئایەتی میرات دابەزی: {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الكَلَالَةِ}، واتە: پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: خوا فەرمانتان پێ دەکات سەبارەت بە میراتی کەلالە (ئەو کەسەیە کە نە باوک و نە منداڵی هەیە و دەمرێت، یان ئەو کەسەیە کە منداڵی نەبێت و بمرێت). جابیر گوتی: ئەم ئایەتە دەربارەی من دابەزی.



## بَابٌ فِي مِيرَاثِ العَصَبَةِ

## باسێك دەربارەی میراتی عەصەبە

٤٦٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أَلْحِقُوا الفَرَائِضَ بِأَهْلِهَا فَمَا بَقِيَ فَهُوَ لِأَوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ».

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەشە دیارکراوەکانی میرات بدەن بە خاوەنەکانیان، جا ئەوەی مایەوە بۆ نزیکترین پیاوە لە کەسی مردوو».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي مِيرَاثِ الخَالِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی میراتی خاڵ

٤٦٩. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ قَالَ: كَتَبَ مَعِي عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ ﵁ إِلَى أَبِي عُبَيْدَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اللَّهُ وَرَسُولُهُ مَوْلَى مَنْ لَا مَوْلَى لَهُ، وَالخَالُ وَارِثُ مَنْ لَا وَارِثَ لَهُ».

ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ نووسراوێکی بە مندا نارد بۆ ئەبو عوبەیدە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوا و پێغەمبەرەکەی خاوەنی ئەو کەسەن کە هیچ کەسی نییە، خاڵ میراتگرە بۆ کەسێک کە میراتگری دیکەی نەبێت».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الَّذِي يَمُوتُ وَلَيْسَ لَهُ وَارِثٌ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی دەمرێت و میراتگریشی نییە

٤٧٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ مَوْلًى لِلنَّبِيِّ ﷺ وَقَعَ مِنْ عِذْقِ نَخْلَةٍ فَمَاتَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «انْظُرُوا هَلْ لَهُ مِنْ وَارِثٍ؟»، قَالُوا: لَا، قَالَ: «فَادْفَعُوهُ إِلَى بَعْضِ أَهْلِ القَرْيَةِ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: خزمەتکارێکی پێغەمبەر ﷺ لەسەر دارخورما کەوتە خوار و کۆچی دوایی کرد، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «تەماشا بکەن ئایا میراتگری هەیە؟»، گوتیان: نەخێر، فەرمووی: «میراتەکەی بدەن بە چەند کەسێک لە خەڵکی دێیەکەی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِبْطَالِ المِيرَاثِ بَيْنَ المُسْلِمِ وَالكَافِرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پوچەڵکردنەوەی میراتگرتنی نێوان موسوڵمان و بێبڕوا

٤٧١. عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَرِثُ المُسْلِمُ الكَافِرَ، وَلَا الكَافِرُ المُسْلِمَ».

ئوسامەی کوڕی زەید ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «موسوڵمان میرات لە بێبڕوا ناگرێت، بێبڕواش میرات لە موسوڵمان ناگرێت».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ وَاخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي مِيرَاثِ المُرْتَدِّ، فَجَعَلَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمُ الْمَالَ لِوَرَثَتِهِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَا يَرِثُهُ وَرَثَتُهُ مِنَ المُسْلِمِينَ، وَاحْتَجُّوا بِحَدِيثِ النَّبِيِّ ﷺ: «لَا يَرِثُ المُسْلِمُ الكَافِرَ»، وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ.

کارکردن لەسەر ئەم فەرموودەیەیە لەلای زانایان، هەروەها زانایان ڕاجیاییان هەیە دەربارەی میراتی هەڵگەڕاوە لە ئیسلام، هەندێک لە زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ و کەسانی دیکەش پێیان وایە کە ماڵەکەی دەدرێتە میراتگرانی لە موسوڵمانان، هەندێکی دیکە گوتوویانە: میراتی لێ ناگیرێت لەلایەن میراتگرانی موسوڵمان، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریان ﷺ: کردۆتە بەڵگە: «موسوڵمان میرات لە بێبڕوا ناگرێت»، ئەمە بۆچوونی پێشەوا شافیعییە.

## بَابُ لَا يَتَوَارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ

### باسی خاوەن دوو ئایینی جیاواز میرات لەیەکدی ناگرن

٤٧٢. عَنْ جَابِرٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَا يَتَوَارَثُ أَهْلُ مِلَّتَيْنِ».

جابیر ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «خاوەن دوو ئایینی جیاواز میرات لەیەکدی ناگرن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِبْطَالِ مِيرَاثِ القَاتِلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پوچەڵکردنەوەی پشکی بکوژ لە میرات



٤٧٣. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «القَاتِلُ لَا يَرِثُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «کەسی بکوژ میرات ناگرێت (لە کوژراوەکە)».

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّ القَاتِلَ لَا يَرِثُ كَانَ القَتْلُ عَمْدًا أَوْ خَطَأً وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا كَانَ القَتْلُ خَطَأً فَإِنَّهُ يَرِثُ وَهُوَ قَوْلُ مَالِكٍ.

کارکردن لەسەر ئەم فەرموودەیە لەلایەن زانایان، کە بکوژ میرات ناگرێت (لە کوژراوەکە) ئەگەر کوشتنەکە بەئەنقەست بێت یان بەهەڵە، هەندێکی دیە گوتوویانە: ئەگەر هاتو کوشتنەکە بەهەڵە بوو، ئەوە میرات وەردەگرێت، ئەمە بۆچوونی مالیکە.

# أبْوَابُ الْوَصَايَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی وەسییەت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي الوَصِيَّةِ بِالثُّلُثِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وەسییەتکردن بە سێیەکی ماڵ و سامان



٤٧٤. عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رضي الله عنه قَالَ: مَرِضْتُ عَامَ الفَتْحِ مَرَضًا أَشْفَيْتُ مِنْهُ عَلَى المَوْتِ، فَأَتَانِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَعُودُنِي، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ لِي مَالاً كَثِيرًا، وَلَيْسَ يَرِثُنِي إِلَّا ابْنَتِي، أَفَأُوصِي بِمَالِي كُلِّهِ؟ قَالَ: «لَا»، قُلْتُ: فَثُلُثَيْ مَالِي؟ قَالَ: «لَا»، قُلْتُ: فَالشَّطْرُ؟ قَالَ: «لَا»، قُلْتُ: فَالثُّلُثُ؟ قَالَ: «الثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ إِنْ تَذَرْ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، وَإِنَّكَ لَنْ تُنْفِقَ نَفَقَةً إِلَّا أُجِرْتَ فِيهَا حَتَّى اللُّقْمَةَ تَرْفَعُهَا إِلَى فِي امْرَأَتِكَ»، قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أُخَلَّفُ عَنْ هِجْرَتِي؟ قَالَ: «إِنَّكَ لَنْ تُخَلَّفَ بَعْدِي فَتَعْمَلَ عَمَلاً تُرِيدُ بِهِ وَجْهَ اللَّهِ إِلَّا ازْدَدْتَ بِهِ رِفْعَةً وَدَرَجَةً وَلَعَلَّكَ أَنْ تُخَلَّفَ حَتَّى يَنْتَفِعَ بِكَ أَقْوَامٌ وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ، اللَّهُمَّ أَمْضِ لِأَصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ وَلَا تَرُدَّهُمْ عَلَى أَعْقَابِهِمْ»، لَكِنِ البَائِسُ سَعْدُ ابْنُ خَوْلَةَ يَرْثِي لَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنْ مَاتَ بِمَكَّةَ.

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص رضي الله عنه دەڵێت: لە ساڵی فەتحی مەککە نەخۆش

کەوتم، نەخۆشییەکی وا کە نزیک بوو بمرم، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لام بۆ سەردانکردنم، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من خاوەن ماڵ و سامانێکی زۆرم، جگە لە کچەکەم هیچ میراتگرێکی دیکەم نییە، ئایا وەسییەت بکەم بە بەخشینی هەموو ماڵەکەم؟ فەرمووی: «نەخێر»، گوتم: ئەی دوو لەسەر سێی ماڵم؟ فەرمووی: «نەخێر»، گوتم: ئەی نیوەی؟ فەرمووی: «نەخێر»، گوتم: ئەی سێیەکی؟ فەرمووی: «سێیەک، سێیەکیش زۆرە، بەڕاستی تۆ ئەگەر میراتگرانت بەدەوڵەمەندی بەجێ بهێڵیت زۆر چاکترە لەوەی بەهەژاری بەجێیان بهێڵیت و دەست پان بکەنەوە بۆ داواکردنی یارمەتی لە خەڵکی، بزانە تۆ هەر ماڵێکت کە خەرجی دەکەیت (بۆ خانەوادەکەت)، بێگومان پاداشتت بۆ هەیە، تەنانەت ئەو پارووەی بەرزی دەکەیتەوە بۆ دەمی هاوسەرەکەت»، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە (پلە و پاداشتی) کۆچکردنم دوا دەکەوم؟ فەرمووی: «تۆ ئەگەر دوا کەوتیت هەر کارێکت کرد مەبەستت ڕەزامەندیی خوا بوو، بێگومان پلە و گەورەیی پێ زیاد دەکەیت، لەوانەیە بمێنیت تا خەڵکانێک لێت سوودمەند ببن و زیانبەخش بیت بۆ خەڵکانێکی دیکە (ناحەزانی ئیسلام)، ئەی خوایە بەردەوامی بە هاوەڵانم بدە لە (کار و پاداشتی) کۆچکردنیان، خوایە نەگەڕێنەوە و پاشگەز نەبنەوە لە ئیسلام، بەڵام کەسی داماو سەعدی کوڕی خەولەیە کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ بەسۆزەوە باسی لێوە کرد، چونکە لە شاری مەککە کۆچی دوایی کرد.

* وَالعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُ لَيْسَ لِلرَّجُلِ أَنْ يُوصِيَ بِأَكْثَرَ مِنَ الثُّلُثِ، وَقَدْ اسْتَحَبَّ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ أَنْ يَنْقُصَ مِنَ الثُّلُثِ لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ: «وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ».

کارکردن لەسەر ئەوەیە لەلای زانایان کە ڕێگە نەدراوە کەسێک وەسییەت بکات بە زیاتر لە سێیەکی ماڵەکەی، هەندێک لە زانایان بەپەسندیان داناوە کە وەسییەتەکەی لە سێیەکێک کەمتر بێت، لەبەر ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ: «سێیەکیش زۆرە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَثِّ عَلَى الوَصِيَّةِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هاندان بۆ وەسییەتکردن

٤٧٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَبِيتُ لَيْلَتَيْنِ وَلَهُ مَا يُوصِي فِيهِ إِلَّا وَوَصِيَّتُهُ مَكْتُوبَةٌ عِنْدَهُ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: « کەسێکی موسوڵمان شتێکی هەبێت و پێویست بێت وەسییەتی پێ بکات، هەق نییە دوو شەو لەسەر یەک بمێنێتەوە، کەچی وەسییەتنامەکەی بە نووسراوی لای نەبێت».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمْ يُوصِ

باسی ئەوەی هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ وەسییەتێکی نەکردووە

٤٧٦. عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ قَالَ: قُلْتُ لِابْنِ أَبِي أَوْفَى ﵁: أَوْصَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ: لَا، قُلْتُ: كَيْفَ كُتِبَتِ الوَصِيَّةُ وَكَيْفَ أَمَرَ النَّاسَ؟ قَالَ: أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ.

تەلحەی کوڕی موصەرریف دەڵێت: بە ئیبن ئەبو ئەوفام ﵁ گوت: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ وەسییەتی کرد؟ گوتی: نەخێر، گوتم: ئەی چۆن فەرمانی داوە بە خەڵکی (بۆ وەسییەتکردن)؟ گوتی: وەسییەتی کردووە بە دەستگرتن بە کتێبی خوا.

## بَابُ مَا جَاءَ لَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وەسییەتی (ماڵ) دروست نییە بۆ میراتگر

٤٧٧. عَنْ عَمْرِو بْنِ خَارِجَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَطَبَ عَلَى نَاقَتِهِ وَأَنَا تَحْتَ جِرَانِهَا

وَهِيَ تَقْصَعُ بِجِرَّتِهَا، وَإِنَّ لُعَابَهَا يَسِيلُ بَيْنَ كَتِفَيَّ فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «إِنَّ اللَّهَ أَعْطَى كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ، وَلَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ، وَالوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الحَجَرُ، وَمَنْ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوْ انْتَمَى إِلَى غَيْرِ مَوَالِيهِ رَغْبَةً عَنْهُمْ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ، لَا يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ صَرْفًا وَلَا عَدْلًا».

عەمری کوڕی خاریجە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ وتاری بۆ داین لەسەر پشتی وشترەکەی، منیش لەژێر مللی وشترەکە بووم کە خۆراکی کاوێژکراوی خۆی قوت دەدایەوە، لیکەکەی بەسەر شانەکانماندا دەهاتە خوار، جا گوێبیستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم دەیفەرموو: «بێگومان خوای گەورە مافی داوە بە هەموو خاوەن مافێک، جا هیچ وەسییەتێک نییە بۆ میراتگران، منداڵ بۆ خاوەن جێگایە (کە پیاوی ئافرەتەکەیە)، پیاوی زیناکەر هەر بەردی بۆ دەمێنێتەوە، هەر کەسێک خۆی بداتە پاڵ کەسێک کە باوکی ئەو نییە، یان خۆی خستە پاڵ کەسانێک کە گەورەی ئەو نییە تا لێیان بێباک بێت، نەفرەتی خوای لەسەر بێت، (ئەو کەسانە) بەڕاستی خوای گەورە هیچ کارێکیان لێ وەرناگرێت».



# أَبْوَابُ الْوَلَاءِ وَالْهِبَةِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی وەلاء و خەڵات لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الوَلَاءَ لِمَنْ أَعْتَقَ

باسی ئەوەی هاتووە مافی میرات کۆیلە بۆ ئەو کەسەیە کە ئازادی کردووە



٤٧٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّهَا أَرَادَتْ أَنْ تَشْتَرِيَ بَرِيرَةَ فَاشْتَرَطُوا الوَلَاءَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «الوَلَاءُ لِمَنْ أَعْطَى الثَّمَنَ أَوْ لِمَنْ وَلِيَ النِّعْمَةَ».

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: ئەو ویستوویەتی بەریرە بکڕێت، بەڵام خاوەنەکانی بەمەرجیان داناوە کە مافی میراتی بۆ ئەوان بێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «مافی میراتی کۆیلە بۆ ئەو کەسەیە کە نرخی ئازادکردنی داوە یاخود خاوەن چاکەیە بەسەریەوە».

٤٧٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ نَهَى عَنْ بَيْعِ الوَلَاءِ وَعَنْ هِبَتِهِ.

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی کردووە لە فرۆشتنی مافەکانی ئازادکردنی کۆیلە یان بە دیاریکردنی.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الرَّجُلِ يَنْتَفِي مِنْ وَلَدِهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پیاوێک نکوولّی لە ڕەچەڵەکی منداڵەکەی بکات

٤٨٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ بَنِي فَزَارَةَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلَامًا أَسْوَدَ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ؟»، قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: «فَمَا أَلْوَانُهَا؟»، قَالَ: حُمْرٌ، قَالَ: «فَهَلْ فِيهَا أَوْرَقُ؟»، قَالَ: نَعَمْ، إِنَّ فِيهَا لَوُرْقًا، قَالَ: «أَنَّى أَتَاهَا ذَلِكَ؟»، قَالَ: لَعَلَّ عِرْقًا نَزَعَهَا، قَالَ: «فَهَذَا لَعَلَّ عِرْقًا نَزَعَهُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پیاوێک لە بەنو فەزارە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئافرەتەکەم منداڵێکی ڕەشپێستی بووە (خۆی ڕەشتپێست نەبووە)، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئایا وشترت هەن؟»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «ڕەنگیان چۆنە؟»، گوتی: سوورن، فەرمووی: «ئایا لەنێویان هیچ وشتری تێدایە ڕەنگی زیوی بێت؟»، گوتی: بەڵێ، ڕەنگی زیوی تێدایە، فەرمووی: «ئەم ڕەنگەی لە کوێوە هات (لە کاتێکدا ئەوانی دی سوورن)؟»، گوتی: لەوانەیە لە بن و ڕەچەڵەکی وەریگرتبێت، فەرمووی: «ئێ ئەم منداڵەش لەوانەیە ڕەنگەکەی لە بن و ڕەچەڵەکی خۆی وەرگرتبێت».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الرُّجُوعِ فِي الهِبَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی پەشیمانبوونەوە لە دیاری

٤٨١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَثَلُ الَّذِي يُعْطِي العَطِيَّةَ ثُمَّ يَرْجِعُ فِيهَا كَالكَلْبِ أَكَلَ حَتَّى إِذَا شَبِعَ قَاءَ ثُمَّ عَادَ فَرَجَعَ فِي قَيْئِهِ».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نموونەی ئەو

کەسەی دیارییەک دەبەخشێت، پاشان لێی پەشیمان دەبێتەوە (داوای دەکاتەوە)، وەک سەگ وایە دەخوات تا دەڕشێتەوە، پاشان دووبارە دەگەڕێتەوە سەر ڕشانەوەکەی (دەمی بۆ دەبات)».



# أَبْوَابُ الْقَدَرِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی قەدەر لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

٤٨٢. عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يَنْكُتُ فِي الْأَرْضِ إِذْ رَفَعَ رَأْسَهُ إِلَى السَّمَاءِ ثُمَّ قَالَ: «مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا قَدْ عُلِمَ وَقَالَ وَكِيعٌ: إِلَّا قَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ وَمَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ»، قَالُوا: أَفَلَا نَتَّكِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «لَا، اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ».

عەلی رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، بە شتێک لە زەوی دەدا، لە کاتێک سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان، ئینجا فەرمووی: «بێگومان هەر یەکێک لە ئێوە شوێنەکەی لە بەهەشت نووسراوە (دیاری کراوە)، یان شوێنەکەی لە دۆزەخ نووسراوە (لای خوا زانراوە کە دەچێت بۆ کوێ)»، هاوەڵان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئایا پشت بەوە نەبەستین (واز لە کارکردن بێنین)؟ فەرمووی: «نەخێر، کار و کردەوە ئەنجام بدەن، لەبەر ئەوەی هەر کەسێک ئاسانکاریی بۆ دەکرێت بۆ ئەوەی کە بۆی دروست کراوە».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ اللَّهَ كَتَبَ كِتَابًا لِأَهْلِ الْجَنَّةِ وَأَهْلِ النَّارِ

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا خوا نووسراوێکی نووسیوە بۆ خەڵکی بەهەشت و دۆزەخ

٤٨٣. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدٍ خَيْرًا اسْتَعْمَلَهُ». فَقِيلَ: كَيْفَ يَسْتَعْمِلُهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «يُوَفِّقُهُ لِعَمَلٍ صَالِحٍ قَبْلَ الْمَوْتِ».

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر خوا خواستی چاکەی بە بەندەیەکی هەبێت دەیخاتە سەر کار و کردار و بەکاری دەهێنێت»، گوترا: چۆن بەکاری دەهێنێت ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: «کاری چاکەی بۆ ئاسان دەکات پێش مردنی».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْإِيمَانِ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی باوەڕهێنان بە قەدەری چاکە و خراپە

٤٨٤. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُؤْمِنُ عَبْدٌ حَتَّى يُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ، حَتَّى يَعْلَمَ أَنَّ مَا أَصَابَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُخْطِئَهُ، وَأَنَّ مَا أَخْطَأَهُ لَمْ يَكُنْ لِيُصِيبَهُ».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەندە نابێتە خاوەنی باوەڕی ڕاستەقینە تا بڕوا دێنێت بە قەدەری خوا چاک و خراپی، بە جۆرێکی وا کە بزانێت ئەمەی دووچاری هاتووە نابێت لێی لابدات، ئەو قەدەرەشی کە لێی لادەدات، نابێت دووچاری بێت».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ النَّفْسَ تَمُوتُ حَيْثُ مَا كُتِبَ لَهَا

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا مرۆڤ دەمرێت لەو شوێنەی کە بۆی نووسراوە

٤٨٥. عَنْ مَطَرِ بْنِ عُكَامِسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا قَضَى اللَّهُ لِعَبْدٍ أَنْ يَمُوتَ بِأَرْضٍ جَعَلَ لَهُ إِلَيْهَا حَاجَةً».

مەتەری کوڕی عوکامیس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر خوا بڕیار بدات بۆ بەندەیەک کە لە شوێنێک بمرێت، وا دەکات ئەو بەندەیە پێویستی بەوێ هەبێت (سەفەری بۆ بکات)».



# أَبْوَابُ الْفِتَنِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی بەڵا و ئاژاوەکان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ

### باسی ئەوەی هاتووە خوێنی هیچ موسوڵمانێک ڕێپێدراو نییە، مەگەر بەهۆی یەکێك لەم سێیانە



٤٨٦. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ: أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ رضي الله عنه أَشْرَفَ يَوْمَ الدَّارِ، فَقَالَ: أَنْشُدُكُمُ اللَّهَ، أَتَعْلَمُونَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ إِلَّا بِإِحْدَى ثَلَاثٍ: زِنًا بَعْدَ إِحْصَانٍ، أَوْ ارْتِدَادٍ بَعْدَ إِسْلَامٍ، أَوْ قَتْلِ نَفْسٍ بِغَيْرِ حَقٍّ فَقُتِلَ بِهِ»، فَوَاللَّهِ مَا زَنَيْتُ فِي جَاهِلِيَّةٍ وَلَا فِي إِسْلَامٍ، وَلَا ارْتَدَدْتُ مُنْذُ بَايَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ، وَلَا قَتَلْتُ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ فَبِمَ تَقْتُلُونَنِي.

ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف دەگێڕێتەوە: عوسمانی کوڕی عەففان رضي الله عنه ئەو ڕۆژەی کە ئابلۆقەی ماڵیان دابوو سەیری خەڵکەکەی کرد، گوتی: داواتان لێ دەکەم بە (ناوی) خوای گەورە، ئایا دەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوێنی هیچ کەسێکی موسوڵمان ڕێ نەدراوە بە ڕشتنی، مەگەر بەهۆی یەکێك لەم سێ تاوانە نەبێت: زیناکردن لەدوای هاوسەرگیری، یان هەڵگەڕانەوە (لە ئیسلام)

لەدوای موسوڵمانبوون، یان کوشتنی کەسێک بەناڕەوا بەئەنقەست، ئینجا لە تۆڵەی بکوژرێتەوە»، سوێند بە خوا کاری داوێنپیسیم نەکردووە نە لە سەردەمی نەفامییەت نە لە سەردەمی ئیسلام، لە ئایینی ئیسلامیش پاشگەز نەبوومەوە لەو ڕۆژەوەی کە پەیمانم بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە، هیچ کەسێکم نەکوشتووە کە خوای قەدەغەی کردووە، جا (ئێستا ئێوە) بە چ تاوانێک دەمکوژن؟

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِشَارَةِ المُسْلِمِ إِلَى أَخِيهِ بِالسِّلَاحِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی موسوڵمانێک چەک ڕوو لە براکەی بکات

٤٨٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أَشَارَ عَلَى أَخِيهِ بِحَدِيدَةٍ لَعَنَتْهُ المَلَائِكَةُ».



ئەبو هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەرکەسێک ئاسنێک (بۆ ترساندنی) ئاڕاستەی براکەی بکات، فریشتەکان نەفرەتی لێ دەکەن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي لُزُومِ الجَمَاعَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەستگرتن بە کۆمەڵی موسوڵمانان

٤٨٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: خَطَبَنَا عُمَرُ بِالجَابِيَةِ فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنِّي قُمْتُ فِيكُمْ كَمَقَامِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِينَا فَقَالَ: «أُوصِيكُمْ بِأَصْحَابِي، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَفْشُو الكَذِبُ حَتَّى يَحْلِفَ الرَّجُلُ وَلَا يُسْتَحْلَفُ، وَيَشْهَدَ الشَّاهِدُ وَلَا يُسْتَشْهَدُ، أَلَا لَا يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلَّا كَانَ ثَالِثَهُمَا الشَّيْطَانُ، عَلَيْكُمْ بِالجَمَاعَةِ وَإِيَّاكُمْ وَالفُرْقَةَ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الوَاحِدِ وَهُوَ مِنَ الِاثْنَيْنِ أَبْعَدُ، مَنْ أَرَادَ بُحْبُوحَةَ الجَنَّةِ فَلْيَلْزَمُ الجَمَاعَةَ، مَنْ سَرَّتْهُ حَسَنَتُهُ وَسَاءَتْهُ سَيِّئَتُهُ فَذَلِكَ الْمُؤْمِنُ».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: عومەر وتاری بۆ داین لە جابیە و گوتی: ئەی خەڵکینە! وا من لە نێوانتان هەستامەوە (بۆ ئامۆژگاریکردن) وەک هەڵسانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەنێو ئێمەدا (لە ڕابردوو)، فەرمووی: «ئامۆژگاریتان دەکەم بە چاک ڕەفتارکردن بەرانبەر بە هاوەڵانم، ئینجا ئەوانەی لەدوای ئەوان دێن، ئینجا ئەوانەی لەدوای ئەوان دێن، پاشان درۆکردن بڵاو دەبێتەوە، بە جۆرێک کەسێک سوێند دەخوات بەبێ ئەوەی داوای سوێندی لێ کرابێت، شایەتی دەدات بەبێ ئەوەی داوای شایەتی لێ کرابێت، ئاگادار بن هەر پیاوێک بەتەنیا لەگەڵ ئافرەتێکی بێگانە بمێنێتەوە مسۆگەر شەیتان کەسی سێیەمیانە، دەست بگرن بە کۆمەڵی موسوڵمانان و ئاگادار بن لە پەرتەوازەبوون، چونکە شەیتان لەگەڵ کەسێکی بەتەنیایە و لە دوو کەسی بەیەکەوە دوورترە، هەرکەسێک نێوەڕاستی بەهەشتی دەوێت، با دەست بگرێت بە کۆمەڵی موسوڵمانان، هەر کەسێک دڵخۆش بێت بە چاکەکانی، دڵتەنگ بێت بە خراپەکانی، ئا ئەوە نیشانەی بڕوادارییە».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَغْيِيرِ المُنْكَرِ بِاليَدِ أَوْ بِاللِّسَانِ أَوْ بِالقَلْبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گۆڕینی خراپە بە دەست یان بە زمان یان بە دڵ

٤٨٩. عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: أَوَّلُ مَنْ قَدَّمَ الخُطْبَةَ قَبْلَ الصَّلَاةِ مَرْوَانُ، فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ لِمَرْوَانَ: خَالَفْتَ السُّنَّةَ، فَقَالَ: يَا فُلَانُ، تُرِكَ مَا هُنَالِكَ، فَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: أَمَّا هَذَا فَقَدْ قَضَى مَا عَلَيْهِ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ رَأَى مُنْكَرًا فَلْيُنْكِرْهُ بِيَدِهِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الإِيمَانِ».

تاریقی کوڕی شیهاب دەڵێت: یەکەم کەس وتاری (جەژنی) پێش نوێژەکەی خست مەڕوان بوو، جا پیاوێک بە ڕوویدا هەستایەوە و بە مەڕوانی گوت: پێچەوانەی سوننەتت کرد، گوتی: ئەی فڵان (ئەنجامدانی بەو شێوەیە) وازی لێ هێندراوە،

جا ئەبو سەعید گوتی: بەڕاستی ئەو پیاوە ئەرکی خۆی بەجێ هێنا، گوێبیستی پێغەمبەری خوا ﷺ بووم دەیفەرموو: «هەر کەسێک خراپەیەکی بینی با بە دەست قەدەغەی بکات، ئەگەر نەیتوانی با بە زمان قەدەغەی بکات، ئەگەر نەیتوانی با بە دڵ ڕەتی بکاتەوە، ئەوەش نزمترین پلەی بڕواداریيە».

## بَابُ مَا جَاءَ أَفْضَلُ الجِهَادِ كَلِمَةَ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ

### باسی ئەوەی هاتووە گەورەترین جیهاد گوتنی وشەیەکی هەقە بەرانبەر دەسەڵاتدارێکی ستەمکار

٤٩٠. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ مِنْ أَعْظَمِ الجِهَادِ كَلِمَةَ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ».



ئەبو سەعیدی خودری رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی گەورەترین جیهاد گوتنی وشەیەکی هەقە بەرانبەر دەسەڵاتدارێکی ستەمکار».

## بَابُ مَا جَاءَ كَيْفَ يَكُونُ الرَّجُلُ فِي الفِتْنَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا کەسێک لە کاتی بەڵا چۆن بێت

٤٩١. عَنْ أُمِّ مَالِكٍ البَهْزِيَّةِ رضي الله عنها قَالَتْ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِتْنَةً فَقَرَّبَهَا قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَنْ خَيْرُ النَّاسِ فِيهَا؟ قَالَ: «رَجُلٌ فِي مَاشِيَتِهِ يُؤَدِّي حَقَّهَا وَيَعْبُدُ رَبَّهُ، وَرَجُلٌ آخِذٌ بِرَأْسِ فَرَسِهِ يُخِيفُ العَدُوَّ وَيُخِيفُونَهُ».

ئوم مالیکی بەهزییە رضي الله عنها دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ باسی بەڵایەکی کرد، جا بۆمانی نزیک خستەوە، گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا کێ لەو کاتە باشترین خەڵکە؟ فەرمووی: «کەسێک لەنێو مەڕوماڵاتی بێت، مافی خۆی لێ بدات و بەندایەتی خوا

بکات، کەسێکی دیکە سەری ئەسپەکەی (سوارەکەی) گرتووە، کە ترس دەخاتە دڵی دوژمن، ئەوانیش ترس دەخەنە دڵی (لە ڕووبەڕووبوونەوەدایە))).

## بَابُ مَا جَاءَ لَتَرْكَبُنَّ سُنَنَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ

### باسی ئەوەی هاتووە بەدوای ڕێچکەی ئەوانەی پێش خۆتان دەکەون

٤٩٢. عَنْ أَبِي وَاقِدٍ اللَّيْثِيِّ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لَمَّا خَرَجَ إِلَى حُنَيْنٍ مَرَّ بِشَجَرَةٍ لِلْمُشْرِكِينَ يُقَالُ لَهَا: ذَاتُ أَنْوَاطٍ يُعَلِّقُونَ عَلَيْهَا أَسْلِحَتَهُمْ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، اجْعَلْ لَنَا ذَاتَ أَنْوَاطٍ كَمَا لَهُمْ ذَاتُ أَنْوَاطٍ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «سُبْحَانَ اللَّهِ هَذَا كَمَا قَالَ قَوْمُ مُوسَى ﵇: {اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ} الأعراف: ١٣٨، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَتَرْكَبُنَّ سُنَّةَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ».

ئەبو واقیدی لەیسی ﵁ دەگێڕێتەوە: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچوو بۆ حونەین بەلای دارێکی بێباوەڕان تێپەڕ بوو پێی دەگوترا: زاتو ئەنوات، خەڵکی چەکی خۆیانیان پێ هەڵدەواسی، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، دە بۆ ئێمەش دارێک دیاری بکە هەر وەک چۆن ئەوان داری زاتو ئەنواتیان هەیە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «پاکی و بێگەردی بۆ خوا، ئەوەی گوتتان هاوشێوەی وتەکەی گەلی مووسایە ﵇، کاتێك گوتیان: {اجْعَلْ لَنَا إِلَهًا كَمَا لَهُمْ آلِهَةٌ}، واتە: خواوەندێکمان بۆ دیاری بکە هەر وەک چۆن ئەوان خواوەندیان هەیە، سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە خۆتان دەخەنە سەر ڕێچکەی ئەوانەی پێش خۆتان (بەو جۆرە کارانە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَلَامِ السِّبَاعِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گفتوگۆکردنی دڕندەکان

٤٩٣. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ

لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُكَلِّمَ السِّبَاعُ الإِنْسَ، وَحَتَّى تُكَلِّمَ الرَّجُلَ عَذَبَةُ سَوْطِهِ وَشِرَاكُ نَعْلِهِ وَتُخْبِرَهُ فَخِذُهُ بِمَا أَحْدَثَ أَهْلُهُ مِنْ بَعْدِهِ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستە ڕۆژی دوایی نایەت تا کاتێک دڕندە گفتۆگۆ دەکەن لەگەڵ ئادەمیزاد، هەروەها تا پیاوێک قامچییەکەی دەستی و قەیتانی نەعلەکەی و لاڕانەکەی هەواڵی پێ دەدەن کە خانەوادەکەی لەدوای ئەو چی کردووە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي انْشِقَاقِ القَمَرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی لەتبوونی مانگ

٤٩٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: انْفَلَقَ القَمَرُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اشْهَدُوا».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ مانگ لەت بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ببینن (چی ڕووی دا و ببنە شاهید بەسەر ڕووداوەکە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الخَسْفِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕۆچوون

٤٩٥. عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ أَسِيدٍ ﷺ قَالَ: أَشْرَفَ عَلَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ غُرْفَةٍ وَنَحْنُ نَتَذَاكَرُ السَّاعَةَ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَرَوْا عَشْرَ آيَاتٍ: طُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا، وَيَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ، وَالدَّابَّةَ، وَثَلَاثَةَ خُسُوفٍ: خَسْفٌ بِالمَشْرِقِ، وَخَسْفٌ بِالمَغْرِبِ، وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ العَرَبِ، وَنَارٌ تَخْرُجُ مِنْ قَعْرِ عَدَنَ تَسُوقُ النَّاسَ أَوْ تَحْشُرُ النَّاسَ، فَتَبِيتُ مَعَهُمْ حَيْثُ بَاتُوا، وَتَقِيلُ مَعَهُمْ حَيْثُ قَالُوا».

حوزەیفەی کوڕی ئەسید ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەری کردینەوە لە ژوورێک، لە کاتێک ئێمە باسی ڕۆژی دواییمان دەکرد، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «قیامەت نایەت تا دە نیشانە دەبینن: دەرکەوتنی خۆر لە خۆرئاواوە، یەئجوج و مەئجووج، دەرکەوتنی چوار پەلەکە، بینینی سێ ڕۆچوون: ڕۆچوونێک لە خۆرهەڵات، ڕۆچوونێک لە خۆرئاوا، ڕۆچوونێک لە دوورگەی عەرەب، دەرکەوتنی ئاگرێک لە قوڵایی شاری عەدەن کە خەڵکی دەداتە پێش خۆی یان خەڵکی کۆ دەکاتەوە، لەکاتی شەو لەگەڵیان دەبێت لە هەر کوێ مانەوە، لە کاتی نیوەڕۆش لەگەڵیان دەبێت لە هەر کوێ مانەوە (بەردەوام لەگەڵیان دەبێت)».

٤٩٦. عَنْ صَفِيَّةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَنْتَهِي النَّاسُ عَنْ غَزْوِ هَذَا البَيْتِ حَتَّى يَغْزُوَ جَيْشٌ، حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالبَيْدَاءِ أَوْ بِبَيْدَاءَ مِنَ الأَرْضِ خُسِفَ بِأَوَّلِهِمْ وَآخِرِهِمْ وَلَمْ يَنْجُ أَوْسَطُهُمْ»، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَمَنْ كُرِهَ مِنْهُمْ؟ قَالَ: «يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ عَلَى مَا فِي أَنْفُسِهِمْ».



صەفیە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خەڵکی دەست هەڵناگرن لە هێرشکردنە سەر کەعبەی پیرۆز، تا لەشکرێک هێرش دەکات تا دەگەنە دەشتاییەک لەو خاکەدا، سەرەتا و کۆتایی لەشکرەکە بە زەویدا دەچێتە خوار، کەس لە نێوەندەکەش دەرناچێت»، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کەسەش کە بەزۆر هێنراوە بۆ نێو لەشکرەکە؟ فەرمووی: «خوای گەورە زیندووویان دەکاتەوە لەسەر ئەوەی لە دڵیاندایە (نیاز و مەبەستیان)».

٤٩٧. عَنْ عَائِشَةَ ﷺ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَكُونُ فِي آخِرِ هَذِهِ الْأُمَّةِ خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ»، قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصَّالِحُونَ؟ قَالَ: «نَعَمْ إِذَا ظَهَرَ الخُبْثُ».

عائیشە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە کۆتایی ئەم ئوممەتە ڕۆچوون و ڕوخسار گۆڕان و بەردبارین ڕوو دەدات»، عائیشە گوتی: گوتم: ئەی

پێغەمبەری خوا لەناو دەچین لە کاتێکدا کەسانی چاکەکارمان لەنێودایە؟ فەرمووی: «بەڵێ ئەگەر خراپە بەئاشکرا دەرکەوت و زاڵ بوو».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي طُلُوعِ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەرکەوتنی خۆر لەو شوێنەی کە لێی ئاوا بووە

٤٩٨. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ قَالَ: دَخَلْتُ المَسْجِدَ حِينَ غَابَتِ الشَّمْسُ وَالنَّبِيُّ ﷺ جَالِسٌ، فَقَالَ: «يَا أَبَا ذَرٍّ، أَتَدْرِي أَيْنَ تَذْهَبُ هَذِهِ؟»، قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: «فَإِنَّهَا تَذْهَبُ تَسْتَأْذِنُ فِي السُّجُودِ فَيُؤْذَنُ لَهَا وَكَأَنَّهَا قَدْ قِيلَ لَهَا اطْلُعِي مِنْ حَيْثُ جِئْتِ فَتَطْلُعُ مِنْ مَغْرِبِهَا». قَالَ: ثُمَّ قَرَأَ: «{وَذَلِكَ مُسْتَقَرٌّ لَهَا} يس: ٣٨».

ئەبو زەڕ ﷺ دەڵێت: چوومە مزگەوت لەو کاتەی کە خۆر ئاوا بووبوو و پێغەمبەریش ﷺ دانیشتبوو، فەرمووی: «ئەی ئەبو زەڕ، ئایا دەزانیت ئەمە بۆ کوێ دەڕوات؟»، گوتم: خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرمووی: «ئەوە دەڕوات داوای ڕێپێدان دەکات بۆ سوجدەبردن، جا ڕێی پێ دەدرێت، هەر وەک پێی بگوترێت دەرکەوە هەر لەو شوێنەی کە لێی هاتوویت، جا (لە ڕۆژی دوایی) لەو شوێنەی کە لێی ئاوا بووە دەردەکەوێت». ئەبو زەڕ دەڵێت: پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە: «{وَذَلِكَ مُسْتَقَرٌّ لَهَا}».



## بَابٌ فِي صِفَةِ المَارِقَةِ

### باسێک لەبارەی خەسڵەتی کەسانی دەرچوو لە ڕاستەڕێی ئیسلام

٤٩٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَخْرُجُ فِي آخِرِ الزَّمَانِ قَوْمٌ أَحْدَاثُ الأَسْنَانِ سُفَهَاءُ الأَحْلَامِ، يَقْرَءُونَ القُرْآنَ، لَا يُجَاوِزُ تَرَاقِيَهُمْ، يَقُولُونَ مِنْ قَوْلِ خَيْرِ البَرِيَّةِ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە کۆتایی زەمەن خەڵکانێک دەردەکەون ددانیان تازەیە، سادەن لە بیرکردنەوە و لێکدانەوە، قورئان دەخوێنن بەڵام لە گەردنیان بەرز نابێتەوە، دەدوێن بە فەرموودەی چاکترین خەڵک (کە پێغەمبەری خوایە ﷺ)، لە ئیسلام دەردەچن هەر وەک چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت».

## بَابُ مَا جَاءَ سَتَكُونُ فِتَنٌ كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕوودانی ئاژاوەیەک کە وەک شەوی تاریک وایە

٥٠٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «بَادِرُوا بِالأَعْمَالِ فِتَنًا كَقِطَعِ اللَّيْلِ الْمُظْلِمِ يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤْمِنًا وَيُمْسِي كَافِرًا، وَيُمْسِي مُؤْمِنًا وَيُصْبِحُ كَافِرًا، يَبِيعُ دِينَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنْيَا».



ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «پەلە و دەستپێشخەری بکەن بە کاری چاکە پێش هاتنی بەڵا و ئاژاوەکان (ئەوەندە ئاڵۆز و تێکەڵە)، وەک شەوی تاریک وایە کە ناڕوونە، بەیانی دادێت کەسێک بڕوادارە، بەڵام کە ئێوارەی بەسەردا دێت بێباوەڕە، ئێوارەی بەسەردا دێت بڕوادارە، بەڵام کە بەیانی بەسەردا دێت بووەتە بێباوەڕ، باوەڕی خۆی دەفرۆشێت بە شتێکی دونیا».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَشْرَاطِ السَّاعَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نیشانەکانی قیامەت

٥٠١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: أُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ لَا يُحَدِّثُكُمْ أَحَدٌ بَعْدِي أَنَّهُ سَمِعَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ

مِنْ أَشْرَاطِ السَّاعَةِ: أَنْ يُرْفَعَ العِلْمُ، وَيَظْهَرَ الجَهْلُ، وَيَفْشُوَ الزِّنَا، وَتُشْرَبَ الخَمْرُ، وَيَكْثُرَ النِّسَاءُ، وَيَقِلَّ الرِّجَالُ حَتَّى يَكُونَ لِخَمْسِينَ امْرَأَةٍ قَيِّمٌ وَاحِدٌ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: فەرموودەیەکتان بۆ باس دەکەم کە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە کە دوای من کەس نەبێت بۆتانی باس بکات کە ڕاستەخۆ لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستبێت (تەنها من بیستوومە لێی)، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «لە نیشانەکانی ڕۆژی دوایی: زانست بەرز دەکرێتەوە، نەزانین سەر هەڵدەدات، داوێنپیسی بڵاو دەبێتەوە، مەی دەخورێتەوە، ژمارەی ئافرەتان زۆر دەبێت، ژمارەی پیاوان کەم دەبێت بە جۆرێکی وا کە هەر بۆ پەنجا ئافرەت (پیاوێک) بەئەرکیان هەڵبستێت».

٥٠٢. عَنِ الزُّبَيْرِ بْنِ عَدِيٍّ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ فَشَكَوْنَا إِلَيْهِ مَا نَلْقَى مِنَ الحَجَّاجِ، فَقَالَ: «مَا مِنْ عَامٍ إِلَّا وَالَّذِي بَعْدَهُ شَرٌّ مِنْهُ حَتَّى تَلْقَوْا رَبَّكُمْ»، سَمِعْتُ هَذَا مِنْ نَبِيِّكُمْ ﷺ.

زوبەیری کوڕی عەدی ﵁ دەڵێت: چووینە لای ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ شکایەتمان لەلای کرد سەبارەت بە ڕەفتارەکانی حەججاج کە بەرانبەرمان دەیکات (لە ستەم و کوشتن) لە وەڵامدا گوتی: ساڵ بەدوای ساڵ خراپتر دەبێت تا دەگەنەوە لای پەروەردگارتان، ئا ئەمەم لە پێغەمبەرەکەتان ﷺ بیستووە.

٥٠٣. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «فِي هَذِهِ الأُمَّةِ خَسْفٌ وَمَسْخٌ وَقَذْفٌ»، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ المُسْلِمِينَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَمَتَى ذَاكَ؟ قَالَ: «إِذَا ظَهَرَتِ القَيْنَاتُ وَالمَعَازِفُ وَشُرِبَتِ الخُمُورُ».

عیمرانی کوڕی حوصەین ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لەنێو ئوممەتەکەم ڕۆچوونی زەویی و گۆڕانی شکڵ و شێوە و بەردبارانکردن سەر هەڵدەدەن»، پیاوێک لە موسوڵمانان گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە کەی ڕوو دەدات؟ فەرمووی: «ئەگەر کۆڕ و دانیشتن ساز کرا بۆ ئافرەتانی گۆرانیبێژ و لێدانی

مۆسیقا و خواردنەوەی مەی».

## بَابُ مَا جَاءَ لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَخْرُجَ كَذَّابُونَ

### باسی ئەوەی هاتووە ڕۆژی دوایی ڕوو نادات تا دەرکەوتنی درۆزنەکان

٥٠٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَنْبَعِثَ دَجَّالُونَ كَذَّابُونَ قَرِيبٌ مِنْ ثَلَاثِينَ كُلُّهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕۆژی دوایی ڕوو نادات تا چەند فێڵبازێکی درۆزن دەردەکەون، ژمارەیان نزیکی سی فێڵباز دەبێت، هەموویان بانگەشەی ئەوە دەکەن کە پێغەمبەری خوان».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْأَئِمَّةِ الْمُضِلِّينَ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێشەوایانی گومڕاکار

٥٠٥. عَنْ ثَوْبَانَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا أَخَافُ عَلَى أُمَّتِي الْأَئِمَّةَ الْمُضِلِّينَ»، قَالَ: وَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي عَلَى الحَقِّ ظَاهِرِينَ لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ يَخْذُلُهُمْ حَتَّى يَأْتِيَ أَمْرُ اللَّهِ».

سەوبان ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی لە (داهاتووی) ئوممەتەکەم دەترسم (لەبەر)پێشەوایانی گومڕاکار»، (سەوبان ﵁) دەشڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەردەوام کۆمەڵێک لە ئوممەتەکەم لەسەر ڕێگای ڕاستن، ئەوەی پشتیان نەگرێت و بەرگرییان لێ نەکات زیانیان پێ ناگەیێنێت، تا کاتی هاتنی فەرمانی خوا».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي المَهْدِيِّ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی مەهدی

٥٠٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَذْهَبُ الدُّنْيَا حَتَّى يَمْلِكَ العَرَبَ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي يُوَاطِئُ اسْمُهُ اسْمِي».

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دونیا کۆتایی پێ نایەت تا کەسێک دەسەڵاتی عەرەبی دەکەوێتە دەست، ئەو کەسە لە خانەوادەی منە و ناوی وەکوو ناوی منە».

## بَابُ مَا جَاءَ مِنْ أَيْنَ يَخْرُجُ الدَّجَّالُ



### باسی ئەوەی هاتووە کەوا دەججال لەکوێ دەردەکەوێت

٥٠٧. عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﵁ قَالَ: حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الدَّجَّالُ يَخْرُجُ مِنْ أَرْضٍ بِالمَشْرِقِ يُقَالُ لَهَا: خُرَاسَانُ، يَتْبَعُهُ أَقْوَامٌ كَأَنَّ وُجُوهَهُمُ المَجَانُّ المُطْرَقَةُ».

ئەبو بەکری صددیق ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی باس کردین و فەرمووی: «دەجالی فێڵباز لە خاکێک دەردەکەوێت لە ڕۆژهەڵات پێی دەگوترێت: خۆڕاسان، خەڵکانێک بەدوای دەکەون شێوەی ڕوخساریان وەک قەڵغان (خڕ و پانە)، پێستەیان بەسەر یەکەوەیە (چڕ و بەگۆشتە)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ الدَّجَّالِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تایبەتمەندیی دەججال

٥٠٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الدَّجَّالِ، فَقَالَ: «أَلَا إِنَّ رَبَّكُمْ

لَيْسَ بِأَعْوَرَ أَلَا وَإِنَّهُ أَعْوَرُ عَيْنُهُ الْيُمْنَى كَأَنَّهَا عِنَبَةٌ طَافِيَةٌ».

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرا سەبارەت بە دەججال، فەرمووی: «ئاگادار بن خوای پەروەردگارتان نابینا نییە، ئاگادار بن کوێرە و چاوی ڕاستەی شێوەی وەک ترێ وایە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الدَّجَّالِ لَا يَدْخُلُ الْمَدِينَةَ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەججال کە ناتوانێت بچێتە شاری مەدینەوە

٥٠٩. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَأْتِي الدَّجَّالُ الْمَدِينَةَ فَيَجِدُ الْمَلَائِكَةَ يَحْرُسُونَهَا فَلَا يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ وَلَا الدَّجَّالُ إِنْ شَاءَ اللَّهُ».

ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دەججال ڕوو دەکاتە شاری مەدینەی پیرۆز، دەبینێت فریشتەکان پاسەوانیی لێ دەکەن، (شاری مەدینە) بە ویستی خوای گەورە نەخۆشی تاعوون و دەججال ناچنە نێوی».



# أَبْوَابُ الْرِؤيا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## كۆباسی خەون لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ أَنَّ رِؤيا المُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنَ النُّبُوَّةِ

باسی ئەوەی کە خەونی بڕوادار بەشێکە لە چل و شەش بەشی پێغەمبەرایەتی



٥١٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رِؤيا المُؤْمِنِ تَكْذِبُ، وَأَصْدَقُهُمْ رِؤيا أَصْدَقُهُمْ حَدِيثًا».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر ڕۆژی دوایی نزیک بوویەوە، وا خەریکە خەونی بڕوادار بە ناڕاست دەرنەچێت، ڕاستترین خەون خەونی ڕاستگۆترین کەسە لە وتەکانی».

### بَابُ ذَهَبَتِ النُّبُوَّةُ وَبَقِيَتِ المُبَشِّرَاتُ

باسی پێغەمبەرایەتی کۆتایی هاتووە و خەونی مژدەبەخش ماوە

٥١١. عَنْ أَنَسِ بْنُ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الرِّسَالَةَ وَالنُّبُوَّةَ قَدْ

انْقَطَعَتْ فَلَا رَسُولَ بَعْدِي وَلَا نَبِيَّ»، قَالَ: فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: «لَكِنِ الْمُبَشِّرَاتُ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ؟ قَالَ: «رُؤْيَا الْمُسْلِمِ، وَهِيَ جُزْءٌ مِنْ أَجْزَاءِ النُّبُوَّةِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی پەیامی خوا و پێغەمبەرایەتی پچڕاوە و کۆتایی پێ هاتووە، هیچ ڕەوانەکراو و پێغەمبەرێک لەدوای منەوە نییە»، جا خەڵکی ئەوە دڵی تەنگ کردن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «بەڵام موژدەدەرەکان (دەمێنن)»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو موژدەدەرانە چین؟ فەرمووی: «خەونی کەسێکی موسوڵمانە، کە بەشێکە لە بەشەکانی پێغەمبەرایەتی».

## بَابُ إِذَا رَأَى فِي الْمَنَامِ مَا يَكْرَهُ مَا يَصْنَعُ



### باسی ئەگەر کەسێک خەونێکی بینی لەلای ناخۆش بوو چی بکات

٥١٢. عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ﷺ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «الرُّؤْيَا مِنَ اللَّهِ وَالْحُلْمُ مِنَ الشَّيْطَانِ، فَإِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ شَيْئًا يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عَنْ يَسَارِهِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ، وَلْيَسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنْ شَرِّهَا فَإِنَّهَا لَا تَضُرُّهُ».

ئەبو قەتادە ﷺ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «خەونی ڕاست لە خواوەیە، خەونی ناخۆش لە شەیتانەوەیە، ئەگەر کەسێک لە ئێوە خەونێکی ناخۆشی بینی، با سێ جاران فوو بکاتە لای چەپی، پەنا بە خوا بگرێت لە زیانی خەونەکە، ئەمە وا دەکات زیانی پێ نەگات».

## بَابٌ فِي الَّذِي يَكْذِبُ فِي حُلْمِهِ

### باسێک لەبارەی ئەو کەسەی درۆ بکات لە (گێڕانەوەی) خەونەکەی

٥١٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ تَحَلَّمَ كَاذِبًا كُلِّفَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ وَلَنْ يَعْقِدَ بَيْنَهُمَا».

ئیبن عەبباس ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە (گێڕانەوەی) خەونەکەیدا درۆ بکات (بڵێت: فڵان شتم بینی لە خەوندا و نەشیبینێت)، ڕۆژی دوایی داوای لێ دەکرێت دوو دەنکە جۆ گرێ بدات، ناشتوانێت گرێیان بدات (ئەزیەت دەدرێت)».

## بَابٌ فِي رِؤيا النَّبِيِّ ﷺ اللَّبَنَ وَالقُمُص



### باسێك لەبارەی خەونبینینی پێغەمبەر ﷺ بە شیر و كراس

٥١٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ إِذْ أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ فَشَرِبْتُ مِنْهُ، ثُمَّ أَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ»، قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «العِلْمَ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «لە کاتێک کە لە خەودا بووم، قاپێک لە شیریان پێ دام و لێم خواردەوە، ئینجا ئەوەی لێی مایەوە بەرماوەکەم دا بە عومەری کوڕی خەتتاب»، گوتیان: چۆن خەونەکەت لێک دەدەیەوە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: «زانینە (واتە شیرەکە زانینی بەسوودە)».

٥١٥. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ بْنِ سَهْلِ بْنِ حُنَيْفٍ ﵁ عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «بَيْنَا أَنَا نَائِمٌ رَأَيْتُ النَّاسَ يُعْرَضُونَ عَلَيَّ وَعَلَيْهِمْ قُمُصٌ مِنْهَا مَا يَبْلُغُ

الثُّدِيَّ، وَمِنْهَا مَا يَبْلُغُ أَسْفَلَ مِنْ ذَلِكَ فَعُرِضَ عَلَيَّ عُمَرُ وَعَلَيْهِ قَمِيصٌ يَجُرُّهُ»، قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «الدِّينَ».

ئەبو ئومامەی کوڕی سەهلی کوڕی حونەیف ﷺ لە هەندێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «لە کاتێکدا کە لە خەودا بووم، چاوم بە کۆمەڵێک کەس کەوت و نیشانیان دەدام، کراسیان لەبەر بوو، جا هەبوو کراسەکەی تا سینگی بوو، هەبوو لە خوارتر بوو، عومەرم نیشان درا کراسێکی وا درێژی لەبەر بوو، بەدوای خۆی ڕایدەکێشا»، جا هاوەڵان گوتیان: ئەمە بە چی لێک دەدەیتەوە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: «بە دینداری».

٥١٦. عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا صَلَّى بِنَا الصُّبْحَ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ بِوَجْهِهِ وَقَالَ: «هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمُ اللَّيْلَةَ رُؤْيَا؟».

سەمورەی کوڕی جوندەب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر نوێژی بەیانی کردبایە، ڕووی لە خەڵکی دەکرد و دەیفەرموو: «ئایا کەس لە ئێوە ئەمشەو هیچ خەونێکی بینیوە؟».

# أَبْوَابُ الشَّهَادَاتِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی شایەتیدان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ



### بَابُ مَا جَاءَ فِي الشُّهَدَاءِ أَيُّهُمْ خَيْرٌ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چ جۆرە شایەتیدەرێک چاکترە

٥١٧.عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الجُهَنِيِّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرِ الشُّهَدَاءِ؟ الَّذِي يَأْتِي بِالشَّهَادَةِ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلَهَا».

زەیدی کوڕی خالیدی جوهەنی ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئایا هەواڵتان پێ بدەم دەربارەی باشترین شایەتیدەر؟ ئەو کەسەیە کە شایەتی دەدا (لەپێناو خوا) پێش ئەوەی داوای لێ بکرێت».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي شَهَادَةِ الزُّورِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی شایەتیدانی درۆ

٥١٨. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «خَيْرُ النَّاسِ

قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثَلَاثًا، ثُمَّ يَجِيءُ قَوْمٌ مِنْ بَعْدِهِمْ يَتَسَمَّنُونَ وَيُحِبُّونَ السِّمَنَ يُعْطُونَ الشَّهَادَةَ قَبْلَ أَنْ يُسْأَلُوهَا».

عیمرانی کوڕی حوصەین ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «چاکترین کەس خەڵکی سەردەمی منن، ئینجا ئەوانەی دوای ئەو، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان، سێ جار ئەوەی فەرموو، ئینجا لەدوای ئەوان کەسانێک دێن خۆیان قەڵەو دەکەن، حەزیان لە چەورییە، شایەتی دەدەن پێش ئەوەی داوایان لێ بکرێت». (ڕوونکردنەوەی دەوێ تا لەگەڵ فەرموودەی پێشووتر تێکنەگیرێن!!).



# أبْوَابُ الزُّهْدِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی زوهد لە پێغەمبەری خواوە ﷺ



### بَابٌ: الصِّحَّةُ وَالفَرَاغُ نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ

باسێک: لەشساغی و دەستبەتاڵی دوو ناز و نیعمەتن
زۆربەی خەڵکی زەرەرمەندن تێیاندا

٥١٩. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «نِعْمَتَانِ مَغْبُونٌ فِيهِمَا كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ الصِّحَّةُ وَالفَرَاغُ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دوو ناز و نیعمەت هەن کە خەڵکێکی زۆر لێیان بێئاگان و زەرەرمەندن تێیاندا: لەشساغی و دەستبەتاڵی».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي إِنْذَارِ النَّبِيِّ ﷺ قَوْمَهُ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ بۆ گەلەکەی

٥٢٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: {وَأَنْذِرْ عَشِيرَتَكَ الأَقْرَبِينَ} الشعراء: ٢١٤، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا صَفِيَّةُ بِنْتَ عَبْدِ المُطَّلِبِ، يَا فَاطِمَةُ بِنْتَ

مُحَمَّدٍ، يَا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا، سَلُونِي مِنْ مَالِي مَا شِئْتُمْ».

عائیشه ﵂ دەڵێت: کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی: {وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ}، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەی صەفیەی کچی عەبدولموتەلیب، ئەی فاتیمەی کچی موحەممەد، ئەی بەنو عەبدولموتەلیب، بزانن کە هیچم پێ ناکرێت بۆتان بەرانبەر بە خوای گەورە، ئەوەی دەتانەوێت لە ماڵەکەم داوام لێ بکەن (بەڵام لای خوا هیچم پێ ناکرێت بۆتان گەر باوەڕ نەهێنن)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الْبُكَاءِ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی گریان لە ترسی خوا

٥٢١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَلِجُ النَّارَ رَجُلٌ بَكَى مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ حَتَّى يَعُودَ اللَّبَنُ فِي الضَّرْعِ، وَلَا يَجْتَمِعُ غُبَارٌ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَدُخَانُ جَهَنَّمَ».



ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ناخرێتە نێو ئاگر ئەو کەسەی لە ترسی خوا گریابێت مەگەر شیری دۆشراو بگەڕێتەوە نێو گوانەکان (کە ناشگەڕێتەوە)، لەگەڵ یەکدی کۆ نابنەوە تۆز و غوبارێک لەپێناو خوا بەریکەوتبێت لەگەڵ دووکەڵی ئاگری دۆزەخ (واتە: موجاهید لە مەیدانی جەنگدا)».

## بَابٌ فِي قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: «لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا»

### باسێک دەربارەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ:
### «ئەگەر ئەوە بزانن کە من دەیزانم کەم پێ دەکەنن»

٥٢٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ

قَلِيلاً وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر ئەوە بزانن کە من دەیزانم، کەم پێدەکەنن زۆر دەگرین».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي هَوَانِ الدُّنْيَا عَلَى اللَّهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بێنرخیی دونیا لەلای خوای گەورە

٥٢٣. عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللَّهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ».

سەهلی کوڕی سەعد ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر دونیا نرخی باڵێکی مێشوولەی هەبووایە لەلای خوای، ڕێی نەدەدا بە هیچ بێباوەڕێک قومە ئاوێکی لێ بخواتەوە».



## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَجَنَّةُ الكَافِرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دونیا بەندیخانەی بڕوادارە و بەهەشتی بێباوەڕە

٥٢٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَجَنَّةُ الكَافِرِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دونیا بەندیخانەی بڕوادارە و بەهەشتی بێباوەڕە».

## بَابُ مَا جَاءَ مَثَلُ الدُّنْيَا مَثَلُ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ

### باسی ئەوەی هاتووە کە نموونەی دونیا وەک نموونەی چوار کەسە

٥٢٥. عَنْ أَبِي كَبْشَةَ الأَنَّمَارِيُّ رضي الله عنه: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «ثَلَاثَةٌ أُقْسِمُ عَلَيْهِنَّ وَأُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا فَاحْفَظُوهُ»، قَالَ: «مَا نَقَصَ مَالُ عَبْدٍ مِنْ صَدَقَةٍ، وَلَا ظُلِمَ عَبْدٌ مَظْلِمَةً فَصَبَرَ عَلَيْهَا إِلَّا زَادَهُ اللَّهُ عِزًّا، وَلَا فَتَحَ عَبْدٌ بَابَ مَسْأَلَةٍ إِلَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ بَابَ فَقْرٍ -أَوْ كَلِمَةً نَحْوَهَا-، وَأُحَدِّثُكُمْ حَدِيثًا فَاحْفَظُوهُ»، قَالَ: «إِنَّمَا الدُّنْيَا لِأَرْبَعَةِ نَفَرٍ، عَبْدٍ رَزَقَهُ اللَّهُ مَالاً وَعِلْمًا فَهُوَ يَتَّقِي فِيهِ رَبَّهُ، وَيَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ، وَيَعْلَمُ لِلَّهِ فِيهِ حَقًّا، فَهَذَا بِأَفْضَلِ المَنَازِلِ، وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللَّهُ عِلْمًا وَلَمْ يَرْزُقْهُ مَالاً فَهُوَ صَادِقُ النِّيَّةِ يَقُولُ: لَوْ أَنَّ لِي مَالاً لَعَمِلْتُ بِعَمَلِ فُلَانٍ فَهُوَ بِنِيَّتِهِ فَأَجْرُهُمَا سَوَاءٌ، وَعَبْدٍ رَزَقَهُ اللَّهُ مَالاً وَلَمْ يَرْزُقْهُ عِلْمًا، فَهُوَ يَخْبِطُ فِي مَالِهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ لَا يَتَّقِي فِيهِ رَبَّهُ، وَلَا يَصِلُ فِيهِ رَحِمَهُ، وَلَا يَعْلَمُ لِلَّهِ فِيهِ حَقًّا، فَهَذَا بِأَخْبَثِ المَنَازِلِ، وَعَبْدٍ لَمْ يَرْزُقْهُ اللَّهُ مَالاً وَلَا عِلْمًا فَهُوَ يَقُولُ: لَوْ أَنَّ لِي مَالاً لَعَمِلْتُ فِيهِ بِعَمَلِ فُلَانٍ فَهُوَ بِنِيَّتِهِ فَوِزْرُهُمَا سَوَاءٌ».

ئەبو کەبشەی ئەنماری رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «سێ شت هەن سوێندیان لەسەر دەخۆم وفەرموودەیەکیشتان بۆ باس دەکەم، جا وەریگرن و دەرخی بکەن»، فەرمووی: «(سێ شتەکە ئەوانەن:) ماڵ و سامانی هیچ بەندەیەک بەهۆی بەخشین لەپێناو خوا کەم ناکات، بەندەیەک ستەمی لێ کرا لە هەر جۆرە ستەمێک و ئارامی لەسەر گرت، مسۆگەر خوای گەورە پایەداریی بۆ زیاد دەکات، هەر بەندەیەک دەرگای سواڵکردنی لە خۆ کردەوە (سواڵ بکات)، بێگومان خوای گەورە دەرگای هەژاری بەسەردا دەکاتەوە -یان وشەیەکی هاوشێوەی ئەمەی فەرموو-، هەروەها باسی فەرموودەیەکتان بۆ دەکەم بیپارێزن و دەرخی بکەن»، فەرمووی: «بزانن بەڕاستی دونیا بۆ چوار جۆرە کەسە، بەندەیەک خوای گەورە ماڵ و زانستی پێ داوە، ئەو بەندەیە (بەو

نیعمەتانە) مافی خوای لێ دەپارێزێت، چاکە لەگەڵ خزمان دەکات، دەشزانێت خوا مافی بەسەرەوە هەیە، ئەو کەسە چاکترین پلەی هەیە، بەندەیەکی دیکە خوا زانستی پێ داوە، ماڵ و سامانی پێ نەبەخشیوە، بەڵام ڕاستگۆیە لە نیەت و مەبەستی (لەگەڵ خوا) و دەڵێت: ئەگەر ماڵ و سامانم هەبووایە کاری چاکەم پێ دەکرد وەکوو فلان کەس، ئەو بەهۆی نیەتەکەی لەگەڵ (بەندەی یەکەم) لە پاداشت وەک یەک وان، بەندەیەک خوای گەورە ماڵ و سامانی پێ داوە، بەڵام زانستی پێ نەداوە، ماڵەکەی خەرج دەکات بەنەزانی (گوێ نادات بە حەڵاڵ و حەرام)، خۆی لە قەدەغەکراوی خوا ناپارێز یت، مافی خزمانی لێ نادات لە چاکەکردن لەگەڵیاندا، ناشزانێت لەو ماڵە هەقی خوای لەسەرە (بە هیی خۆی دەزانێت)، ئا ئەوە خراپترین پلەی هەیە لەلای خوا، بەندەیەک خوای گەورە نە ماڵی پێ داوە نە زانست، دەڵێت: ئەگەر هاتو ماڵم هەبووایە وەک فلان کەسم دەکرد (خەرجکردن لە حەرامدا)، ئەوە بەهۆی نیەتەکەی (لەگەڵ بەندەی سێیەم) لە تاوان وەک یەک وان».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي طُولِ العُمْرِ لِلْمُؤْمِنِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تەمەندرێژیی بۆ بڕوادار

٥٢٦.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ ﵁: أَنَّ أَعْرَابِيًّا قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ خَيْرُ النَّاسِ؟ قَالَ: «مَنْ طَالَ عُمُرُهُ، وَحَسُنَ عَمَلُهُ».

عەبدوڵڵای کوڕی بوسر ﵁ دەگێڕێتەوە: دەشتەکییەک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کێ چاکترینی خەڵکە؟ فەرمووی: «چاکترین کەس ئەو کەسەیە کە تەمەنی درێژ بێت و کاری چاک بێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَقَارُبِ الزَّمَانِ وَقِصَرِ الأَمَلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نزیکبوونەوەی کات و کورتیی هیوا

٥٢٧. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى يَتَقَارَبَ الزَّمَانُ، فَتَكُونُ السَّنَةُ كَالشَّهْرِ، وَالشَّهْرُ كَالْجُمُعَةِ، وَتَكُونُ الْجُمُعَةُ كَالْيَوْمِ، وَيَكُونُ الْيَوْمُ كَالسَّاعَةِ، وَتَكُونُ السَّاعَةُ كَالضَّرَمَةِ بِالنَّارِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕۆژی دوایی ڕوو نادات تا کات لەیەکدی نزیک دەبێتەوە (بەرەکەتی نامێنێت)، ماوەی ساڵێک دەبێتە یەک مانگ، ماوەی مانگێک وەک یەک هەفتە دەبێت، هەفتەیەک ماوەکەی وەک یەک ڕۆژ دەبێت، یەک ڕۆژ ماوەکەی وەک کاتژمێرێک دەبێت، کا ژمێرێک وەک ئاگرکەوتنەوەیەک دەبێت».



## بَابُ مَا جَاءَ لَوْ كَانَ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ مَالٍ لَابْتَغَى ثَالِثًا

### باسی ئەوەی هاتووە ئەگەر ئادەمیزاد دوو دۆڵی هەبێت لە ماڵ، هەوڵ دەدات دۆڵی سێیەمیشی هەبێت

٥٢٨. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ كَانَ لِابْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ ذَهَبٍ لَأَحَبَّ أَنْ يَكُونَ لَهُ ثَالِثٌ، وَلَا يَمْلَأُ فَاهُ إِلَّا التُّرَابُ، وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ تَابَ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر ئادەمیزاد دوو دۆڵی پڕ لە زێڕی هەبێت، حەز دەکات دۆڵی سێیەمیشی هەبێت، هیچ شتێک دەم و حەزی ئادەمیزاد پڕ ناکات تەنیا خۆڵ نەبێت (بەخاکسپاردن)، بێگومان خوا پەشیمانیی تۆبەکارانیش قبووڵ دەکات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي قَلْبُ الشَّيْخِ شَابٌّ عَلَى حُبِّ اثْنَتَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دڵی مرۆڤی بەتەمەن
### لە خۆشەویستی دوو شت گەنجە و پیر نابێت

٥٢٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «قَلْبُ الشَّيْخِ شَابٌّ عَلَى حُبِّ اثْنَتَيْنِ: طُولِ الحَيَاةِ وَكَثْرَةِ المَالِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: « دڵی مرۆڤی پیر و بەتەمەن لە خۆشەویستی دوو شتدا گەنجە و پیر نابێت: لە خۆشەویستی بۆ ژیان و مانەوە لە دونیادا، لە (حەزکردن و خۆشویستنی) زۆری سەروەت و سامان».



## بَابٌ فِي التَّوَكُّلِ عَلَى اللَّهِ

### باسێک دەربارەی پشتبەستن بە خوا

٥٣٠. عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَوَكَّلُونَ عَلَى اللَّهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ لَرُزِقْتُمْ كَمَا يُرْزَقُ الطَّيْرُ تَغْدُو خِمَاصًا وَتَرُوحُ بِطَانًا».

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر بێتو وەکوو پێویست و شایستە پشتتان بە خوا بەستبایە، ئەوە بە جۆرێک ڕزق و ڕۆزی دەدان، هەر وەکوو ئەو باڵندەیەی کەوا بەیانییان بەسکی خاڵی و برسی دەردەچێت و دواتر بەسکی پڕ و تێرەوە دەگەڕێتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ فُقَرَاءَ الْمُهَاجِرِينَ يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ قَبْلَ أَغْنِيَائِهِم

### باسی ئەوەی هاتووە کە کۆچەرییە هەژارەکان دەچنە بەهەشت پێش دەوڵەمەندەکانیان

٥٣١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَدْخُلُ الْفُقَرَاءُ الْجَنَّةَ قَبْلَ الْأَغْنِيَاءِ بِخَمْسِمِائَةِ عَامٍ نِصْفِ يَوْمٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەژاران پێش دەوڵەمەندان دەچنە بەهەشت بە پێنج سەد ساڵ زووتر، کە دەکاتە نیوەڕۆژێک (بەپێی کاتی ڕۆژی دوایی)».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي مَعِيشَةِ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بژێویی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ

٥٣٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ فِي سَاعَةٍ لَا يَخْرُجُ فِيهَا وَلَا يَلْقَاهُ فِيهَا أَحَدٌ، فَأَتَاهُ أَبُو بَكْرٍ، فَقَالَ: «مَا جَاءَ بِكَ يَا أَبَا بَكْرٍ؟»، فَقَالَ: خَرَجْتُ أَلْقَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَأَنْظُرُ فِي وَجْهِهِ وَالتَّسْلِيمَ عَلَيْهِ، فَلَمْ يَلْبَثْ أَنْ جَاءَ عُمَرُ، فَقَالَ: «مَا جَاءَ بِكَ يَا عُمَرُ؟»، قَالَ: الْجُوعُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَأَنَا قَدْ وَجَدْتُ بَعْضَ ذَلِكَ»، فَانْطَلَقُوا إِلَى مَنْزِلِ أَبِي الْهَيْثَمِ بْنِ التَّيْهَانِ الْأَنْصَارِيِّ. وَكَانَ رَجُلًا كَثِيرَ النَّخْلِ وَالشَّاءِ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ خَدَمٌ فَلَمْ يَجِدُوهُ، فَقَالُوا لِامْرَأَتِهِ: أَيْنَ صَاحِبُكِ؟ فَقَالَتْ: انْطَلَقَ يَسْتَعْذِبُ لَنَا الْمَاءَ، فَلَمْ يَلْبَثُوا أَنْ جَاءَ أَبُو الْهَيْثَمِ بِقِرْبَةٍ يَزْعَبُهَا فَوَضَعَهَا ثُمَّ جَاءَ يَلْتَزِمُ النَّبِيَّ ﷺ وَيُفَدِّيهِ بِأَبِيهِ وَأُمِّهِ، ثُمَّ انْطَلَقَ بِهِمْ إِلَى حَدِيقَتِهِ فَبَسَطَ لَهُمْ بِسَاطًا، ثُمَّ انْطَلَقَ إِلَى نَخْلَةٍ فَجَاءَ بِقِنْوٍ فَوَضَعَهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَفَلَا تَنَقَّيْتَ لَنَا مِنْ رُطَبِهِ؟»، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَرَدْتُ أَنْ تَخْتَارُوا،

أَوْ قَالَ: تَخَيَّرُوا مِنْ رُطَبِهِ وَبُسْرِهِ، فَأَكَلُوا وَشَرِبُوا مِنْ ذَلِكَ المَاءِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «هَذَا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ مِنَ النَّعِيمِ الَّذِي تُسْأَلُونَ عَنْهُ يَوْمَ القِيَامَةِ، ظِلٌّ بَارِدٌ، وَرُطَبٌ طَيِّبٌ، وَمَاءٌ بَارِدٌ»، فَانْطَلَقَ أَبُو الهَيْثَمِ لِيَصْنَعَ لَهُمْ طَعَامًا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَا تَذْبَحَنَّ ذَاتَ دَرٍّ»، قَالَ: فَذَبَحَ لَهُمْ عَنَاقًا أَوْ جَدْيًا فَأَتَاهُمْ بِهَا فَأَكَلُوا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَلْ لَكَ خَادِمٌ؟»، قَالَ: لَا، قَالَ: «فَإِذَا أَتَانَا سَبْيٌ فَأْتِنَا»، فَأُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِرَأْسَيْنِ لَيْسَ مَعَهُمَا ثَالِثٌ فَأَتَاهُ أَبُو الهَيْثَمِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اخْتَرْ مِنْهُمَا»، فَقَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ اخْتَرْ لِي، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ المُسْتَشَارَ مُؤْتَمَنٌ، خُذْ هَذَا فَإِنِّي رَأَيْتُهُ يُصَلِّي وَاسْتَوْصِ بِهِ مَعْرُوفًا»، فَانْطَلَقَ أَبُو الهَيْثَمِ إِلَى امْرَأَتِهِ فَأَخْبَرَهَا بِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَتْ امْرَأَتُهُ: مَا أَنْتَ بِبَالِغٍ مَا قَالَ فِيهِ النَّبِيُّ ﷺ إِلَّا أَنْ تَعْتِقَهُ، قَالَ: فَهُوَ عَتِيقٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ لَمْ يَبْعَثْ نَبِيًّا وَلَا خَلِيفَةً إِلَّا وَلَهُ بِطَانَتَانِ بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالمَعْرُوفِ وَتَنْهَاهُ عَنِ المُنْكَرِ، وَبِطَانَةٌ لَا تَأْلُوهُ خَبَالًا، وَمَنْ يُوقَ بِطَانَةَ السُّوءِ فَقَدْ وُقِيَ».



ئەبو هورەیرە ﷛ دەڵێت: ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ لە ماڵ دەرچوو، لە کاتێکی وا نەریتی ئەو نەبوو لەوکاتە دەربچێت یان دیدار لەگەڵ کەس بکات، لەو کاتەدا ئەبو بەکر ﷛ هاتە خزمەتی، پێی فەرموو: «چ شتێک تۆی هێناوەتە دەر ئەی ئەبو بەکر؟»، گوتی: دەرچووم تا بگەمە دیدارت، سەیری ڕوخسارت بکەم و سەلامێکت لێ بکەم، هێندەی پێ نەچوو عومەریش ﷛ هات، پێی فەرموو: «چ شتێک تۆی هێناوەتە دەر ئەی عومەر؟»، ئەویش گوتی: برسییەتی ئەی پێغەمبەری خوا، دەڵێت: جا پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: «منیش هەست بە هەندێك لە برسییەتی دەکەم»، جا بەیەکەوە دەرچوون بۆ لای ماڵی ئەبو هەیسەمی کوڕی تەیهانی ئەنصاری، کەسێک بوو دارخورما و مەڕوماڵاتی زۆری هەبوو، هیچ خزمەتکارێکیشی نەبوو، کە گەیشتنە لای ماڵی ئەبو هەیسەم ئەویان دەست نەکەوت، جا بە ئافرەتەکەیان گوت: کوا هاوسەرەکەت؟ گوتی: دەرچووە ئاوی خواردنەوەمان بۆ بێنێت، ئەوەندەی پێ نەچوو کە ئەبو هەیسەم دەرکەوت و گەڕایەوە، کوندەیەکی پڕ لە ئاوی بەزەحمەتییەوە هەڵگرتبوو، ئینجا هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و لە

باوەشی گرت، بە باوک و دایکیەوە خۆی بەقوربان کرد، پاشان بردنی بۆ نێو باخچەکەی و ڕایەخی بۆ ڕاخستن، پاشان چووە لای دارخورمایەکانی و وشییەک لە ڕوتابی هێنا و بۆی دانان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئایا نەدەبووایە لە ڕوتابەکانی بۆمان هەڵبژێریت؟»، ئەبو هەیسەم گوتی: ویستم بە ئارەزووی خۆتان لە ڕوتابەکان هەڵبژێرن، جا دەستیان کرد بە خواردن و خواردنەوەی ئەو ئاوەی کە تازە هێنابووی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بەدەستە ئا ئەو ناز و نیعمەتانە لێپرسینەوەیان لەسەر دەکرێت لە ڕۆژی دوایی، سێبەرێکی فێنک، ڕوتابێکی خۆش، ئاوێکی سارد»، ئینجا ئەبو هەیسەم ڕۆیشت بۆ ئەوەی خواردنیان بۆ ئامادە بکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «نەکەیت ئاژەڵی شیردەر سەر ببڕیت»، گوتی: کارەمێیەکی یان کاریلەیەکی بۆ سەر بڕین، بۆی هێنان و ئەوانیش خواردیان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «خزمەتکارت هەیە؟»، گوتی: نەخێر، فەرمووی: «ئەگەر کۆیلەی جەنگمان بۆ هات وەرە لامان»، دواتر دوو کۆیلەیان بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ هێنا و سێیەمی نەبوو، ئەبو هەیسەم هاتە خزمەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: «یەکێك هەڵبژێرە لەم دووانە»، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ بۆم دیاری بکە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەڕاستی ڕاوێژکار ئەمیندارە، ئا ئەمە ببە، چونکە بینیم نوێژ دەکات، بەچاکە ڕەفتاری لەگەڵدا بکە»، ئەبو هەیسەم ڕۆیشت بۆ لای هاوسەرەکەی، ئامۆژگاری پێغەمبەری خوای ﷺ پێی ڕاگەیاند، ئافرەتەکەی گوتی: بەڕاستی تۆ ناتوانیت مافی ئەمە بدەیت کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی لێ وەکردووە، مەگەر ئازادی بکەیت، ئەبو هەیسەمیش گوتی: ئەوە ئازادم کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەڕاستی خوا هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانە نەکردووە و هیچ جێنیشینێکی دانەناوە، مەگەر دوو دەستەی پێ داون، دەستەیەک فەرمانی پێ دەکات بە چاکە و ڕێگریی لێ دەکات لە خراپە، دەستەیەکی دیکە کۆڵ نادات لە هاندان بۆ خراپە و ئاژاوە، هەر کەسێک پارێزراو بێت لە دەستەی خراپە، بەدڵنیایی پارێزراوە لە خراپە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَخْذِ الْمَالِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دەستبردن بۆ ماڵ و سامان

٥٣٣. عَنْ خَوْلَةِ بِنْتِ قَيْسٍ، وَكَانَتْ تَحْتَ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ ﵁ تَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ هَذَا المَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، مَنْ أَصَابَهُ بِحَقِّهِ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَرُبَّ مُتَخَوِّضٍ فِيمَا شَاءَتْ بِهِ نَفْسُهُ مِنْ مَالِ اللَّهِ وَرَسُولِهِ لَيْسَ لَهُ يَوْمَ القِيَامَةِ إِلَّا النَّارُ».

خەولەی کچی قەیس، کە خێزانی حەمزەی کوڕی عەبدولموتەلیبە ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «بەڕاستی ئەم ماڵ و سامانە سەوزاییەکی بەتام و شیرینە، هەر کەسێک بەڕێگایەکی دروست دەستی بکەوێت، خوا بەرەکەت دەخاتە نێوی، جۆرە کەسانێک هەن ئەوەی دڵی پێ خۆشە دەستی بۆ دەبات لە ماڵ و سامانی خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ (ماڵی گشت موسوڵمانان) ئەو کەسە هیچی بۆ نییە لە ڕۆژی دوایی تەنیا ئاگری دۆزەخ نەبێت».



٥٣٤. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَتْبَعُ المَيِّتَ ثَلَاثٌ، فَيَرْجِعُ اثْنَانِ وَيَبْقَى وَاحِدٌ، يَتْبَعُهُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَعَمَلُهُ، فَيَرْجِعُ أَهْلُهُ وَمَالُهُ وَيَبْقَى عَمَلُهُ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سێ شت شوێن مردوو دەکەون دووانیان دەگەڕێنەوە و یەکیان دەمێنێتەوە، خانەوادە و ماڵ و کارەکانی شوێنی دەکەون، خانەوادە و ماڵەکەی دەگەڕێنەوە، تەنها کارەکەی دەمێنێتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الْمَرْءَ مَعَ مَنْ أَحَبَّ

### باسی ئەوەی هاتووە کە مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەیە کە خۆشی دەوێت

٥٣٥. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى

قِيَامُ السَّاعَةِ؟ فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ إِلَى الصَّلَاةِ، فَلَمَّا قَضَى صَلَاتَهُ قَالَ: «أَيْنَ السَّائِلُ عَنْ قِيَامِ السَّاعَةِ؟»، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: «مَا أَعْدَدْتَ لَهَا؟»، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا أَعْدَدْتُ لَهَا كَبِيرَ صَلَاةٍ وَلَا صَوْمٍ إِلَّا أَنِّي أُحِبُّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ وَأَنْتَ مَعَ مَنْ أَحْبَبْتَ»، فَمَا رَأَيْتُ فَرِحَ الْمُسْلِمُونَ بَعْدَ الْإِسْلَامِ فَرَحَهُمْ بِهَذَا.

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پیاوێک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کەی قیامەت دێت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ هەستایەوە بۆ نوێژکردن (بەبێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە)، کاتێک نوێژەکەی تەواو کرد، فەرمووی: «کوا ئەو کەسەی پرسیاری کرد سەبارەت بە ڕۆژی دوایی؟»، پیاوەکە گوتی: من بووم ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: «چیت بۆ ئامادە کردووە؟»، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، کارێکی زۆری وام ئامادە نەکردووە لە نوێژ و ڕۆژوو، بەڵام من خوا و پێغەمبەرەکەیم ﷺ خوش دەوێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «مرۆڤ (لە قیامەت) لەگەڵ ئەو کەسەیە کە خۆشی ویستووە، تۆش لەگەڵ ئەو کەسەی کە خۆشت ویستووە»، (ئەنەس دەڵێت:) نەمبینیبوو موسوڵمانان دڵخۆش ببن بە شتێك لەدوای ئایینی ئیسلام هێندەی دڵخۆشبوونیان بەو وەڵامە.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي حُسْنِ الظَّنِّ بِاللَّهِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گومانی چاکبردن بەخوا

٥٣٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ: أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي وَأَنَا مَعَهُ إِذَا دَعَانِي».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان خوا دەفەرمووێت: من بەگوێرەی گومانبردنی بەندەکەمم لەگەڵم، من لەگەڵ ئەودام کاتێک داوام لێ دەکات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي البِرِّ وَالإِثْمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی چاکە و خراپە

٥٣٧. عَنْ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنِ البِرِّ وَالإِثْمِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «البِرُّ حُسْنُ الخُلُقِ، وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي نَفْسِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ».

نەواسی کوڕی سەمعان ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد دەربارەی چاکە و خراپە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «چاکە: ڕەوشت جوانییە، خراپەش: بریتییە لەو شتەی لەنێو سینەت دێت و دەچێت و پێتناخۆشە و حەز ناکەیت خەڵك پێی بزانێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحُبِّ فِي اللَّهِ



### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆشویستن لەپێناو خوا

٥٣٨. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «قَالَ اللَّهُ ﷻ: المُتَحَابُّونَ فِي جَلَالِي لَهُمْ مَنَابِرُ مِنْ نُورٍ يَغْبِطُهُمُ النَّبِيُّونَ وَالشُّهَدَاءُ».

موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «خوا ﷻ فەرموویەتی: ئەوانەی لەپێناو ڕێز و شکۆی من (لەبەر من) یەکدییان خۆش ویستووە چەند دوانگە و شوێنێکی نوورینیان هەیە، پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگە بە شوێنەکەیان دەخوازن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِعْلَامِ الحُبِّ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕاگەیاندنی خۆشویستن

٥٣٩. عَنِ المِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَحَبَّ

أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُعْلِمْهُ إِيَّاهُ».

میقدامی کوڕی مەعدی کەریب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان برایەکی خۆی خۆش ویست، با پێی بڵێت و ئاگاداری بکاتەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الصَّبْرِ عَلَى الْبَلَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئارامگرتن لەسەر بەڵا و ناخۆشی

٥٤٠. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدِهِ الْخَيْرَ عَجَّلَ لَهُ الْعُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا، وَإِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدِهِ الشَّرَّ أَمْسَكَ عَنْهُ بِذَنْبِهِ حَتَّى يُوَافِيَ بِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ».

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر خوا چاکەی بۆ بەندەیەک بوێت، سزادانی لە دونیا بۆ پێش دەخات (تووشی تاقیکردنەوە و ناڕەحەتی دەبێت)، ئەگەر خوا خراپەی بۆ بەندەیەکی بوێت (بەهۆی کردەوە خراپەکانی خۆی)، ئەوە گوناهەکەی لەسەر دەهێڵێتەوە تا سزای بدات لە ڕۆژی دوایی».



٥٤١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا يَزَالُ الْبَلَاءُ بِالْمُؤْمِنِ وَالْمُؤْمِنَةِ فِي نَفْسِهِ وَوَلَدِهِ وَمَالِهِ حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ وَمَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڵا و ناڕەحەتییەکان بەردەوام دەبن لەسەر کەسی بڕواداری پیاو و ئافرەت، لەسەر خۆی و منداڵەکانی و ماڵ و سامانی، تا بە جۆرێک کە دەگەڕێتەوە لای خوا هیچ گوناهێکی لەسەر نەماوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي ذَهَابِ الْبَصَرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی لەدەستدانی چاوەکان

٥٤٢. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﷺ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا النَّجَاةُ؟ قَالَ: «امْلِكْ

عَلَيْكَ لِسَانَكَ، وَلْيَسَعْكَ بَيْتُكَ، وَابْكِ عَلَى خَطِيئَتِكَ».

عوقبەی کوڕی عامر ﷺ دەڵێت: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا، چ شتێک ڕزگارکەرە؟ فەرمووی: «زمانت بگرە (لە گوتنی خراپە)، نێو ماڵەکەت بەست بێت (بۆ دابڕان و خواپەرستی)، بۆ گوناهـ و هەڵەکانیشت بگری».

٥٤٣. عَنْ عَبْدُالوَهَّابِ بنِ الوَرْدِ عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَهْلِ المَدِينَةِ قَالَ: كَتَبَ مُعَاوِيَةُ إِلَى عَائِشَةَ أُمِّ المُؤْمِنِينَ ﷺ أَنِ اكْتُبِي إِلَيَّ كِتَابًا تُوصِينِي فِيهِ، وَلَا تُكْثِرِي عَلَيَّ، فَكَتَبَتْ عَائِشَةُ إِلَى مُعَاوِيَةَ: سَلَامٌ عَلَيْكَ. أَمَّا بَعْدُ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنِ التَمَسَ رِضَاءَ اللَّهِ بِسَخَطِ النَّاسِ كَفَاهُ اللَّهُ مُؤْنَةَ النَّاسِ، وَمَنِ التَمَسَ رِضَاءَ النَّاسِ بِسَخَطِ اللَّهِ وَكَلَهُ اللَّهُ إِلَى النَّاسِ»، وَالسَّلَامُ عَلَيْكَ.

عەبدولوەهابی کوڕی وەرد لە پیاوێکی خەڵکی مەدینە دەگێڕێتەوە گوتوویەتی: جارێکیان موعاویە نامەیەکی بۆ عائیشەی دایکی بڕواداران ﷺ نووسی، کە نووسراوێکم بۆ بنووسە ئامۆژگاریم بکەیت بەڵام درێژەی پێ مەدە بۆم (کورت بێت)، عائیشە بۆ موعاویەی نووسی: سەلامت لێ بێت، دوای ئەوە: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «هەر کەسێک ڕەزامەندیی خوای دەست بکەوێت بەهۆی توڕەیی خەڵک (لەسەر هەق)، خوا بێباکی دەکات لە پێویستبوون بە خەڵک، هەر کەسێک ڕەزامەندیی خەڵکی بەدەست بێنێت بەهۆی توڕەیی خوا، خوا کار و پێویستییەکانی دەداتە دەست خەڵکی». سەلامی خوات لێ بێت.

# أَبْوَابُ صِفَةِ الْقِيَامَةِ وَالرَّقَائِقِ وَالْوَرَعِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

**كۆباسی دوارۆژ و دڵنەرمکەرەوەکان و وەرع لە پێغەمبەری خواوە ﷺ**

## بَابٌ فِي الْقِيَامَةِ

## باسێک دەربارەی دوارۆژ



٥٤٤. عَنْ أَبِي بَرْزَةَ الأَسْلَمِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تَزُولُ قَدَمَا عَبْدٍ يَوْمَ القِيَامَةِ حَتَّى يُسْأَلَ عَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ، وَعَنْ عِلْمِهِ فِيمَ فَعَلَ، وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَ أَنْفَقَهُ، وَعَنْ جِسْمِهِ فِيمَ أَبْلَاهُ».

ئەبو بەرزەی ئەسلەمی رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دوو پێی هیچ بەندەیەك لە ڕۆژی قیامەتدا (لەبەردەم دادگای خوای پەروەردگاردا) ناجووڵێت، تاکوو پرسیاری لێ نەکرێت: دەربارەی تەمەنی کە لە چیدا بەڕێ کردووە؟ لە زانیارییەکەی لە چی و چەند کاری پێ کردووە؟ لەو ماڵ و سامانەی کە هەیەتی چۆنی بەدەست هێناوە؟ چۆنیشی خەرج کردووە؟ لاشەی لە چیدا پیر کردووە و تەواو کردووە؟!».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي شَأْنِ الْحِسَابِ وَالْقَصَاصِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی لێپرسینەوە و تۆڵەسەندنەوە

٥٤٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَتَدْرُونَ مَنِ الْمُفْلِسُ؟»، قَالُوا: المُفْلِسُ فِينَا يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ لَا دِرْهَمَ لَهُ وَلَا مَتَاعَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «المُفْلِسُ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يَأْتِي يَوْمَ القِيَامَةِ بِصَلَاتِهِ وَصِيَامِهِ وَزَكَاتِهِ، وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا وَقَذَفَ هَذَا، وَأَكَلَ مَالَ هَذَا، وَسَفَكَ دَمَ هَذَا، وَضَرَبَ هَذَا فَيَقْعُدُ فَيَقْتَصُّ هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ قَبْلَ أَنْ يُقْتَصَّ مَا عَلَيْهِ مِنَ الخَطَايَا أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَ عَلَيْهِ ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ».

ئەبو هورەیرە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئایا دەزانن مایەپووچ کێیە؟»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، مایەچووچ لەنێوماندا ئەو کەسەیە کە هیچ دەرهەم و کەلوپەلێکی نەبێت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «مایەپووچ لە ئوممەتی من ئەو کەسەیە کە ڕۆژی دوایی دێتە مەحشەر بە نوێژەکەی و ڕۆژووەکەی و زەکاتەکەی، لە کاتێکدا (لە دونیا) جوێنی داوە بە فڵان، تۆمەتی هەڵبەستووە بۆ فڵان، ماڵی ئەم و ئەوی خواردووە، خوێنی فڵانی ڕشتووە و لە فڵانی داوە، دادەنیشێت و فڵان لە چاکەکانی دەبات، ئەوی دی لە چاکەکانی دیکەی دەبات، ئینجا کاتێك چاکەی نەما پێش ئەوەی مافی خەڵک لەسەری تەواو ببێت، ئەوکات لە گوناهی خاوەن مافەکان وەردەگیرێت و دەخرێتە ئەستۆی، پاشان فڕێ دەدرێتە نێو ئاگری دۆزەخ».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي العَرْضِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نمایشکردن

٥٤٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، وَعَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يُؤْتَى بِالعَبْدِ

يَوْمَ القِيَامَةِ فَيَقُولُ اللَّهُ لَهُ: أَلَمْ أَجْعَلْ لَكَ سَمْعًا وَبَصَرًا وَمَالاً وَوَلَدًا، وَسَخَّرْتُ لَكَ الأَنْعَامَ وَالحَرْثَ، وَتَرَكْتُكَ تَرْأَسُ وَتَرْبَعُ فَكُنْتَ تَظُنُّ أَنَّكَ مُلَاقِي يَوْمَكَ هَذَا؟ فَيَقُولُ: لَا، فَيَقُولُ لَهُ: اليَوْمَ أَنْسَاكَ كَمَا نَسِيتَنِي».

ئەبو هوڕەیرە و ئەبو سەعید ﵄ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە ڕۆژی دوایی بەندە دەهێنرێت، خوا پێ دەفەرموێت: «ئایا بیستن و بینین و ماڵ و منداڵم پێ نەدایت؟ ئاژەڵم بۆ ملکەچ نەکردیت؟ کێڵانی زەویم بۆ ئاسان نەکردیت؟ ڕێگام پێت نەدا ببیت بە گەورەی کەسانێک و لە خۆشی و پشوودان‌دا بیت؟ ئایا گومانت هەبوو کە بە دیدارم بگەیت لەم ڕۆژەدا؟ دەڵێت: نەخێر، خوا پێی دەفەرموێت: ئەمڕۆ لەبیرت دەکەم (لەنێو ئازار جێت دەهێڵین) هەر وەک چۆن تۆ منت لەبیر کرد (لە دونیا)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الشَّفَاعَةِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تکاکاری



٥٤٧. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «شَفَاعَتِي لِأَهْلِ الكَبَائِرِ مِنْ أُمَّتِي».

ئەنەس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «شەفاعەتی (تایبەتم) بۆ ئەو کەسانەیە لە ئوممەتەکەم کە گوناهی گەورەیان هەیە».

٥٤٨. عَنْ عَوْفِ بْنِ مَالِكٍ الأَشْجَعِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَانِي آتٍ مِنْ عِنْدِ رَبِّي فَخَيَّرَنِي بَيْنَ أَنْ يُدْخِلَ نِصْفَ أُمَّتِي الجَنَّةَ وَبَيْنَ الشَّفَاعَةِ، فَاخْتَرْتُ الشَّفَاعَةَ، وَهِيَ لِمَنْ مَاتَ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا».

عەوفی کوڕی مالیکی ئەشجەعی ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نێردراوێک هاتە لام لەلایەن پەروەردگارم، سەرپشکی کردم لە نێوان ئەوەی کە نیوەی ئوممەتم بچێتە بەهەشت (یان) شەفاعەتم هەبێت، شەفاعەتم هەڵبژارد، ئەو شەفاعەتەش بۆ ئەوانە دەبێت مردبن و هیچ هاوبەشێکیان بۆ خوا بڕیار نەدابێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ الحَوْضِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی حەوزی کەوسەر

٥٤٩. عَنْ حَنْظَلَةَ الأُسَيِّدِيِّ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَوْ أَنَّكُمْ تَكُونُونَ كَمَا تَكُونُونَ عِنْدِي لَأَظَلَّتْكُمُ المَلَائِكَةُ بِأَجْنِحَتِهَا».

حەنزەڵەی ئوسەیدی رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر هاتو ئێوە بەردەوام لەسەر ئەو حاڵەتە بن وەک ئەو کاتەی لای منن (لە بەرزی پلەی ئیماندا)، واتان لێ دەهات کە فریشتەکان بە باڵەکانیان سێبەرتان لەسەر بکات».

٥٥٠. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: خَطَّ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَطًّا مُرَبَّعًا وَخَطَّ فِي وَسَطِ الخَطِّ خَطًّا وَخَطَّ خَارِجًا مِنَ الخَطِّ خَطًّا وَحَوْلَ الَّذِي فِي الوَسَطِ خُطُوطًا، فَقَالَ: «هَذَا ابْنُ آدَمَ وَهَذَا أَجَلُهُ مُحِيطٌ بِهِ، وَهَذَا الَّذِي فِي الوَسَطِ الإِنْسَانُ، وَهَذِهِ الخُطُوطُ عُرُوضُهُ إِنْ نَجَا مِنْ هَذَا يَنْهَشُهُ هَذَا، وَالخَطُّ الخَارِجُ الأَمَلُ».



عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ چوارگۆشەیەکەی بۆ کێشاین (لەسەر زەوی)، لە نێوەندی هێڵێکی کێشا، لە دەرەوەی چوارگۆشەکەش هێڵێکی کێشا، لە دەورەی هێڵەکەی نێو چوارگۆشەکەش چەند هێڵێکی دیکەی کێشا، فەرمووی: «ئەوە ئادەمیزادە، ئەوەش کاتی مردنیەتی دەورەی داوە، ئەوەی لە نێوەندە مرۆڤەکەیە، ئەو هێلانەی دەوروبەریشی ئەگەر لەوەش ڕزگاری بێت، ئەوەی دیکە هێرشی دەکاتە سەر، ئەو هێڵەش کە لە دەرەوەی چوارگۆشەکەیە هیواکانن».

## بَابٌ

باسێک

٥٥١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الطَّاعِمُ الشَّاكِرُ بِمَنْزِلَةِ الصَّائِمِ الصَّابِرِ».

ئەبو هورەیرە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: « ئەو کەسەی کە لەسەر خواردن سوپاس و ستاییشی خوا دەکات، پاداشتی وەک ئەو کەسەیە کە بەڕۆژوو دەبێت و ئارام دەگرێت لەسەری».

## بَابٌ

باسێک



٥٥٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ صَمَتَ نَجَا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بێدەنگ بوو ڕزگاری بوو».

## بَابٌ

باسێک

٥٥٣. عَنْ شَيْخٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْمُسْلِمُ إِذَا كَانَ يُخَالِطُ النَّاسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ خَيْرٌ مِنَ الْمُسْلِمِ الَّذِي لَا يُخَالِطُ النَّاسَ وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ».

پیاوێکی بەتەمەن کە لە هاوەڵانی پێغەمبەرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ

فەرموویەتی: «موسوڵمانێک کە تێکەڵی خەڵک بێت، ئارام بگرێت لەسەر ئەزیەت و ئازاریان، چاکترە لە موسوڵمانێک کە تێکەڵ خەڵک نەبێت و ئارام نەگرێت لەسەر ئەزیەت و ئازاریان».

## بَابٌ

### باسێک

٥٥٤. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِأَفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصِّيَامِ وَالصَّلَاةِ وَالصَّدَقَةِ»، قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «صَلَاحُ ذَاتِ البَيْنِ، فَإِنَّ فَسَادَ ذَاتِ البَيْنِ هِيَ الحَالِقَةُ».

ئەبو دەرداء ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئایا شتێکتان پێ ڕانەگەیەنم چاکتر بێت لە پلەی بەڕۆژوو و نوێژ وماڵبەخشین؟»، گوتیان: با (ئەی خۆشەویستی خوا)، فەرمووی: «ئاشتکردنەوەی نێوان خەڵك، چونکە بەڕاستی تێکدانی نێوان خەڵکی داتاشەرە (کاری چاکە دادەتاشێت)».



# أبْوَابُ صِفَةِ الْجَنَّةِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی تایبەتمەندیی بەهەشت لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ شَجَرِ الْجَنَّةِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تایبەتمەندیی درەختی بەهەشت

٥٥٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «إِنَّ فِي الجَنَّةِ لَشَجَرَةً يَسِيرُ الرَّاكِبُ فِي ظِلِّهَا مِائَةَ عَامٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «بەڕاستی لە بەهەشتدا جۆرە درەختێک هەیە، سوارێک بۆ ماوەی سەد ساڵ لەژێر سێبەرەکەی دەڕوات و تەواوی ناکات».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ دَرَجَاتِ الجَنَّةِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تایبەتمەندیی پلەکانی بەهەشت

٥٥٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «فِي الجَنَّةِ مِائَةُ دَرَجَةٍ مَا بَيْنَ

كُلِّ دَرَجَتَيْنِ مِائَةُ عَامٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە بەهەشتدا سەد پلە هەیە، نێوانی هەردوو پلەیەک (بەئەندازەی) سەد ساڵ (ڕۆیشتن)ە».

٥٥٧. عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ البَجَلِيِّ ﵁ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ فَنَظَرَ إِلَى القَمَرِ لَيْلَةَ البَدْرِ، فَقَالَ: «إِنَّكُمْ سَتُعْرَضُونَ عَلَى رَبِّكُمْ فَتَرَوْنَهُ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا القَمَرَ لَا تُضَامُونَ فِي رِؤْيَتِهِ، فَإِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ لَا تُغْلَبُوا عَلَى صَلَاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَصَلَاةٍ قَبْلَ غُرُوبِهَا فَافْعَلُوا»، ثُمَّ قَرَأَ: «{وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ} ق: ٣٩».

جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی ﵁ دەڵێت: جارێکیان ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دانیشتبووین، تەماشای مانگی چواردەی کرد، فەرمووی: «ئێوە پەروەردگارتان دەبینن (لە ڕۆژی قیامەتدا) هەر وەکوو چۆن ئەم مانگە دەبینن کە پێویستتان بە قەرەباڵغیکردن نییە، ئەگەر توانیتان شەیتان بەسەرتاندا زاڵ نەبێت بۆ نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر ئەم نوێژانە لە سەرەتای کاتەکەیاندا بکەن»، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: «{فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا}، واتە: خوا بەپاك بگرە و سوپاس و ستاییشی بکە (واتە: نوێژ بکە) لەپێش خۆهەڵاتن و لەپێش خۆرئاوابوون».



٥٥٨. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يَقُولُ لِأَهْلِ الجَنَّةِ: يَا أَهْلَ الجَنَّةِ، فَيَقُولُونَ: لَبَّيْكَ رَبَّنَا وَسَعْدَيْكَ، فَيَقُولُ: هَلْ رَضِيتُمْ؟ فَيَقُولُونَ: مَا لَنَا لَا نَرْضَى وَقَدْ أَعْطَيْتَنَا مَا لَمْ تُعْطِ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ، فَيَقُولُ: أَنَا أُعْطِيكُمْ أَفْضَلَ مِنْ ذَلِكَ، قَالُوا: أَيُّ شَيْءٍ أَفْضَلُ مِنْ ذَلِكَ؟ قَالَ: أُحِلُّ عَلَيْكُمْ رِضْوَانِي فَلَا أَسْخَطُ عَلَيْكُمْ أَبَدًا».

ئەبو سەعیدی خودری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەدڵنیایی خوا بە بەهەشتییەکان دەفەرموێت: ئەی خەڵکی بەهەشت، ئەوانیش دەڵێن:

له خزمەتداین ئەی پەروەردگارمان بۆ هەر شتێک جێگای ڕەزامەندیی تۆ بێت ئامادەین، پێیان دەفەرموێت: ئایا ڕازی بوون (بەوەی پێتان دراوە)؟ دەڵێن: بۆچی ڕازی نەبین لە کاتێکدا ئەوەندەت پێ داوین کە پێشتر بە هیچ کام لە دروستکراوەکانت نەداوە، دەفەرموێت: دەی شتێکتان پێ دەدەم چاکتر بێت لەوەی کە پێم داون، دەڵێن: چ شتێک هەیە چاکترە لەوە (ئەی پەروەردگارمان)؟ (خوای بەرز) دەفەرموێت: ڕازیبوونی منتان پێ دەبەخشرێت و ئیدی بە هیچ جۆرێک لێتان توڕە نابم بەهەمیشەیی».

## بَابُ مَا جَاءَ حُفَّتِ الجَنَّةُ بِالمَكَارِهِ وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ

### باسی ئەوەی هاتووە کە بەهەشت بە ناخۆشییەکان، دۆزەخیش بە ئارەزووەکان دەور دراون

٥٥٩. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ قَالَ: «حُفَّتِ الجَنَّةُ بِالمَكَارِهِ، وَحُفَّتِ النَّارُ بِالشَّهَوَاتِ». ٣٤٦

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەهەشت دەور دراوە بە ناخۆشییەکان، دۆزەخیش دەوردراوە بە ئارەزووەکان».

تێبینی:

مەبەست ئەوەیە ئەگەر کەسێك بیەوێت بەرەو بەهەشت بڕوات، دەبێت تەحەمولی سەختی و ناڕەحەتی زۆر بکات کە لە جێبەجێکردنی واجبەکان و خۆگرتنەوە لە قەدەغەکان خۆی دەنوێنێت، بەڵام کەسێك بەدوای ئارەزووەکانی بکەوێت، ئەوە شوورا و پەرژینی دۆزەخ دەبڕێت و دەچێتە نێو دۆزەخەوە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ أَنْهَارِ الجَنَّةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تایبەتمەندیی ڕووبارەکانی بەهەشت

٥٦٠. عَنْ حَكِيمِ بْنِ مُعَاوِيَةَ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «إِنَّ فِي الجَنَّةِ بَحْرَ المَاءِ وَبَحْرَ العَسَلِ وَبَحْرَ اللَّبَنِ وَبَحْرَ الخَمْرِ، ثُمَّ تُشَقَّقُ الأَنْهَارُ بَعْدُ».

حەکیمی کوڕی موعاویە، لە باوکیەوە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «بێگومان لە بەهەشتدا دەریای ئاو هەیە، دەریای هەنگوین، دەریای شیر و دەریای مەی هەیە، ئینجا لەدوای ئەم دەریایانەوە ڕووبارەکان هەڵدەقوڵێن».

٥٦١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «مَنْ سَأَلَ اللَّهَ الجَنَّةَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ قَالَتِ الجَنَّةُ: اللَّهُمَّ أَدْخِلْهُ الجَنَّةَ، وَمَنْ اسْتَجَارَ مِنَ النَّارِ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ قَالَتِ النَّارُ: اللَّهُمَّ أَجِرْهُ مِنَ النَّارِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرموویەتی: «هەر کەسێک سێ جاران داوای بەهەشت لە خوا بکات، بەهەشت دەڵێت: ئەی خوایە بیخە نێو بەهەشتەوە، هەرکەسێکیش سێ جاران خۆی بە خوا بپارێزێت لە ئاگری دۆزەخ، ئاگری دۆزەخ دەڵێت: ئەی خوایە لە ئاگر بیپارێزە».



# أَبْوَابُ صِفَةِ جَهَنَّمَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی تایبەتمەندیی دۆزەخ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ لِلنَّارِ نَفَسَيْنِ، وَمَا ذُكِرَ مَنْ يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ مِنْ أَهْلِ التَّوْحِيدِ



باسی ئەوەی هاتووە کەوا ئاگر دوو هەناسەدانی هەیە، ئەوەش کە باس کراوە دەربارەی ئەوانەی لە ئاگری دۆزەخ دێنە دەر لە خەڵکی خوابەیەکگر

٥٦٢. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اشْتَكَتِ النَّارُ إِلَى رَبِّهَا وَقَالَتْ: أَكَلَ بَعْضِي بَعْضًا، فَجَعَلَ لَهَا نَفَسَيْنِ، نَفَسًا فِي الشِّتَاءِ، وَنَفَسًا فِي الصَّيْفِ، فَأَمَّا نَفَسُهَا فِي الشِّتَاءِ فَزَمْهَرِيرٌ، وَأَمَّا نَفَسُهَا فِي الصَّيْفِ فَسَمُومٌ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئاگر لەلای پەروەردگاری سکاڵای کرد و گوتی: ئەی پەروەردگارا (لە گەرمی و بەتینیدا) بەشێکم بەشەکەی دیکەی خوارد، بۆیە (خوا) مۆڵەتی دوو نەفەسی پێ دەدات: نەفەس و هەناسەدانێک لە زستاندا و هەناسەدانێکیش لە هاویندا، جا ئەو ساردییە (توندوتیژەی کە دەیبینن لە تەبەقە و بەشە هەرە ساردەکەی) زەمهەریرە، ئەو گەرمییە (توند و بەتینە کە لە هاویندا دەیبینن ئەوە لە بەشە گەرمەکەی) سەموومە».

٥٦٣. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «يُخْرَجُ مِنَ النَّارِ مَنْ كَانَ فِي

قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنَ الإِيمَانِ»، قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَمَنْ شَكَّ فَلْيَقْرَأْ: {إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ} النساء: ٤٠.

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بەئەندازەی تۆسقاڵە گەردیلەیەک ئیمانی لە دڵدا بێت، لە ئاگری دۆزەخ دەهێنرێتە دەر»، ئەبو سەعید گوتی: هەر کەسێکیش گومانی هەیە (لەم فەرموودەیە) با ئەم ئایەتە بخوێنێتەوە: {إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ}، واتە: بەڕاستی خوا بەئەندازەی گەردیلەیەکیش ستەم لە کەس ناکات.

٥٦٤. عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اطَّلَعْتُ فِي النَّارِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا النِّسَاءَ، وَاطَّلَعْتُ فِي الجَنَّةِ فَرَأَيْتُ أَكْثَرَ أَهْلِهَا الفُقَرَاءَ».

عیمرانی کوڕی حوصەین ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سەیری دۆزەخم کرد زۆربەی خەڵکەکەی لە ئافرەتانن، سەیری بەهەشتم کرد، بینیم زۆربەی خەڵکەکەی لە هەژارانن».



## بَابُ (فِي أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا)

### باسێک (دەربارەی کەمترین سزای دۆزەخییەکان)

٥٦٥. عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّ أَهْوَنَ أَهْلِ النَّارِ عَذَابًا يَوْمَ القِيَامَةِ رَجُلٌ فِي أَخْمَصِ قَدَمَيْهِ جَمْرَتَانِ يَغْلِي مِنْهُمَا دِمَاغُهُ».

نوعمانی کوڕی بەشیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی کەمترین ئازار بۆ دۆزەخییەکان لە ڕۆژی دوایی کەسێکە دوو پشکۆی ئاگر لەژێر هەردوو قاچی دادەنرێت، مێشکی سەری پێ دەکوڵێت».



# أَبْوَابُ الْإِيمَانِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی ئیمان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ

### باسی ئەوەی هاتووە ئیسلام بنیات نراوە لە سەر پێنج پایە



٥٦٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ، وَحَجِّ الْبَيْتِ».

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئیسلام لەسەر پێنج شت بنیات نراوە: شایەتیدان بەوەی هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوا، موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، بەرپاکردنی نوێژ و زەکات دەرکردن لە ماڵ و سامان، ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان، ئەنجامدانی حەجی ماڵی خوا».

تێبینی:

لێرەدا هەندێك لە مسوڵمانان وا دەزانن کە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە: هەر کەسێك ئەو پێنج شتەی ئەنجام دان، مانای وایە مسوڵمانەتی تەواو کردووە، بەڵام

پێویستە هەموو لایەکمان بزانین کە مەبەست لە ئیسلام لێرەدا مسوڵمانەتیی کەسییە و مرۆڤ ئەم پێنجانە لە خۆیدا ئەنجام بدات، ئینجا وەك شەخص دەبێتە موسوڵمان، شایەتمانهێنان کە ئیمان و عەقیدە دەگرێتەوە نێو خۆی، وە بەرپاکردنی پێنج فەرزەی نوێژ، زەکاتدان، ڕۆژووگرتن، حەجکردن، ئەوانە پێنج دروشم و نیشانەن بۆئەوەی کە ئێمە بزانین ئەو کەسە موسوڵمانە یان نا؟ تەماشا دەکەین: ئەگەر شایەتمانی هێنا دەزانین کە ئەوە تەعبیر لە ئیمان و عەقیدەی موسوڵمانەتیی خۆی دەکات، وە ئەگەر نوێژی کرد دەزانین کە ئەوە بەندایەتی بۆ خوای خۆی دەکات، وە ئەگەر زەکاتی دا و ڕۆژووی گرت و حەجی کرد، دەزانین کە ئەو کەسە کەسێکی پابەندە بە ئیسلامەتییەوە، بەڵام ئیسلامەتی بەدڵنیاییەوە لەو پێنجانەدا کورت هەڵنەهاتووە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِضَافَةِ الفَرَائِضِ إِلَى الإِيمَانِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو شتانەی پەیوەست دەکرێن بە ئیمانەوە



٥٦٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ بَابًا، فَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الأَذَى عَنِ الطَّرِيقِ، وَأَرْفَعُهَا قَوْلُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئیمان حەفتا و هەندێک بوارە، نزمترین پلەی لادانی ئەزیەتێکە لەسەر ڕێگا و بەرزترین پلەشی گوتنی وشەی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)یە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي حُرْمَةِ الصَّلَاةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێگە و گەورەیی نوێژ

٥٦٨. عَنْ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ ﵁ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَأَصْبَحْتُ يَوْمًا قَرِيبًا مِنْهُ وَنَحْنُ نَسِيرُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَخْبِرْنِي بِعَمَلٍ يُدْخِلُنِي الجَنَّةَ وَيُبَاعِدُنِي عَنِ

النَّارِ، قَالَ: «لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ عَظِيمٍ، وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ، تَعْبُدُ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكْ بِهِ شَيْئًا، وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ، وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ، وَتَصُومُ رَمَضَانَ، وَتَحُجُّ البَيْتَ».

موعازی کوڕی جەبەل ﷺ دەڵێت: لە گەشتێک لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم، ڕۆژێک لێی نزیک کەوتمەوە کاتێک بەڕێوە بووین، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا کارێکم پێ بڵێ کە بەهۆیەوە بچمە بەهەشت و دوور بکەومەوە لە دۆزەخ، فەرمووی: «بەدڵنیایی پرسیارێکی گەورەت لێ کردم، بەڕاستی ئەو ئاکارە ئاسانە بۆ کەسێک کە خوا بۆی ئاسان بکات، خوا بپەرستە و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار مەدە، نوێژەکان ئەنجام بدە، زەکاتی ماڵەکەت دەربکە، مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بە، حەجی ماڵی خوا بکە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَرْكِ الصَّلَاةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وازهێنان لە نوێژ



٥٦٩. عَنْ جَابِرٍ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «بَيْنَ الكُفْرِ وَالإِيمَانِ تَرْكُ الصَّلَاةِ».

جابیر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «نێوانی بێبڕوایی و بڕواداری وازهێنانە لە نوێژەکان».

## بَابٌ (فِي طَعْمِ الإِيمَانِ)

### باسێک (دەربارەی تام و چێژی ئیمان)

٥٧٠. عَنِ العَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ المُطَّلِبِ ﷺ: أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «ذَاقَ طَعْمَ الإِيمَانِ، مَنْ رَضِيَ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالإِسْلَامِ دِينًا، وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا».

عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیب ﷺ دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «تام و چێژی ئیمانی کردووە، ئەوەی ڕازی ببێت کە خوا پەروەردگاری

بێت، ئیسلام ئایینی بێت، موحەممەد پێغەمبەری بێت».

## بَابُ مَا جَاءَ لَا يَزْنِي الزَّانِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ

### باسی ئەوەی هاتووە زیناکار لە کاتی زیناکردندا ئیمانی نییە

٥٧١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَزْنِي الزَّانِي حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَا يَسْرِقُ السَّارِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلَكِنَّ التَّوْبَةَ مَعْرُوضَةٌ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «زیناکار لە کاتی زیناکردندا ئیمانی نییە، دز لە کاتی دزیکردندا ئیمانی نییە، بەڵام تۆبە و پەشیمانی لە تاوان هەر دەمێنێت».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ غَرِيبًا

### باسی ئەوەی هاتووە ئیسلام بەنامۆیی دەستی پێکرد و جارێکی دیکە نامۆ دەبێتەوە

٥٧٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ الإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ».

عەبدوڵلا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی ئیسلام بەنامۆیی دەستی پێکرد، جارێکی دیکەش نامۆ دەبێتەوە وەك كاتی دەسپێکردنی، بۆیە خۆشبەختی بۆ نامۆکان (واتە: لە ڕۆژگارێك دینداری دەکەن خەڵك زۆر دوورن لە ئایین)».

## بَابُ مَا جَاءَ سِبَابُ الْمُؤْمِنِ فُسُوقٌ

### باسی ئەوەی هاتووە جنێودان بە بڕوادار دەرچوونە لە فەرمانی خوا

٥٧٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سِبَابُ المُسْلِمِ فُسُوقٌ، وَقِتَالُهُ كُفْرٌ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جنێودان بە موسوڵمان دەرچوونە لە فەرمانی خوا، جەنگ لەگەڵکردنیشی کوفرە (واتە: سەردەکێشێت بۆ بێبڕوایی)».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ رَمَى أَخَاهُ بِكُفْرٍ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێک بە برای موسوڵمانی بڵێت ئەی کافر

٥٧٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَيُّمَا رَجُلٍ قَالَ لِأَخِيهِ: كَافِرٌ، فَقَدْ بَاءَ بِهَا أَحَدُهُمَا».

ئیبن عومەر ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک بە براکەی بڵێت: بێبڕوا، بێگومان ئەو قسەیە دەکەوێتە ئەستۆی یەکێکیان (گەر قسەکەی وا نەبێت خۆی بێبڕوا دەبێت و نزیکە ئیمانی لەدەست بدات)».

## مَا جَاءَ فِي افْتِرَاقِ هَذِهِ الأُمَّةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پەرتەوازەبوونی ئەم ئوممەتە

٥٧٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «تفَرَّقَتِ اليَهُودُ عَلَى إِحْدَى

وَسَبْعِينَ أَوْ اثْنَتَيْنِ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً، وَالنَّصَارَى مِثْلَ ذَلِكَ، وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ فِرْقَةً».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جوولەکەکان بوون بە حەفتا و یەک یان حەفتا و دوو کۆمەڵ، نەسرانییەکانیش بە هەمان شێوە، بەڵام ئوممەتی من دەبن بە حەفتا و سێ دەستە و کۆمەڵ».

٥٧٦. عَنْ أَبِي ذَرٍّ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «أَتَانِي جِبْرِيلُ فَبَشَّرَنِي أَنَّهُ مَنْ مَاتَ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الجَنَّةَ»، قُلْتُ: وَإِنْ زَنَى وَإِنْ سَرَقَ؟ قَالَ: «نَعَمْ».

ئەبو زەڕ ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جیبریل هاتە لام، موژدەی پێ دام بەوەی هەر کەسێک بمرێت و هیچ هاوبەشێکی بۆ خوا بڕیار نەدابێت، ئەوە دەچێتە بەهەشت»، گوتم: ئەگەر زینا و دزیشی کردبێت؟ فەرمووی: «بەڵێ».





# أبْوَابُ الْعِلْمِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی زانست لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ إِذَا أَرَادَ اللَّهُ بِعَبْدٍ خَيْرًا فَقَّهَهُ فِي الدِّينِ

باسی ئەوەی هاتووە ئەگەر خوا چاکەی بۆ کەسێک بوێت لە ئایین شارەزای دەکات



٥٧٧. عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْرًا يُفَقِّهْهُ فِي الدِّينِ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر خوا چاکە و خێری بۆ هەر کەسێک بوێت، ئەوە شارەزای دەکات لە ئایین (ڕێگای فێربوون و کارپێکردنی بۆ ئاسان دەکات)».

### بَابُ فَضْلِ طَلَبِ العِلْمِ

باسی پێگە و پاداشتی ئەو کەسەی بەدوای زانستدا دەگەڕێت

٥٧٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَلْتَمِسُ فِيهِ عِلْمًا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ طَرِيقًا إِلَى الجَنَّةِ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک ڕێگایەک بگرێتە بەر و مەبەستی فێربوونی زانست بێت، خوا ڕێگای چوونە بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كِتْمَانِ العِلْمِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی شاردنەوەی زانست و زانیاری

٥٧٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ عَلِمَهُ ثُمَّ كَتَمَهُ أُلْجِمَ يَوْمَ القِيَامَةِ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەرکەسێک پرسیاری زانستێکی لێ بکرێت و ئەویش بیشارێتەوە و نەیڵێت، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا لغاو دەکرێت بە لغاوێکی ئاگرین».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَثِّ عَلَى تَبْلِيغِ السَّمَاعِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هاندان لەسەرگەیاندنی ئەو فەرموودەیەی بیستوویەتی

٥٨٠. عَنْ عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ، يُحَدِّثُ عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: خَرَجَ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ ﵁ مِنْ عِنْدِ مَرْوَانَ نِصْفَ النَّهَارِ، قُلْنَا: مَا بَعَثَ إِلَيْهِ هَذِهِ السَّاعَةَ إِلَّا لِشَيْءٍ يَسْأَلُهُ عَنْهُ، فَقُمْنَا فَسَأَلْنَاهُ، فَقَالَ: نَعَمْ، سَأَلَنَا عَنْ أَشْيَاءَ سَمِعْنَاهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ غَيْرَهُ، فَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ إِلَى مَنْ هُوَ أَفْقَهُ مِنْهُ، وَرُبَّ حَامِلِ فِقْهٍ لَيْسَ بِفَقِيهٍ».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبانی کوڕی عوسمانی لە باوکیەوە ﵁ دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: لە نیوەڕۆدا زەیدی کوڕی سابیت ﵁ لەلای مەڕوان ڕۆیشت، گوتمان: بێگومان بەو کاتە کارێکی پێی بووە بۆیە ناردوویەتی بەدوایدا، بۆیە هەستاین و پرسیارمان لێ کرد، گوتی: مەڕوان لەو شتانەی کە لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیستوومانە

پرسیاری لێ کردین، گوێم لێ بوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «خوا ڕووی ئەو کەسە جوان و ڕۆشن بکات، کە گوێبیستی فەرموودەیەک ببێت لێمان، لەبەری بکات تا دەیگەیەنێت بەکەسێکی دی، چونکە لەوانەیە هەڵگری فەرموودەکە بیگەیەنێت بە کەسێک کە تێگەیشتن و شارەزایی لەو زیاتر بێت، لەوانەیە هەڵگری فەرموودەکە تێگەیشتن و شارەزایی نەبێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ رَوَى حَدِيثًا وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ كَذِبٌ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێک فەرموودەیەک بگێڕێتەوە و بشزانێت کە درۆیە

٥٨١. عَنِ المُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ حَدَّثَ عَنِّي حَدِيثًا وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ كَذِبٌ فَهُوَ أَحَدُ الكَاذِبِينَ».

موغیرەی کوڕی شوعبە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک (بەدرۆ) فەرموودەیەک لە من بگێڕێتەوە، بشزانێت کە ئەوە درۆیە، ئەو یەکێکە لە درۆزنەکان».



## بَابُ مَا نُهِيَ عَنْهُ أَنْ يُقَالَ عِنْدَ حَدِيثِ النَّبِيِّ ﷺ

باسی ئەوەی قەدەغەی لێ کراوە کە بگوترێت
لە کاتی گێڕانەوەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

٥٨٢. عَنْ أَبِي رَافِعٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا أُلْفِيَنَّ أَحَدَكُمْ مُتَّكِئًا عَلَى أَرِيكَتِهِ يَأْتِيهِ أَمْرٌ مِمَّا أَمَرْتُ بِهِ أَوْ نَهَيْتُ عَنْهُ، فَيَقُولُ: لَا أَدْرِي، مَا وَجَدْنَا فِي كِتَابِ اللَّهِ اتَّبَعْنَاهُ».

ئەبو ڕافیع ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بە یەکێك لە ئێوە نەگەم

و نەیبینم کە لەسەر لاتەنیشتێك دانیشتووە و کاتێك دەربارەی شتێك فەرمانێك، یان قەدەغەیەکی منی بۆ دێت، دەڵێت: من نازانم (یانی: بڕوام پێی نییە)! ئەوەی لە قورئان بینیمان، شوێنی دەکەوین (واتە: شوێن حەدیس ناکەوین!)».

٥٨٣. عَنِ المِقْدَامِ بْنِ مَعْدِي كَرِبَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَلَا هَلْ عَسَى رَجُلٌ يَبْلُغُهُ الحَدِيثُ عَنِّي وَهُوَ مُتَّكِئٌ عَلَى أَرِيكَتِهِ، فَيَقُولُ: بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ كِتَابُ اللَّهِ، فَمَا وَجَدْنَا فِيهِ حَلَالًا اسْتَحْلَلْنَاهُ، وَمَا وَجَدْنَا فِيهِ حَرَامًا حَرَّمْنَاهُ، وَإِنَّ مَا حَرَّمَ رَسُولُ اللَّهِ كَمَا حَرَّمَ اللَّهُ».

میقدامی کوڕی مەعدی کەریب رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئاگادار بن نزیکە (خەریکە ڕۆژگارێك دێت) پیاوێك لە شوێنێك پاڵ دەداتە سەر لاتەنیشتێکی، فەرموودەیەکی منی بۆ بگێڕدرێتەوە و بڵێت: ئێمە کتێبی خوامان لە نێوانە، ئەوەی تێیدا دەستمان کەوت حەڵاڵ بوو، ئەوە بە حەڵاڵی دەزانین، ئەوەی تێیدا دەستمان کەوت حەرام بوو، بە حەرامی دەزانین (دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاگادار و وریا بن!) بەدڵنیایی ئەوەی پێغەمبەری خوا حەرامی کردووە وەك ئەوە وایە خوا کە حەرامی کردووە».



تێبینی:

ئەم حەرام کراوە با لە قورئانیش نەبێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەخۆوە فەرمایشت نافەرموێت، هەرچی دەربارەی شەرع و ئایین فەرموویەتی: هەمووی بە فەمانی خوایە و بواری هەڵەکردن و نەپێکانی تێدا نییە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الحَدِيثِ عَنْ بني إسرائيل

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی قسەوباسی بەنو ئیسڕائیل

٥٨٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً

وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَا حَرَجَ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە منەوە ڕایبگەیەنن و بڵاوی بکەنەوە ئەگەر یەك ئایەتیش بێت، وە لە نەوەی ئیسرائیل (قسە) بگێڕنەوە هیچی تێدا نییە (مادام لەگەڵ قوڕئان و فەرموودە تێك نەگیرێت)، هەر کەسێك بەئەنقەست درۆ بە ناوی منەوە بکات، ئەوە با شوێنێك بۆ خۆی لەنێو ئاگردا ئامادە بکات».

## بَابُ مَا جَاءَ الدَّالُّ عَلَى الخَيْرِ كَفَاعِلِهِ

### باسی ئەوەی هاتووە کەوا ڕێنماییکەر بۆ کارێکی چاك وەکوو بکەرەکەیەتی

٥٨٥. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: أَتَى النَّبِيَّ ﷺ رَجُلٌ يَسْتَحْمِلُهُ، فَلَمْ يَجِدْ عِنْدَهُ مَا يَحْمِلُهُ فَدَلَّهُ عَلَى آخَرَ فَحَمَلَهُ، فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَأَخْبَرَهُ فَقَالَ: «إِنَّ الدَّالَّ عَلَى الخَيْرِ كَفَاعِلِهِ».



ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پیاوێک هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ داوای لێ کرد سوارییەکی پێ بدات (ئاژەڵێکی سواری)، هیچی سواری دەست نەکەوت کە پێی بدات، جا کەسێکی پیشان دا ئەویش سوارییەکی پێ دا، هاتەوە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی ڕاگەیاند، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: «هەر کەسێک کەسێکی دیکە ڕێنوێنی بکات بۆ ڕێگای چاکە، ئەوە بەئەندازەی ئەو کەسە چاکەی بۆ دەنووسرێت».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ دَعَا إِلَى هُدًى فَاتُّبِعَ أَوْ إِلَى ضَلَالَةٍ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێک بانگەشە بکات بۆ ڕێنمایی یان بۆ گومڕایی و خەڵکیش دوای بکەون

٥٨٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى كَانَ لَهُ مِنَ

الأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ يَتَّبِعُهُ لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلَالَةٍ كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ يَتَّبِعُهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک بانگەشە بکات بۆ ڕێگایەک کە جێی ڕەزامەندیی خوا بێت، ئەوە بەئەندازەی پاداشتی ئەوانەی کە شوێنی دەکەون پاداشتی بۆ هەیە، بەبێ ئەوەی لە پاداشتی هیچیان کەم بکرێتەوە، هەر کەسێک بانگەشەی گومڕایی بکات بەئەندازەی گوناهی ئەوانەی کە شوێنی دەکەون گوناهی بۆ دەنووسرێت، بەبێ ئەوەی لە گوناهی هیچیان کەم بکرێتەوە».

٥٨٧. عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَنَّ سُنَّةَ خَيْرٍ فَاتُّبِعَ عَلَيْهَا فَلَهُ أَجْرُهُ وَمِثْلُ أُجُورِ مَنِ اتَّبَعَهُ غَيْرَ مَنْقُوصٍ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا، وَمَنْ سَنَّ سُنَّةَ شَرٍّ فَاتُّبِعَ عَلَيْهَا كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهُ وَمِثْلُ أَوْزَارِ مَنِ اتَّبَعَهُ غَيْرَ مَنْقُوصٍ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْئًا».



جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک ڕێبازێکی چاک بگرێتە بەر و خەڵکی شوێنی بکەون، ئەوە لەسەر گرتنەبەری ئەو ڕێبازە باشە پاداشت وەردەگرێت، بەئەندازەی ئەو کەسەش کە شوێنی دەکەوێت پاداشت وەردەگرێت، بەبێ ئەوەی لە پاداشتی هیچیان کەم بکرێتەوە، هەر کەسێکیش ڕێبازێکی خراپ بگرێتە بەر و خەڵکیش شوێنی بکەون لەسەر ئەو ڕێبازەی کە دایهێناوە، ئەوە گوناهی ئەو کردەوەیەی لەسەرە، بەئەندازەی گوناهی ئەو کەسەش کە شوێنی دەکەوێت لەو کارە خراپە گوناهی لەسەرە، بەبێ ئەوەی لە گوناهی هیچیان کەم ببێتەوە».

# أَبْوَابُ الِاسْتِئْذَانِ وَالْآدَابِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی دواکردنی ڕێپێدان و ئادابەکان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ



### بَابُ مَا جَاءَ فِي إِفْشَاءِ السَّلَامِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی بڵاوکردنەوەی سڵاو

٥٨٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا تَدْخُلُوا الجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى أَمْرٍ إِذَا أَنْتُمْ فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە، ناچنە بەهەشت هەتا ئیمان نەهێنن، هەتا یەکدیشتان خۆش نەوێت ئیمانتان تەواو نابێت! جا ئایا کارێکتان پێ بڵێم ئەگەر ئەنجامی بدەن بەهۆیەوە یەکدیتان خۆش دەوێت؟ لەنێو خۆتان سڵاو بڵاو بکەنەوە».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي التَّسْلِيمِ عَلَى الصِّبْيَانِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سڵاوکردن لە منداڵان

٥٨٩. عَنْ سَيَّارٍ قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ ثَابِتٍ البُنَانِيِّ، فَمَرَّ عَلَى صِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ

فَقَالَ ثَابِتٌ: كُنْتُ مَعَ أَنَسٍ، فَمَرَّ عَلَى صِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ، وَقَالَ أَنَسٌ: كُنْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَمَرَّ عَلَى صِبْيَانٍ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ.

سەییار دەڵێت: لەگەڵ سابیتی بونانی دەڕۆیشتم، کاتێك بەلای هەندێك منداڵ تێپەڕیی سڵاوی لێ کردن، ئینجا سابیت گوتی: لەگەڵ ئەنەس بووم، کاتێك بەلای هەندێك منداڵدا تێپەڕیی و سڵاوی لێ کردن، ئەنەس گوتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووم بەلای هەندێك منداڵدا تێپەڕیی و سڵاوی لێ کردن.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي السَّلَامِ عَلَى مَجْلِسٍ فِيهِ الْمُسْلِمُونَ وَغَيْرُهُمْ

### باسی ئەوەی هاتووە لە سڵاوکردن لە کۆڕێک کەوا موسوڵمان و ناموسوڵمانی تێدا بێت



٥٩٠. عَنْ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ رضي الله عنهما: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ بِمَجْلِسٍ وَفِيهِ أَخْلَاطٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ وَالْيَهُودِ فَسَلَّمَ عَلَيْهِمْ.

ئوسامەی کوڕی زەید رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بەلای کۆڕێکدا تێپەڕیی کە تێکەڵ بوو لە موسوڵمان و جوولەکە، پێغەمبەر ﷺ سڵاوی لێ کردن.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَسْلِيمِ الرَّاكِبِ عَلَى الْمَاشِي

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سڵاوکردنی سوار لە پیادە

٥٩١. عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «يُسَلِّمُ الْفَارِسُ عَلَى الْمَاشِي، وَالْمَاشِي عَلَى الْقَائِمِ، وَالْقَلِيلُ عَلَى الْكَثِيرِ».

فەزالەی کوڕی عوبەید رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سوار سڵاو لە پیادە دەکات، پیادە سڵاو لە وەستاو دەکات، کەم سڵاو لە زۆر دەکات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ طُرُوقِ الرَّجُلِ أَهْلَهُ لَيْلاً

### باسی ئەوەی هاتووە لە ناپەسندیی چوونەماڵەوە لە شەودا

٥٩٢. عَنْ جَابِرٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَاهُمْ أَنْ يَطْرُقُوا النِّسَاءَ لَيْلاً.

جابیر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی لێ کردن کە بە شەو (کاتێك لە گەشت گەڕانەوە بەبێ ئاگادارکردنەوە) بچنە لای خێزانەکانیان.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُصَافَحَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی تەوقەکردن

٥٩٣. عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ إِلَّا غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا».

بەڕائی کوڕی عازیب ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر دوو موسوڵمانێک بگەنە یەکدی و تەوقە بکەن، بەدڵنیایی خوا لێیان خۆش دەبێت پێش ئەوەی لە یەکدی جیا ببنەوە».



# أبْوَابُ الْأَدَبِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی ڕەفتارەکان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي تَشْمِيتِ العَاطِسِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی دوعاکردن لە کاتی پژمین



٥٩٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لِلْمُؤْمِنِ عَلَى المُؤْمِنِ سِتُّ خِصَالٍ، يَعُودُهُ إِذَا مَرِضَ وَيَشْهَدُهُ إِذَا مَاتَ، وَيُجِيبُهُ إِذَا دَعَاهُ، وَيُسَلِّمُ عَلَيْهِ إِذَا لَقِيَهُ، وَيُشَمِّتُهُ إِذَا عَطَسَ، وَيَنْصَحُ لَهُ إِذَا غَابَ أَوْ شَهِدَ».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بڕوادار شەش مافی هەیە بەسەر بڕوادارەوە: کاتێک نەخۆش کەوت سەردانی بکات، کاتێک مرد ئامادە ببێت (هەتا دەنێژرێت)، کاتێک دەعوەتی کرد بەدەمیەوە بچێت، کاتێک پێی گەیشت سڵاوی لێ بکات، کاتێکیش دەپژمێت دوعای بۆ بکات (پێی بڵێت: یرحمک الله)، بۆی دڵسۆز بێت لە کاتێکدا نادیار بێت، یان ئامادە بێت».

٥٩٥. عَنْ أَبِي أَيُّوبَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِذَا عَطَسَ أَحَدُكُمْ فَلْيَقُلْ: الحَمْدُ لِلَّهِ عَلَى كُلِّ حَالٍ، وَلْيَقُلِ الَّذِي يَرُدُّ عَلَيْهِ، يَرْحَمُكَ اللَّهُ، وَلْيَقُلْ هُوَ: يَهْدِيكُمُ اللَّهُ وَيُصْلِحُ بَالَكُمْ».

ئەبو ئەییووب ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر یەکێکتان پژمی با بڵێت: ستاییش بۆ خوا لە هەموو حاڵەتێک، ئەوەی وەڵام دەداتەوە بڵێت: خوا ڕەحمت پێ بکات، ئەویش بڵێت: خوا ڕێنموویت بکات و حاڵت باش بکات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي خَفْضِ الصَّوْتِ وَتَخْمِيرِ الوَجْهِ عِنْدَ العُطَاسِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی نزمکردنەوەی دەنگ و داپۆشینی دەم لە کاتی پژمین

٥٩٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا عَطَسَ غَطَّى وَجْهَهُ بِيَدِهِ أَوْ بِثَوْبِهِ وَغَضَّ بِهَا صَوْتَهُ.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك پژمیبا ڕوخساری پیرۆزی بە دەستەکان یان بە پۆشاکی دادەپۆشی، دەنگیشی نزم دەکردەوە.



## بَابُ كَرَاهِيَةِ أَنْ يُقَامَ الرَّجُلُ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ يُجْلَسَ فِيهِ

### باسی ناپەسندیی هەستاندنی کەسێک لە شوێنەکەی و پاشان لە شوێنی دابنیشیت

٥٩٧. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يُقِيمُ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ يَجْلِسُ فِيهِ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «با یەکێك لە ئێوە براکەی لە شوێنی دانیشتنی هەڵنەستێنێت، ئینجا خۆی بچێت لە شوێنی دابنیشێت».

## بَابُ مَا جَاءَ إِذَا قَامَ الرَّجُلُ مِنْ مَجْلِسِهِ ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ

### باسی ئەوەی هاتووە ئەگەر کەسێک لە شوێنەکەی هەڵسێت، پاشان گەڕایەوە ئەو شایستەترە بەو شوێنە

٥٩٨. عَنْ وَهْبِ بْنِ حُذَيْفَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «الرَّجُلُ أَحَقُّ بِمَجْلِسِهِ

وَإِنْ خَرَجَ لِحَاجَتِهِ ثُمَّ عَادَ فَهُوَ أَحَقُّ بِمَجْلِسِهِ».

وەهبی کوڕی حوزەیفە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کەسێک شیاوترە بە شوێنی دانیشتنەکەی خۆی، ئەگەر هاتو دەرچوو بۆ کارێکی ئینجا گەڕایەوە، هەر ئەو شیاوترە بە شوێنی دانیشتنەکەی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ الجُلُوسِ بَيْنَ الرَّجُلَيْنِ بِغَيْرِ إِذْنِهِمَا

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی دانیشتن لە نێوان دوو کەس بەبێ موڵەتیان

٥٩٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَ اثْنَيْنِ إِلَّا بِإِذْنِهِمَا».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرِ ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «دروست نییە بۆ کەسێک بچێتە نێوان دوو کەس مەگەر مۆڵەتی پێ بدەن».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ قِيَامِ الرَّجُلِ لِلرَّجُلِ

### باسی ئەوەی هاتووە لە ناپەسندیی هەڵسانەوەی کەسێک بۆ کەسێکی دیکە

٦٠٠. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: لَمْ يَكُنْ شَخْصٌ أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَكَانُوا إِذَا رَأَوْهُ لَمْ يَقُومُوا لِمَا يَعْلَمُونَ مِنْ كَرَاهِيَتِهِ لِذَلِكَ.

ئەنەس ﷺ دەڵێت: هاوەڵان هیچ کەسێکیان لەلا خۆشەویستتر نەبووە لە پێغەمبەری خوا ﷺ، (لەگەڵ ئەوەشدا) ئەگەر چاویان پێی کەوتبایە هەڵنەدەستانەوە لەبەری، چونکە دەیانزانی پێی ناخۆشە.

## بَابٌ فِي التَّوْقِيتِ فِي تَقْلِيمِ الأَظْفَارِ وَأَخْذِ الشَّارِبِ

### باسێک دەربارەی دانانی کات بۆ نینۆک و سمێڵ کورتکردنەوە

٦٠١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ وَقَّتَ لَهُمْ فِي كُلِّ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً تَقْلِيمَ الأَظْفَارِ، وَأَخْذَ الشَّارِبِ، وَحَلْقَ العَانَةِ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتی بۆ دیاری کردن کە لە چل شەو زیاتر تێپەڕ نەبێت بۆ نینۆککردن، کورتکردنەوەی سمێڵ، هەڵکێشانی مووی بنباڵ و تاشینی مووی داوێن.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِعْفَاءِ اللِّحْيَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ڕیش هێشتنەوە

٦٠٢. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «احْفُوا الشَّوَارِبَ وَاعْفُوا اللِّحَى».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «سمێڵتان کورت بکەنەوە، ڕیشتان بهێڵنەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي نَظْرَةِ الْفُجَاءَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سەیرکردنی (حەرامی) لەناکاو

٦٠٣. عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ نَظْرَةِ الفُجَاءَةِ، فَأَمَرَنِي أَنْ أَصْرِفَ بَصَرِي.

جوڕەیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد سەبارەت بە سەیرکردنی لەناکاو (بۆ ڕەگەزی بەرانبەر)، فەرمانی پێ کردم کەوا چاوم لاببەم و بەردەوام نەبم لە سەیرکردنی.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَحْذِيرِ فِتْنَةِ النِّسَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئاگادارکردنەوە لە تاقیکردنەوەی ئافرەتان

٦٠٤. عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ، وَسَعِيدِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِي النَّاسِ فِتْنَةً أَضَرَّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ».

ئوسامەی کوڕی زەید و سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: «هیچ شتێکم لەدوای خۆم بەجێ نەهێشتووە لە تاقیکردنەوە کە زیانبەخشتر بێت بۆ پیاوان لە ئافرەتان».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُتَشَبِّهَاتِ بِالرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی خۆچواندنی پیاوان بە ئافرەتان

٦٠٥. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمُتَشَبِّهَاتِ بِالرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْمُتَشَبِّهِينَ بِالنِّسَاءِ مِنَ الرِّجَالِ.

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لەو ئافرەتانەی خۆیان دەچوێنن بە پیاوان، لەو پیاوانەش کە خۆیان دەچوێنن بە ئافرەتان.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي كَرَاهِيَةِ رَدِّ الطِّيبِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناپەسندیی ڕەتکردنەوەی بۆن و گوڵاو

٦٠٦. عَنْ ثُمَامَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: كَانَ أَنَسٌ ﵁ لَا يَرُدُّ الطِّيبَ، وَقَالَ أَنَسٌ: إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَا يَرُدُّ الطِّيبَ.

سومامەی کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت: ئەنەس ﵁ گوڵاوی ڕەت نەدەکردەوە، ئەنەس دەشیگوت: بێگومان پێغەمبەری خوا ﷺ کاتی خۆی گوڵاوی ڕەت نەدەکردەوە.

## بَابٌ فِي كَرَاهِيَةِ مُبَاشَرَةِ الرِّجَالِ الرِّجَالَ وَالمَرْأَةِ المَرْأَةَ

### باسێک دەربارەی ناپەسندیی سەیرکردنی لاشەی پیاو بۆ پیاو و ئافرەت بۆ ئافرەت



٦٠٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا تُبَاشِرُ المَرْأَةُ المَرْأَةَ حَتَّى تَصِفَهَا لِزَوْجِهَا كَأَنَّمَا يَنْظُرُ إِلَيْهَا».

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئافرەت نابێت سەیری تەواوی لاشەی ئافرەتێکی دیکە بکات، بۆئەوەی شێوەکەی بۆ پیاوەکەی باس بکات، بە شێوەیەک (بۆی باس بکات) هەروەک سەیری بکات و بیبینێت».

## بَابُ مَا جَاءَ أَنَّ الفَخِذَ عَوْرَةٌ

### باسی ئەوەی هاتووە کە ڕان (ی پیاو) عەوڕەتە

٦٠٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الْفَخِذُ عَوْرَةٌ».

ئیبن عەبباس ﵄ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ڕان عەوڕەتە».

## بَابُ مَا جَاءَ لَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ ثَالِثٍ

باسی ئەوەی هاتووە دوو کەس بەنهێنی قسە نەکەن
و خۆیان لە کەسی سێیەم جیا بکەنەوە

٦٠٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ صَاحِبِهِمَا».

عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر سێ کەس بوون با دوو کەستان بەنهێنی قسە نەکەن، خۆیان لە کەسی سێیەم جیا بکەنەوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کەسێک بڵێت بە دایک و باوکەوە بەفیدات بم

٦١٠. عَنْ عَلِيٍّ ﷺ قَالَ: مَا سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ جَمَعَ أَبَوَيْهِ لِأَحَدٍ غَيْرَ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ.

عەلی ﷺ دەڵێت: هەرگیز گوێم لە پێغەمبەر ﷺ نەبووە دایک و باوکی خۆی بەیەکەوە بۆ کەس فیدا بکات جگە لە سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص.

## بَابُ مَا جَاءَ مَا يُسْتَحَبُّ مِنَ الأَسْمَاءِ

باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو ناوانەی پەسندن

٦١١. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَحَبُّ الأَسْمَاءِ إِلَى اللَّهِ عَبْدُ اللَّهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ».

ئیبن عومەر ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «خۆشەویسترینی

نێو ناوەکان لەلای خوا ناوی عەبدوڵلا و عەبدوڕڕەحمانە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَغْيِيرِ الأَسْمَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گۆڕینی ناوەکان

٦١٢. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُغَيِّرُ الِاسْمَ القَبِيحَ.

عائیشە رضي الله عنها دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ ناوی ناشیرینی دەگۆڕی بۆ ناوی دیکە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي أَسْمَاءِ النَّبِيِّ ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ناوەکانی پێغەمبەر ﷺ



٦١٣. عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِي أَسْمَاءً، أَنَا مُحَمَّدٌ، وَأَنَا أَحْمَدُ، وَأَنَا المَاحِي الَّذِي يَمْحُو اللَّهُ بِيَ الكُفْرَ، وَأَنَا الحَاشِرُ الَّذِي يُحْشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمِي، وَأَنَا العَاقِبُ الَّذِي لَيْسَ بَعْدِي نَبِيٌّ».

جوبەیری کوڕی موتعیم رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی من چەند ناوێکم هەیە، من ناوم موحەممەدە، ناوم ئەحمەدە، ناوم ئەلماحییە، کە خوا بەهۆی منەوە بێبڕوایی دەسڕێتەوە، ناوم ئەلحاشیرە، کە خەڵکی لەدوای شوێنپێی منەوە بەرەو مەحشەر دەڕۆن، ناوی من ئەلعاقیبە، کە دوای من پێغەمبەری دیکە نییە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي إِنْشَادِ الشِّعْرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گوتنی هۆنراوە

٦١٤. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَضَعُ لِحَسَّانَ مِنْبَرًا فِي المَسْجِدِ

يَقُومُ عَلَيْهِ قَائِمًا، يُفَاخِرُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ - أَوْ قَالَتْ: يُنَافِحُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ - وَيَقُولُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ يُؤَيِّدُ حَسَّانَ بِرُوحِ القُدُسِ مَا يُفَاخِرُ، أَوْ يُنَافِحُ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ».

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە مزگەوت سەکۆیەکی بۆ حەسسان دانا و بەپێوە لەسەری دەوەستا، شانازیی دەکرد بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕێگای هۆنراوەکانی، -یان گوتی: بەرگریی دەکرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ -، پێغەمبەری خواش ﷺ دەیفەرموو: «بەڕاستی خوا پشتیوانی حەسان دەکات لە ڕێگەی جیبریلەوە، بەهۆی شانازیکردنەکەی یان بەرگریکردنەکەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ».

٦١٥. عَنْ أَنَسٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ دَخَلَ مَكَّةَ فِي عُمْرَةِ القَضَاءِ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ بَيْنَ يَدَيْهِ يَمْشِي وَهُوَ يَقُولُ:

خَلُّوا بَنِي الكُفَّارِ عَنْ سَبِيلِهِ ... اليَوْمَ نَضْرِبْكُمْ عَلَى تَنْزِيلِهِ

ضَرْبًا يُزِيلُ الهَامَ عَنْ مَقِيلِهِ ... وَيُذْهِلُ الخَلِيلَ عَنْ خَلِيلِهِ

فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: يَا ابْنَ رَوَاحَةَ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَفِي حَرَمِ اللَّهِ تَقُولُ الشِّعْرَ؟ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «خَلِّ عَنْهُ يَا عُمَرُ، فَلَهِيَ أَسْرَعُ فِيهِمْ مِنْ نَضْحِ النَّبْلِ».

ئەنەس ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە عومرەی قەزاکردنەوە چووە نێو شاری مەککە، عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەش لەپێش پێغەمبەری خوا ﷺ دەڕۆیشت و دەیگوت:

ئەی بێبڕوایان ڕێگای پێ بدەن ... ئەگەرنا ئەمڕۆ لێتان دەدەین بەهۆی قورئانەوە

لێدانێک سەر لەشوێنی خۆی بپەڕێنێت ... خۆشەویست بێئاگا بکات لە خۆشەویست

ئینجا عومەر گوتی: ئەی کوڕی ڕەواحە لە بەردەم پێغەمبەری خوا ﷺ و لە حەرەمی خوادا هۆنراوە دەڵێیت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لێی بگەڕێ ئەی عومەر، هۆنراوەکانی ئەو لە لێدانی تیر کاریگەرترە لەسەر دڵی بێبڕوایان.

٦١٦. عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ ﵁ قَالَ: جَالَسْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَكْثَرَ مِنْ مِائَةِ مَرَّةٍ، فَكَانَ أَصْحَابُهُ يَتَنَاشَدُونَ الشِّعْرَ، وَيَتَذَاكَرُونَ أَشْيَاءَ مِنْ أَمْرِ الجَاهِلِيَّةِ وَهُوَ سَاكِتٌ، فَرُبَّمَا يَتَبَسَّمُ مَعَهُمْ.

جابیری كوڕی سەموڕە ﵁ دەڵێت: زیاتر لە سەد جار -دانیشتنێكی زۆر- لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دانیشتوومە، كە (لەو كاتەدا) هاوەڵانی هۆنراوەیان لەنێو یەكدیدا دەگوت، باسی بەسەرهات و كاری سەردەمی نەفامییان دەكرد و پێغەمبەری خواش ﷺ بێدەنگ دەبوو، جاری وا هەبوو لەگەڵیشیان پێدەكەنی.

٦١٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَتَخَوَّلُنَا بِالمَوْعِظَةِ فِي الأَيَّامِ مَخَافَةَ السَّآمَةِ عَلَيْنَا.

عەبدوڵلا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ لە چەند ڕۆژێكی دیاریكراودا ئامۆژگاری دەكردین (نەك هەموو ڕۆژێك)، ئەوەش بۆئەوەی دووچاری بێزاری و بێئومێدبوون نەبین.



## بَابٌ

## باسێك

٦١٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ أَحَبُّ العَمَلِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَا دِيمَ عَلَيْهِ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: خۆشەویستترین كردەوە لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو كارە بوو كە (مرۆڤ) بەردەوام بێت لەسەری (ئەگەر كەمیش بوایە).



# أَبْوَابُ الْأَمْثَالِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## كۆباسی وێنەهێنانەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابُ مَا جَاءَ فِي مَثَلِ النَّبِيِّ ﷺ وَالأَنْبِيَاءِ قَبْلَهُ

**باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی وێنەی پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەرانی پێش خۆی**



٦١٩. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ الأَنْبِيَاءِ قَبْلِي كَرَجُلٍ بَنَى دَارًا فَأَكْمَلَهَا وَأَحْسَنَهَا إِلَّا مَوْضِعَ لَبِنَةٍ، فَجَعَلَ النَّاسُ يَدْخُلُونَهَا وَيَتَعَجَّبُونَ مِنْهَا وَيَقُولُونَ لَوْلَا مَوْضِعُ اللَّبِنَةِ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی وێنەی من و پێغەمبەرانی پێش من وەک کەسێکە کە خانوویەک دروست بکات، تەواوی بکات، ڕێک و جوانی بکات، تەنیا شوێنی خشتێک نەبێت (جێی بهێڵێت)، ئینجا خەڵکی بچنە نێو خانووەکە و پێی سەرسام بن، بڵێن خۆزگە ئەو خشتەیەش دانرابایە (موحەممەد جوانکار و تەواوکاری پێغەمبەرایەتییە ﷺ)».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي مَثَلِ الْمُؤْمِنِ الْقَارِئِ لِلْقُرْآنِ وَغَيْرِ الْقَارِئِ

**باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی جیاوازی وێنەی بڕوادای قوڕئانخوێن و قوڕئاننەخوێن**

٦٢٠. عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ الْمُؤْمِنِ الَّذِي

يَقْرَأُ القُرْآنَ كَمَثَلِ الْأُتْرُجَّةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا طَيِّبٌ، وَمَثَلُ المُؤْمِنِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ القُرْآنَ كَمَثَلِ التَّمْرَةِ لَا رِيحَ لَهَا وَطَعْمُهَا حُلْوٌ، وَمَثَلُ المُنَافِقِ الَّذِي يَقْرَأُ القُرْآنَ كَمَثَلِ الرَّيْحَانَةِ رِيحُهَا طَيِّبٌ وَطَعْمُهَا مُرٌّ، وَمَثَلُ المُنَافِقِ الَّذِي لَا يَقْرَأُ القُرْآنَ كَمَثَلِ الحَنْظَلَةِ رِيحُهَا مُرٌّ وَطَعْمُهَا مُرٌّ».

ئەبو مووسای ئەشعەری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «وێنەی ئەو بڕوادارەی کە قورئان دەخوێنێت وەکوو وێنەی کەباد وایە (شێوەی بە لیمۆ دەچێت)، بۆنی خۆشە و تامەکەشی خۆشە، وێنەی ئەو بڕوادارەش کە قورئان ناخوێنێت وەکوو خورما وایە، بۆنی نییە، بەڵام تامەکەی خۆشە، وێنەی کەسی دووڕووش کە قورئان دەخوێنێت وەکوو وێنەی ڕەیحان وایە، بۆنی خۆشە و تامەکەی تاڵە، وێنەی ئەو دووڕووەش کە قورئان ناخوێنێت وەکوو گوژاڵک وایە، بۆنەکەی ناخۆشە و تامەکەشی تاڵە».

٦٢١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ المُؤْمِنِ كَمَثَلِ الزَّرْعِ لَا تَزَالُ الرِّيَاحُ تُفَيِّئُهُ، وَلَا يَزَالُ المُؤْمِنُ يُصِيبُهُ بَلَاءٌ، وَمَثَلُ المُنَافِقِ مَثَلُ شَجَرَةِ الأَرْزِ لَا تَهْتَزُّ حَتَّى تُسْتَحْصَدَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «وێنەی کەسی بڕوادار وەکوو دانەوێڵە وایە، بەبەردەوامی با ئەملاولای پێ دەکات، بڕواداریش بەردەوام دووچاری بەڵا و گرفتاریی دەبێتەوە، وێنەی کەسی دووڕووش وەکوو دارسنۆبەر وایە، هیچ شتێک نایهەژێنێت تا لەناو دەچێت».

## بَابٌ

## باسێك

٦٢٢. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَثَلُ أُمَّتِي مَثَلُ المَطَرِ لَا يُدْرَى أَوَّلُهُ خَيْرٌ أَمْ آخِرُهُ».

ئەنەس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «وێنەی ئوممەتی من وەک باران وایە، نازانرێت سەرەتایەکەی خێر و بێرە یان کۆتاییەکەی (لە هەموو سەردەمێکدا خێر و باشەی بەردەوامە)».

## بابٌ

### باسێك

٦٢٣. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّمَا النَّاسُ كَإِبِلٍ مِائَةٍ، لَا يَجِدُ الرَّجُلُ فِيهَا رَاحِلَةً».

ئیبن عومەر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی وێنەی خەڵک وەک ڕەوە وشتری سەد دانەیی وایە، بەئەستەم وشترێکی باشی تێدا دەست دەکەوێت بۆ بارکردن (کەم کەس هەیە شایستەی بەرپرسیارییەتی بێت)».



٦٢٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ أُمَّتِي كَمَثَلِ رَجُلٍ اسْتَوْقَدَ نَارًا، فَجَعَلَتِ الذُّبَابُ وَالفَرَاشُ يَقَعْنَ فِيهَا وَأَنَا آخُذُ بِحُجَزِكُمْ وَأَنْتُمْ تَقَحَّمُونَ فِيهَا».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەڕاستی وێنەی من و ئوممەتەکەم وەک وێنەی پیاوێک وایە ئاگرێک داگیرسێنێت، جا مێشوولە و پەپوولە خۆیان بخەنە نێوی، من لەدواوە ڕاتاندەکێشم، ئێوەش ڕووتان تێ کردووە دەتانەوێت بچنە نێویەوە».

# أَبْوَابُ فَضَائِلِ الْقُرْآنِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی گەورەییەکانی قورئان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ



### بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ سُورَةِ البَقَرَةِ وَآيَةِ الكُرْسِيِّ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێگە و گەورەیی سوورەتی بەقەرە و ئایەتول کورسی

٦٢٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ، وَإِنَّ البَيْتَ الَّذِي تُقْرَأُ فِيهِ البَقَرَةُ لَا يَدْخُلُهُ الشَّيْطَانُ».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نەکەن ماڵەکانتان بکەنە گۆڕستان (بەهۆی نەخوێندنی قورئان تێیدا)، بەڕاستی ماڵێک سوورەتی بەقەرەی تێدا بخوێنرێت، شەیتان ناچێتە نێوی».

### بَابُ مَا جَاءَ فِي آخِرِ سُورَةِ البَقَرَةِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی کۆتایی سوورەتی بەقەرە

٦٢٦. عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَرَأَ الآيَتَيْنِ مِنْ

آخِرِ سُورَةِ البَقَرَةِ فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ».

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە شەودا دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتی بەقەڕە بخوێنێت ئەوە بەسیەتی (پارێزراو دەبێت)».

٦٢٧. عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ كِتَابًا قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ بِأَلْفَيْ عَامٍ، أَنْزَلَ مِنْهُ آيَتَيْنِ خَتَمَ بِهِمَا سُورَةَ الْبَقَرَةِ، وَلَا يُقْرَآنِ فِي دَارٍ ثَلَاثَ لَيَالٍ فَيَقْرَبُهَا شَيْطَانٌ».

نوعمانی کوڕی بەشیر ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «بێگومان خوا نووسراوێکی نووسی پێش دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی بە دوو هەزار ساڵ، لەم نووسراوەدا دوو ئایەتی دابەزاندووە کە سوورەتی بەقەڕەی کۆتایی پێ هێناوە، لە هەر ماڵێک بخوێنرێن سێ شەو شەیتان نزیکی ئەو ماڵە ناکەوێتەوە».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سوڕەتی ئالی عیمڕان

٦٢٨. عَنْ نَوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَأْتِي القُرْآنُ وَأَهْلُهُ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ بِهِ فِي الدُّنْيَا تَقْدُمُهُ سُورَةُ البَقَرَةِ وَآلُ عِمْرَانَ»، قَالَ نَوَّاسٌ: وَضَرَبَ لَهُمَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثَةَ أَمْثَالٍ مَا نَسِيتُهُنَّ بَعْدُ قَالَ: «تَأْتِيَانِ كَأَنَّهُمَا غَيَابَتَانِ وَبَيْنَهُمَا شَرْقٌ، أَوْ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ سَوْدَاوَانِ، أَوْ كَأَنَّهُمَا ظُلَّةٌ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ تُجَادِلَانِ عَنْ صَاحِبِهِمَا».

نەوواسی کوڕی سەمعان ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «(لە ڕۆژی دوایی) قورئان و ئەهلی قورئان دێن، ئەوانەی لە دونیا کاریان پێ کردووە، سووڕەتی بەقەڕە و ئالی عیمڕان پێشیان دەکەون». نەوواس ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری

خوا ﷺ بۆ هەردووکیان سێ وێنەی هێنایەوە، هیچیانم لەبیر نەکردووە تا ئێستا، فەرمووی: «هەردوو سوڕەت کاتێک دێنە مەحشەر وەکوو دوو پەڵە هەورن کە نێوانیان هەبێت، یان وەک دوو پارچە هەوری ڕەش و چڕن، یان وەکوو سێبەری دوو پۆلە باڵندەی باڵکراوەن، دێنە مەحشەر و گفتوگۆ دەکەن بۆ بەرگریکردن لە خاوەنەکانیان».

* وَمَعْنَى هَذَا الحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ العِلْمِ أَنَّهُ يَجِيءُ ثَوَابُ قِرَاءَتِهِ، كَذَا فَسَّرَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ هَذَا الحَدِيثَ وَمَا يُشْبِهُ هَذَا مِنَ الأَحَادِيثِ أَنَّهُ يَجِيءُ ثَوَابُ قِرَاءَةِ القُرْآنِ. وَفِي حَدِيثِ النَّوَّاسِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ مَا يَدُلُّ عَلَى مَا فَسَّرُوا، إِذْ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «وَأَهْلُهُ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ بِهِ فِي الدُّنْيَا». فَفِي هَذَا دَلَالَةٌ أَنَّهُ يَجِيءُ ثَوَابُ العَمَلِ.

واتای ئەم فەرموودەیە لەلای زانایان ئەوەیە کە پاداشتی قوڕئانخوێندنەکەی دێت (نەک خودی قوڕئانەکە)، هەندێک لە زانایان هەر بەوشێوەیە شیکردنەوەیان کردووە بۆ ئەم فەرموودەیە و هاوشێوەکانی لە فەرموودەکانی دیکە، (کە پاداشتی خوێندنەوەکەی قوڕئان دێت لە ڕۆژی دوایی)، لە فەرموودەکەی نەوواسدا کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕێتەوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شیکردنەوەیان بۆ کردووە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «قوڕئان و ئەهلی قوڕئان دێن، ئەوانەی کە لە دونیا کاریان پێ کردووە»، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە پاداشتی خوێندنەوەی قوڕئان دێت (لە ڕۆژی دوایی).



## بَابُ مَا جَاءَ فِي سُورَةِ الإِخْلَاصِ

## باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سووڕەتی ئیخلاص

٦٢٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «{قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}، تَعْدِلُ ثُلُثَ القُرْآنِ».

ئەبو هوڕەیڕە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: « (پاداشتی) خوێندنی

سوورەتی: {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}، بەرانبەرە بە پاداشتی (خوێندنی) سێیەکی قورئان».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي الْمُعَوِّذَتَيْنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی هەردوو سوورەتی فەلەق و ناس

٦٣٠. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ الْجُهَنِيِّ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «قَدْ أَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيَّ آيَاتٍ لَمْ يُرَ مِثْلُهُنَّ: {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ} الناس: ١، إِلَى آخِرِ السُّورَةِ، وَ: {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ} الفلق: ١، إِلَى آخِرِ السُّورَةِ».

عوقبە کوڕی عامیری جوهەنی رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «خوا چەند ئایەتێکی بۆ دابەزاندووم کە پێشتر هاووێنەیان نەبینراوە: {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ}، تا کۆتایی سوورەتەکە، هەروەها: {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ}، تا کۆتایی سوورەتەکە».



## بَابُ مَا جَاءَ فِي تَعْلِيمِ الْقُرْآنِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی فێرکردنی قورئان

٦٣١. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ».

عوسمانی کوڕی عەففان رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «چاکترینتان ئەو کەسەیە فێری قورئان ببێت و خەڵکیش فێر بکات».

## بَابُ مَا جَاءَ فِيمَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنَ الْقُرْآنِ مَالَهُ مِنَ الأَجْرِ

باسی ئەوەی هاتووە ئەگەر کەسێک پیتێک لە قورئان بخوێنێت چ پاداشتێکی دەست دەکەوێت

٦٣٢.عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﷺ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ قَرَأَ حَرْفًا مِنْ كِتَابِ اللَّهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنَةٌ، وَالحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا، لَا أَقُولُ الم حَرْفٌ، وَلَكِنْ أَلِفٌ حَرْفٌ وَلَامٌ حَرْفٌ وَمِيمٌ حَرْفٌ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک پیتێک لە قورئان بخوێنێت ئەوە یەک چاکەی دەست دەکەوێت، چاکەیەکیش (لەلای خوا) بە دە چاکەیە، ناڵێم (الم) پیتێکە، بەڵکوو ئەلیف پیتێکە، لام پیتێکە، میم پیتێکە».



## بَابٌ

باسێك

٦٣٣.عَنْ جَابِرٍ ﷺ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ قَدْ يَعْرِضُ نَفْسَهُ بِالْمَوْقِفِ، فَقَالَ: «أَلَا رَجُلٌ يَحْمِلْنِي إِلَى قَوْمِهِ؟ فَإِنَّ قُرَيْشًا قَدْ مَنَعُونِي أَنْ أُبَلِّغَ كَلَامَ رَبِّي».

جابیر ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ لە شوێنەکان خۆی دەناساند و پەیامەکەی نماییش دەکرد، دەیفەرموو: «ئایا پیاوێک نییە بمبات بۆ نێو گەلەکەی؟ چونکە قورەیشییەکان ڕێگریم لێ دەکەن لەوەی فەرمایشتی خوا بگەیەنم (بە خەڵکی)».

# أَبْوَابُ الْقِرَاءَاتِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی شێوەکانی خوێندنی قورئان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابٌ فِي فَاتِحَةِ الكِتَابِ

باسێک دەربارەی سەرەتای قورئان (فاتیحە)



٦٣٤. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُقَطِّعُ قِرَاءَتَهُ يَقْرَأُ: {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ} الفاتحة: ١، ثُمَّ يَقِفُ، {الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ} الفاتحة: ٢، ثُمَّ يَقِفُ، وَكَانَ يَقْرَؤُهَا: {مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ} الفاتحة: ٣.

ئوم سەلەمە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانخوێندنی بە شێوەیەک بوو کە خوێندنی (ئایەتەکانی) لەیەک دادەبڕی، دەیفەرموو: {الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ}، ئینجا دەوەستا، {الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ}، ئینجا دەوەستا، بە: {مَلِكِ يَوْمِ الدِّينِ}، دەیخوێندەوە (پیتی میمی بە فەتحە دەخوێندەوە نەک بە ئەلیف).

# بَابٌ

## باسێك

٦٣٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «لَمْ يَفْقَهْ مَنْ قَرَأَ الْقُرْآنَ فِي أَقَلَّ مِنْ ثَلَاثٍ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمرٍ ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە ماوەی کەمتر لە سێ ڕۆژ هەموو قورئان بخوێنێتەوە، ئەوە لێی تێناگات».



# أبْوَابُ تَفْسِيرِ الْقُرْآنِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی تەفسیرکردنی قورئان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ فَاتِحَةِ الكِتَابِ

### باسێک: لە سوورەتی فاتیحەوە



٦٣٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ صَلَّى صَلَاةً لَمْ يَقْرَأْ فِيهَا بِأُمِّ القُرْآنِ فَهِيَ خِدَاجٌ فَهِيَ خِدَاجٌ، غَيْرُ تَمَامٍ»، قَالَ: قُلْتُ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ، إِنِّي أَحْيَانًا أَكُونُ وَرَاءَ الإِمَامِ، قَالَ: يَا ابْنَ الفَارِسِيِّ، فَاقْرَأْهَا فِي نَفْسِكَ.

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک نوێژێک بکات و سوورەتی فاتیحەی تێدا نەخوێنێت، ئەوە نوێژەکەی ناتەواوە، ئەوە نوێژەکەی ناتەواوە»، (گێڕەرەوە) دەڵێت: گوتم: ئەی ئەبو هورەیرە جاری وا هەیە لە دوای ئیمام (لە نوێژی بەکۆمەڵدام و فریا ناکەوم بیخوێنم)، گوتی: ئەی کوڕی فارسی، بۆ خۆت بەبێدەنگی بیخوێنە.

٦٣٧. عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «اليَهُودُ مَغْضُوبٌ عَلَيْهِمْ وَالنَّصَارَى ضُلَّالٌ».

عەدی کوڕی حاتیم رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

«جوولەکەکان ئەوانەن شایستەی تووڕەیی خوا بوون، نەسڕانییەکانیش ئەوانەن کە گومڕا بوون».

## بَابُ: وَمِنْ سُورَةِ البَقَرَةِ

### باسێک: لە سووڕەتی بەقەڕەوە

٦٣٨. عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى خَلَقَ آدَمَ مِنْ قَبْضَةٍ قَبَضَهَا مِنْ جَمِيعِ الأَرْضِ، فَجَاءَ بَنُو آدَمَ عَلَى قَدْرِ الأَرْضِ، فَجَاءَ مِنْهُمُ الأَحْمَرُ وَالأَبْيَضُ وَالأَسْوَدُ وَبَيْنَ ذَلِكَ، وَالسَّهْلُ وَالحَزْنُ وَالخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ».

ئەبو مووسای ئەشعەری ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان خوا ئادەمی دروست کرد لە مشتێک خۆڵ کە لە هەموو بەشەکانی زەوی وەرگیراوە، بۆیە نەوەی ئادەم شێوەیان بەپێی زەوییە، لە نێویاندا سوور و سپی و ڕەش هەیە، لە نێوان ئەم ڕەنگانەشدا هەیە، (بەهەمان شێوە) لەنێویاندا کەسانی ئاسان و توند و پیس و پاک هەیە».

٦٣٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: {وَادْخُلُوا البَابَ سُجَّدًا} البقرة: ٥٨، قَالَ: «دَخَلُوا مُتَزَحِّفِينَ عَلَى أَوْرَاكِهِمْ»، أَيْ: مُنْحَرِفِينَ.

ئەبو هوڕەیڕە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ سەبارەت بە ئایەتی: {وَادْخُلُوا البَابَ سُجَّدًا}، واتە: بچنە نێو شارەکە لە دەروازەوە، بە سوجدەبردنەوە. فەرموویەتی: «بەڵام چوونە ژوورەوە بە خۆخشاندن لەسەر لا ڕانەکانیان (وەک گاڵتەجاری و بێباکی بوو بەرانبەر فەرمانی خوا)».

٦٤٠. عَنْ أَنَسٍ ﵁ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ ﵁: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: لَوِ اتَّخَذْتَ مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ ﵇ مُصَلًّى، فَنَزَلَتْ: {وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى} البقرة: ١٢٥.

ئەنەس ﷺ دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، خۆزگە شوێنپێی (پێغەمبەر) ئیبراهیمت ﷺ دەکرد بە جێگای نوێژکردن، دواتر ئەم ئایەتە دابەزی: {وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى}، واتە: ئەو شوێنەی کە ئیبراهیم لێی وەستاوە بیکەنە شوێنی نوێژ و نوێژی لێ بکەن.

٦٤١. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي قَوْلِهِ: {وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا} البقرة: ١٤٣، قَالَ: «عَدْلًا».

ئەبو سەعید ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە ئایەتی: {وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا}، واتە: ئێوەمان گێڕاوە بە ئوممەتێکی هاوسەنگ. فەرمووی: «دادگەر و ڕاست».

٦٤٢. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ طَافَ بِالبَيْتِ سَبْعًا فَقَرَأَ: {وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى} البقرة: ١٢٥، فَصَلَّى خَلْفَ المَقَامِ، ثُمَّ أَتَى الحَجَرَ فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ قَالَ: «نَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ»، وَقَرَأَ: {إِنَّ الصَّفَا وَالمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ} البقرة: ١٥٨.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کاتێک هاتە نێو مەککەی پیرۆز و حەوت جار تەوافی بەیتی کرد ئەو ئایەتەی خوێندەوە: {وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى}، لەدوای شوێنی مەقام نوێژی کرد، پاشان هاتە لای بەردەکە و دەستی لێ دا، ئینجا فەرمووی: «بەو شێوەیە دەست پێ دەکەین کە خوا دەستی پێ کردووە (باسی کردووە)»، ئەو ئایەتەی خوێندەوە: {إِنَّ الصَّفَا وَالمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ}. واتە: بێگومان سەفا و مەڕوە لە نیشانە و دروشمەکانی خوان.

٦٤٣. عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: {وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ} غافر: ٦٠، قَالَ: «الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَةُ»، وَقَرَأَ: {وَقَالَ

رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ} غافر: ٦٠ -إِلَى قَوْلِهِ- {دَاخِرِينَ} غافر: ٦٠.

نوعمانی کوڕی بەشیر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەم ئایەتە: {وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ}، فەرمووی: «پاڕانەوە بریتییە لە پەرستن»، ئەم ئایەتەشی خوێندەوە: {وَقَالَ رَبُّكُمْ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ}، تا {دَاخِرِينَ}.

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ النِّسَاءِ

### باسێک: لە سوورەتی نیسائەوە

٦٤٤. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ ﵂ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَا أَسْمَعُ اللَّهَ ذَكَرَ النِّسَاءَ فِي الهِجْرَةِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: {أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ} آل عمران: ١٩٥.



ئوم سەلەمە ﵂ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (بۆچی) نابیستم خوای گەورە (لە قورئانی پیرۆز) باسی کۆچکردنی ئافرەتان بکات، ئینجا خوای بەرز ئەو ئایەتەی دابەزاند: {أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ}، واتە: بێگومان هەوڵ و کاری هیچ یەکێک لە ئێوە بەزایە نادەم لە نێر و مێینەتان، چونکە هاوکاری یەکدی بوون.

٦٤٥. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اقْرَأْ عَلَيَّ»، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟ قَالَ: «إِنِّي أُحِبُّ أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي»، فَقَرَأْتُ سُورَةَ النِّسَاءِ حَتَّى بَلَغْتُ: {وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلَاءِ شَهِيدًا} النساء: ٤١، قَالَ: فَرَأَيْتُ عَيْنَيِ النَّبِيِّ ﷺ تَهْمِلَانِ.

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ پێمی فەرموو: «قورئانم بەسەردا بخوێنەوە»، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا قورئانت بەسەردا بخوێنم لە کاتێک قورئان بە سەر تۆدا

دابەزیوە؟ فەرمووی: «پێمخۆشە لە کەسی دیکە گوێبیستی ببم»، سوورەتی نیسائم بۆ خوێندەوە هەتا گەیشتمە ئایەتی: {وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَؤُلَاءِ شَهِيدًا}، واتە: ئەی موحەممەد تۆشمان کردووە بە شایەت بەسەر ئەو خەڵکەوە. (عەبدوڵڵا) گوتی: بینیم چاوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ فرمێسکی لێ دەهاتە خوار.

٦٤٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يَجِيءُ المَقْتُولُ بِالقَاتِلِ يَوْمَ القِيَامَةِ نَاصِيَتُهُ وَرَأْسُهُ بِيَدِهِ وَأَوْدَاجُهُ تَشْخَبُ دَمًا، يَقُولُ: يَا رَبِّ، قَتَلَنِي هَذَا، حَتَّى يُدْنِيَهُ مِنَ العَرْشِ»، قَالَ: فَذَكَرُوا لِابْنِ عَبَّاسٍ، التَّوْبَةَ، فَتَلَا هَذِهِ الْآيَةَ: {وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا} النساء: ٩٣، قَالَ: مَا نُسِخَتْ هَذِهِ الْآيَةُ، وَلَا بُدِّلَتْ، وَأَنَّى لَهُ التَّوْبَةُ.

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «لە ڕۆژی دوایی کوژراو بکوژەکەی ڕاپێچ دەکات، نێوچاوانی و سەری بەدەستیەوەن، شادەمارەکانی خوێنی لێ دێت، دەڵێت: ئەی پەروەردگارم ئەو منی کوشتووە (لە دونیا)، تا نزیکی دەکاتەوە لە عەرشی خوا، گوتی: جا (گێڕەرەوە) بە ئیبن عەبباسی گوت: ئەی تۆبەکردن و پەشیمانی؟ ئەویش ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {وَمَنْ يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُتَعَمِّدًا}، واتە: هەر کەسێک بەدەستی ئەنقەست بڕوادارێک بکوژێت، (ئیبن عەبباس) گوتی: ئەم ئایەتە بڕیارەکەی لانەبردراوە و نەشگۆڕاوە، کەواتە چۆن تەوبە و پەشیمانی بۆ هەبێت.

تێبینی:

پێشەوا نەوەوی دەڵێت: بۆچوونی دووەم و دیاری ئیبن عەبباس لەو بارەوە ئەوەیە: (أن له توبة وجواز المغفرة له)، واتە: بێگومان ئەو کەسە تەوبە و لێخۆشبوونی بۆ هەیە، لەبەر ئەوەی خوا فەرموویەتی: {وَمَن يَعْمَلْ سُوءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ اللَّهَ يَجِدِ اللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا} النساء: ١١٠، واتە: هەر کەسێك خراپەیەك بکات، یان ستەم لە خۆی بکات، پاشان داوای لێبووردن لە خوا بکات، ئەوە دەبینێت کە خوا لێبووردەی میهرەبانە. جا ئەم بۆچوونەی دووەمی مەزهەبی تێکڕای ئەهلی

سوننە و هاوەڵان و تابیعین و غەیری ئەوانیشە کە لەدوای ئەوانەوە هاتوون.

٦٤٧. عَنْ يَعْلَى بْنِ أُمَيَّةَ قَالَ: قُلْتُ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه: إِنَّمَا قَالَ اللَّهُ: {أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمْ} النساء: ١٠١، وَقَدْ أَمِنَ النَّاسُ، فَقَالَ عُمَرُ: عَجِبْتُ مِمَّا عَجِبْتَ مِنْهُ. فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ: «صَدَقَةٌ تَصَدَّقَ اللَّهُ بِهَا عَلَيْكُمْ فَاقْبَلُوا صَدَقَتَهُ».

یەعلای کوڕی ئومەییە دەڵێت: بە عومەری کوڕی خەتتابم رضي الله عنه گوت: ئەوە خوا فەرموویەتی: {أَنْ تَقْصُرُوا مِنَ الصَّلَاةِ إِنْ خِفْتُمْ أَنْ يَفْتِنَكُمْ}، واتە: گوناهبار نابن کە نوێژەکانتان کورت بکەنەوە، ئەگەر ترستان هەبوو لە دوژمنەکانتان زەفەرتان پێ ببەن. وا خەڵکی ئێستا لە ئارامیدان (ئیدی کورتکردنەوەی نوێژ بۆچییە، خۆ ترسی دوژمنان نەماوە؟)، عومەر رضي الله عنه گوتی: منیش لام سەیر بوو ئەوەی لای تۆ سەیرە، بۆیە بۆ پێغەمبەری خوام ﷺ باس کرد، فەرمووی: «ئەمە بەخشینێکە خوا بەخشیویەتی بە بەندەکانی، ئێوەش بەخشینەکەی قبووڵ بکەن (کار بەو مۆڵەتەی بکەن)».

٦٤٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا نَزَلَ: {مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ} النساء: ١٢٣، شَقَّ ذَلِكَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ، فَشَكَوْا ذَلِكَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «قَارِبُوا وَسَدِّدُوا، وَفِي كُلِّ مَا يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ كَفَّارَةٌ حَتَّى الشَّوْكَةَ يُشَاكُهَا وَالنَّكْبَةَ يُنْكَبُهَا».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی: {مَنْ يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ}، واتە: ئەوەی خراپەیەک ئەنجام بدات، بەهۆیەوە سزا دەدرێت. لەسەر موسوڵمان زۆر بارگرانی بوو، ئەو حاڵەشیان گەیاند بە پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەویش فەرمووی: «نزیك ببنەوە و هاوسەنگ بن، بیپێکن، هەر بەڵایەک دووچاری بڕوادار دەبێت، بۆی دەبێتە کەفارەت، تەنانەت ئەو دڕکەش بەری دەکەوێت یان ئەو ناخۆشییەش کە بەسەریدا دێت».

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ المَائِدَةِ

## باسێک: له سووڕەتی مائیدەوە

٦٤٩. عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ قَالَ: قَالَ رَجُلٌ مِنَ اليَهُودِ لِعُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ رضي الله عنه: يَا أَمِيرَ المُؤْمِنِينَ، لَوْ عَلَيْنَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: {اليَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلَامَ دِيناً} المائدة: ٣، لَاتَّخَذْنَا ذَلِكَ اليَوْمَ عِيدًا، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ بْنُ الخَطَّابِ: أَنِّي لَأَعْلَمُ أَيَّ يَوْمٍ أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ، أُنْزِلَتْ يَوْمَ عَرَفَةَ فِي يَوْمِ جُمُعَةٍ.

تاریقی کوڕی شەهاب دەڵێت: پیاوێکی جوولەکە بە عومەری کوڕی خەتتابی رضي الله عنه گوت: ئەی گەورەی بڕواداران، ئەگەر ئەم ئایەتە بۆ ئێمە دابەزیبایە: {اليَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلَامَ دِيناً}، ئەو ڕۆژەمان دەکردە جەژن، پێشەوا عومەری کوڕی خەتتاب گوتی: من چاک دەزانم ئەم ئایەتە لە چ ڕۆژێک دابەزی، لە ڕۆژی وەستان لە کێوی عەڕەفە لە ڕۆژی هەینی دابەزی.

٦٥٠. عَنِ البَرَاءِ رضي الله عنه قَالَ: مَاتَ رِجَالٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ قَبْلَ أَنْ تُحَرَّمَ الخَمْرُ، فَلَمَّا حُرِّمَتِ الخَمْرُ، قَالَ رِجَالٌ: كَيْفَ بِأَصْحَابِنَا وَقَدْ مَاتُوا يَشْرَبُونَ الخَمْرَ، فَنَزَلَتْ: {لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ} المائدة: ٩٣.

بەڕاء رضي الله عنه دەڵێت: پیاوانێک لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ مردن پێش ئەوەی مەی قەدەغە بکرێت، کاتێک مەی قەدەغە کرا، خەڵکانێک گوتیان: دەبێت حاڵی هاوەڵانمان چۆن بێت (لەدوای مردن) کاتێک کە مردن مەییان دەخواردەوە؟ ئەم ئایەتە دابەزی: {لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ}، واتە: هیچ گوناهێک لەسەر ئەوانە نییە کە

بڕوایان هێناوە و کردەوە چاکەکان ئەنجام دەدەن لەوەی کە خواردوویانە (پێش قەدەغەکردنیان)، کاتێک خۆیان پاراستبێت لە قەدەغەکراوەکان (ی ئەو سەردەمە) و بڕوایان هێنابێت و کردەوە چاکەکانیان ئەنجام دابێت.

٦٥١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه يَقُولُ: قَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَبِي؟ قَالَ: «أَبُوكَ فُلَانٌ»، فَنَزَلَتْ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ} المائدة: ١٠١.

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێت: پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا کێ باوکمە؟ فەرمووی: «فڵان کەس باوکتە»، ئینجا ئەو ئایەتە دابەزی: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِنْ تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ}. واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە، پرسیار لە شتانێک مەکەن کە ئەگەر بۆتان ئاشکرا بکرێت سەغڵەتتان بکات.

٦٥٢. عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رضي الله عنه قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الآيَةَ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ} المائدة: ١٠٥، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا ظَالِمًا، فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمُ اللَّهُ بِعِقَابٍ مِنْهُ».

ئەبو بەکری صددیق رضي الله عنه گوتی: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوە: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنْفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُمْ مَنْ ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ}، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بەردەوام سەرگەرمی پەروەردەی خۆتان بن، چونکە ئەوانەی گومڕان ناتوانن زیانتان پێ بگەیەنن ئەگەر بەچاکی ڕێبازی خواناسیتان گرتبێتە بەر. بەڕاستی من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «ئەگەر خەڵکی ستەمکارێکیان بینی ستەم دەکات، دەستیان نەگرت و قەدەغەیان نەکردن لە ستەم، نزیکە خوای گەورە لەلای خۆیەوە سزایەکی گشتگیریان بۆ بنێرێت».

## بَابُ: وَمِنْ سُورَةِ الأَنْعَامِ

## باسێک: له سووره‌تی ئه‌نعامه‌وه

٦٥٣. عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ رضي الله عنهما يَقُولُ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: {قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ} الأنعام: ٦٥، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَعُوذُ بِوَجْهِكَ»، فَلَمَّا نَزَلَتْ: {أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ} الأنعام: ٦٥، قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَاتَانِ أَهْوَنُ»، أَوْ: «هَاتَانِ أَيْسَرُ».

جابیری کوڕی عه‌بدوڵلا رضي الله عنهما ده‌ڵێت: کاتێك ئه‌م ئایه‌ته دابه‌زی: {قُلْ هُوَ الْقَادِرُ عَلَى أَنْ يَبْعَثَ عَلَيْكُمْ عَذَابًا مِنْ فَوْقِكُمْ أَوْ مِنْ تَحْتِ أَرْجُلِكُمْ}، واته: پێیان بڵێ: هه‌ر ئه‌و زاته ده‌توانێت سزای سه‌ختتان له سه‌رووتانه‌وه بۆ بنێرێت، یان له‌ژێر پێیه‌کانتانه‌وه. پێغه‌مبه‌ر ﷺ فه‌رمووی: «په‌نا ده‌به‌مه به‌ر ڕووی تۆ ئه‌ی خوایه»، کاتێکیش ئه‌م ئایه‌ته دابه‌زی: {أَوْ يَلْبِسَكُمْ شِيَعًا وَيُذِيقَ بَعْضَكُمْ بَأْسَ بَعْضٍ}، واته: یاخود بتانکاته ده‌سته ده‌سته و پارچه پارچه و تاڵاوی توندوتیژی هه‌ندێکتان بکات به گه‌رووی هه‌ندێکی دیکه‌تاندا. پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ فه‌رمووی: «ئه‌م دووانه ئێشه‌که‌یان که‌متره یان ساناتره».

٦٥٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «ثَلَاثٌ إِذَا خَرَجْنَ: {لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ} الأنعام: ١٥٨، الْآيَةَ: الدَّجَّالُ، وَالدَّابَّةُ، وَطُلُوعُ الشَّمْسِ مِنَ الْمَغْرِبِ «أَوْ» مِنْ مَغْرِبِهَا».

ئه‌بو هوڕه‌یڕه رضي الله عنه له پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ ده‌گێڕێته‌وه که فه‌رموویه‌تی: «سێ نیشانه ئه‌گه‌ر ده‌رکه‌وتن، ئه‌وساکه: {لَا يَنْفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِنْ قَبْلُ}، واته: ئه‌و که‌سه‌ی ئه‌و ڕۆژه ئیمان ده‌هێنێت، ئیمانه‌که‌ی سوودی پێ ناگه‌یه‌نێت ئه‌گه‌ر پێش ئه‌و ڕۆژه ئیمانی نه‌هێنابێت. ئه‌وانیش بریتین له: ده‌جالی فێڵباز، ده‌رچوونی چوارپه‌له‌که، ده‌رکه‌وتنی خۆر له خۆرئاوا یان له خۆرئاواکه‌ی».

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الأَنْفَالِ

### باسێک: لە سوورەتی ئەنفالەوە

٦٥٥. عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ عَلَى المِنْبَرِ: {وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ} الأنفال: ٦٠، قَالَ: «أَلَا إِنَّ القُوَّةَ الرَّمْيُ -ثَلَاثَ مَرَّاتٍ- أَلَا إِنَّ اللَّهَ سَيَفْتَحُ لَكُمُ الأَرْضَ، وَسَتُكْفَوْنَ المُؤْنَةَ، فَلَا يَعْجِزَنَّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَلْهُوَ بِأَسْهُمِهِ».

عوقبەی کوڕی عامیر ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە لەسەر مینبەر: {وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ}، واتە: هەرچی تواناتانە بیخەنە گەڕ بۆ بەهێزکردنی سوپای ئیسلام و ئامادەی بکەن. فەرمووی: «ئاگادار بن بزانن کە هێز بریتییە لە تیرهاوێژی -سێ جاران دووبارەی کردەوە-، ئاگادار بن، بێگومان خوا زەویتان بۆ دەکاتەوە و دەستی بەسەردا دەگرن، ئەو کات پێویستیتان بە خەرجیی جەنگ نابێت، با کەستان ئەوەندە بێتوانا نەبێت لە یاریکردن بە تیروکەوانەکەی (بۆ ڕاهێنان بە نیازی جیهادکردن)».

٦٥٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «لَمْ تَحِلَّ الغَنَائِمُ لِأَحَدٍ سُودِ الرُّءُوسِ مِنْ قَبْلِكُمْ، كَانَتْ تَنْزِلُ نَارٌ مِنَ السَّمَاءِ فَتَأْكُلُهَا».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «دەستکەوتی جەنگ حەڵاڵ نەبووە بۆ هیچ کەسێکی سەرڕەش لە ئادەمیزاد لەپێش ئێوەدا، کاتی خۆی کۆ دەکرایەوە، جا ئاگرێك لە ئاسمان دەهات و هەمووی لەناو دەبرد».

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ التَّوْبَةِ

### باسێک: له سووڕەتی تەوبەوە

٦٥٧. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ: بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ أَبَا بَكْرٍ وَأَمَرَهُ أَنْ يُنَادِيَ بِهَؤُلَاءِ الكَلِمَاتِ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ عَلِيًّا، فَبَيْنَا أَبُو بَكْرٍ فِي بَعْضِ الطَّرِيقِ إِذْ سَمِعَ رُغَاءَ نَاقَةِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ القَصْوَاءِ، فَخَرَجَ أَبُو بَكْرٍ فَزِعًا فَظَنَّ أَنَّهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَإِذَا هُوَ عَلِيٌّ، فَدَفَعَ إِلَيْهِ كِتَابَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَأَمَرَ عَلِيًّا أَنْ يُنَادِيَ بِهَؤُلَاءِ الكَلِمَاتِ فَانْطَلَقَا فَحَجَّا، فَقَامَ عَلِيٌّ أَيَّامَ التَّشْرِيقِ، فَنَادَى: «ذِمَّةُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ بَرِيئَةٌ مِنْ كُلِّ مُشْرِكٍ، فَسِيحُوا فِي الأَرْضِ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ، وَلَا يَحُجَّنَّ بَعْدَ العَامِ مُشْرِكٌ، وَلَا يَطُوفَنَّ بِالبَيْتِ عُرْيَانٌ، وَلَا يَدْخُلُ الجَنَّةَ إِلَّا مُؤْمِنٌ»، وَكَانَ عَلِيٌّ يُنَادِي، فَإِذَا عَيِيَ قَامَ أَبُو بَكْرٍ فَنَادَى بِهَا.

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبو بەکری ڕەوانە کرد و فەرمانی پێ دا بانگهێشت بکات بەم چەند وشەیە، ئینجا عەلی بەدوایدا ڕەوانە کرد، لە کاتێکدا ئەبو بەکر لە ڕێگا بوو لەناکاو گوێبیستی دەنگی وشترەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو بە ناوی قەصواء، ئەبو بەکر بە ترسەوە دەرچوو وا گومانی برد کە پێغەمبەری خوا ﷺ بێت، کە چاوی پێ کەوت ئەوە عەلییە، نووسراوەکەی پێغەمبەری خوای ﷺ دایە دەست، فەرمانی دا بە عەلی کە بانگەشە بکات بەم چەند وشەیە، هەردووکیان دەرچوون کاری حەجیان ئەنجام دا، عەلی لە ڕۆژانی تەشریق هەستایەوە لەنێو خەڵکی ڕایگەیاند: «خوا و پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەستۆپاکن بەرانبەر بە هەموو کەسێکی هاوبەشدانەر لە زەویدا کە هاتوچۆ بکەن بۆ ماوەی چوار مانگ، هیچ کەسێکی هاوبەشدانەر بۆی نییە حەج بکات لەدوای ئەم ساڵەدا، هیچ کەسێکی ڕووت بۆی نییە بە دەوری کەعبەی پیرۆز تەواف بکات، بزانن هیچ کەسێک ناچێتە بەهەشت تەنیا بڕوادار نەبێت»، عەلی بانگەشەی دەکرد، ئەگەر ماندوو بووایە ئەبو بەکر هەڵدەستا بە کاری بانگەشەکردنەکە.

٦٥٨. عَنْ ثَوْبَانَ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ {وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالفِضَّةَ} التوبة:

٣٤، قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، فَقَالَ بَعْضُ أَصْحَابِهِ: أُنْزِلَتْ فِي الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ، لَوْ عَلِمْنَا أَيُّ المَالِ خَيْرٌ فَنَتَّخِذَهُ؟ فَقَالَ: «أَفْضَلُهُ لِسَانٌ ذَاكِرٌ، وَقَلْبٌ شَاكِرٌ، وَزَوْجَةٌ مُؤْمِنَةٌ تُعِينُهُ عَلَى إِيمَانِهِ».

سەوبان ﷺ دەڵێت: کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی: {وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالفِضَّةَ}، واتە: ئەوانەی زێڕ و زیو کۆ دەکەنەوە و نایبەخشن لە ڕێی خوادا. گوتی: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە یەکێک لە گەشتەکانی، هەندێک لە هاوەڵان گوتیان: دەربارەی زێڕ و زیو ئەو ئایەتە دابەزی، ئەگەر دەمانزانی چ جۆرە ماڵێک چاکە و باشە ئەوە بەدەستمان دەهێنا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «چاکترین و باشترین شت زمانێکی یادکەرەوەیە، دڵێکی سوپاسگوزارە، هاوسەرێکی بڕوادارە یارمەتیدەری بێت لەسەر کاری ئیمانەکەی».

٦٥٩. عَنْ أَنَسٍ ﷺ: أَنَّ أَبَا بَكْرٍ ﷺ حَدَّثَهُ، قَالَ: قُلْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ وَنَحْنُ فِي الغَارِ: لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ يَنْظُرُ إِلَى قَدَمَيْهِ لَأَبْصَرَنَا تَحْتَ قَدَمَيْهِ، فَقَالَ: «يَا أَبَا بَكْرٍ، مَا ظَنُّكَ بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا».



ئەنەس ﷺ دەگێڕێتەوە: ئەبو بەکری صدديق ﷺ گوتوویەتی: کاتێک ئێمە لە ئەشکەوت بووین بە پێغەمبەرم ﷺ گوت: خۆ ئەگەر بێت و یەکێکیان سەیری ژێر پێیەکانی بکات، دەمانبینن، فەرمووی: «ئەی ئەبو بەکر گومانت چۆنە دەربارەی دووکەس کە خوای گەورە سێیەمیان بێت».

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ يُونُسَ ﷺ

### باسێک: لە سوورەتی یونوسەوە ﷺ

٦٦٠. عَنْ صُهَيْبٍ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: {لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا الحُسْنَى وَزِيَادَةٌ} يونس: ٢٦، قَالَ: «إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ نَادَى مُنَادٍ: إِنَّ لَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ

مَوْعِدًا يُرِيدُ أَنْ يُنْجِزَكُمُوهُ، قَالُوا: أَلَمْ يُبَيِّضْ وُجُوهَنَا وَيُنْجِنَا مِنَ النَّارِ وَيُدْخِلْنَا الجَنَّةَ؟»، قَالَ: «فَيُكْشَفُ الحِجَابُ»، قَالَ: «فَوَاللَّهِ مَا أَعْطَاهُمُ اللَّهُ شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النَّظَرِ إِلَيْهِ».

صوهەیب ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: {لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ}، واتە: بۆ ئەوانەی چاکەیان کردووە، پاداشتی چاکتر و زیاتریش هەیە بە چەندەها قات. فەرمووی: «کاتێک خەڵکی بەهەشت دەچنە نێو بەهەشت بانگبێژێک بانگ دەکات: بزانن لەلای خوا چاوپێکەوتنێکتان هەیە دەیەوێت پاداشتتان بداتەوە»، خەڵکی بەهەشت دەڵێن: ئایا ئەی ئەوە نییە ڕوخسارمانی سپی کردۆتەوە ڕزگاری کردووین لە ئاگری دۆزەخ، ئێمەی بردۆتە بەهەشت، فەرمووی: «پەردەکە لادەچێت (خوای گەورە دەبینن)»، فەرمووی: «سوێند بەخوا، خوا هیچ شتێکی پێ نەداون کە لەلایان خۆشەویستتر بێت لە سەیرکردنی ئەو».



## بَابُ: وَمِنْ سُورَةِ هُودٍ ﵇

### باسێک: لە سووڕەتی هودەوە ﵇

٦٦١. عَنْ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﷺ قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: {فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ} هود: ١٠٥، سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقُلْتُ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ، فَعَلَى مَا نَعْمَلُ؟ عَلَى شَيْءٍ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ، أَوْ عَلَى شَيْءٍ لَمْ يُفْرَغْ مِنْهُ؟ قَالَ: «بَلْ عَلَى شَيْءٍ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ وَجَرَتْ بِهِ الأَقْلَامُ يَا عُمَرُ، وَلَكِنْ كُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ».

عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ دەڵێت: کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی: {فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ}، واتە: کۆمەڵێک بەدبەخت و چارەڕەش، کۆمەڵێکیش بەختەوەر و کامەران. پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەپێناو چی کار بکەین؟ کار بۆ شتێک بکەین کە دەستی لێ هەڵگیراوە (کۆتایی پێ هاتووە)، یان بۆ شتێک کە تا ئێستا دەستی لێ هەڵنەگیراوە؟ فەرمووی: «بەڵکوو کار بکە بۆ

شتێک کە ئاکامەکەی لە زانینی خوا کۆتایی پێ هاتووە و قەڵەمی قەدەر بەسەریدا هاتووە ئەی عومەر، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شتێک بەرەو ئەوە ئاسانکاریی بۆ دەکرێت کە بۆی دروست کراوە».

٦٦٢. عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلًا أَصَابَ مِنْ امْرَأَةٍ قُبْلَةَ حَرَامٍ فَأَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَسَأَلَهُ عَنْ كَفَّارَتِهَا، فَنَزَلَتْ: {وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ} هود: ١١٤، فَقَالَ الرَّجُلُ: أَلِي هَذِهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَقَالَ: «لَكَ وَلِمَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ أُمَّتِي».

ئیبن مەسعوود رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پیاوێک دووچاری ماچێکی حەرام بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیاری کرد دەربارەی کەفارەتی ئەو کارەی، ئەم ئایەتە دابەزی: {وَأَقِمِ الصَّلَاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ}، واتە: نوێژیش ئەنجام بدە لە هەردوو سەری ڕۆژەوە و لە سێ کاتەکەی شەویشدا (پێنج فەرزەکە)، بێگومان کردەوە چاکەکان کردەوە خراپەکان لادەبەن. پیاوەکە گوتی: ئەمە بۆ منە ئەی پێغەمبەری خوا؟، فەرمووی: «بۆ تۆیەو بۆ هەر کەسێکە لە ئوممەتم کە کاری پێ بکات».

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الرَّعْدِ

### باسێک: لە سووڕەتی ڕەعدەوە

٦٦٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: أَقْبَلَتْ يَهُودُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالُوا: يَا أَبَا القَاسِمِ، أَخْبِرْنَا عَنِ الرَّعْدِ مَا هُوَ؟ قَالَ: «مَلَكٌ مِنَ المَلَائِكَةِ مُوَكَّلٌ بِالسَّحَابِ مَعَهُ مَخَارِيقُ مِنْ نَارٍ يَسُوقُ بِهَا السَّحَابَ حَيْثُ شَاءَ اللَّهُ»، فَقَالُوا: فَمَا هَذَا الصَّوْتُ الَّذِي نَسْمَعُ؟ قَالَ: «زَجْرَةٌ بِالسَّحَابِ إِذَا زَجَرَهُ حَتَّى يَنْتَهِيَ إِلَى حَيْثُ أُمِرَ»، قَالُوا: صَدَقْتَ، فَقَالُوا: فَأَخْبِرْنَا عَمَّا حَرَّمَ إِسْرَائِيلُ عَلَى نَفْسِهِ؟ قَالَ: «اشْتَكَى عِرْقَ النَّسَا

فَلَمْ يَجِدْ شَيْئًا يُلَائِمُهُ إِلَّا لُحُومَ الإِبِلِ وَأَلْبَانَهَا فَلِذَلِكَ حَرَّمَهَا». قَالُوا: صَدَقْتَ.

ئیبن عەبباس ﷺ دەڵێت: جووله‌کەکان هاتنه خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتیان: ئەی ئەبولقاسیم، پێمان ڕابگەیەنە گرمەی هەور چییە؟ فەرمووی: «فریشتەیەکە لە فریشتەکانی خوا، سەرپەرشتیارە بەسەر هەورەکانەوە، ئامێرێکی ئاگری لەلایە، هەورەکان دەباتە ئەو شوێنەی کە خوا بیەوێت»، جووله‌کەکان گوتیان: ئەی ئەو دەنگە چییە کە گوێمان لێی دەبێت؟ فەرمووی: «دەنگێکە هەورەکانی پێ ڕاپێچ دەکرێت، تا دەگاتە ئەو شوێنەی کە فەرمانی پێ کردووە»، گوتیان: ڕاست دەکەیت، گوتیان: هەواڵمان پێ بدە یەعقووب چی لەسەر خۆی قەدەغە کردبوو؟، فەرمووی: «دووچاری نەخۆشی دەماری قاچ بوو، هیچی وای دەست نەکەوت کە گونجاو بێت بۆی، تەنیا گۆشتی وشتر و شیرەکەی نەبێت، هەر بۆیە قەدەغەی کرد»، گوتیان: ڕاست دەکەیت.



## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ إِبْرَاهِيمَ ﷺ

### باسێک: لە سووڕەتی ئیبڕاهیمەوە ﷺ

٦٦٤. عَنِ البَرَاءِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: {يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ} إبراهيم: ٢٧، قَالَ: «فِي القَبْرِ إِذَا قِيلَ لَهُ: مَنْ رَبُّكَ، وَمَا دِينُكَ، وَمَنْ نَبِيُّكَ».

بەڕاء ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرمایشتی خوا ﷻ: {يُثَبِّتُ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا بِالقَوْلِ الثَّابِتِ فِي الحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الآخِرَةِ}، واتە: خوا لە ژیانی دنیا و لە دواڕۆژیشدا، بە وشەی ڕاست و چەسپاو ئەوانەی بڕوایان هێناوە دامەزراو دەکات. فەرمووی: «ئەمە لەنێو گۆڕە کاتێک پێی دەگوترێت: پەروەردگارت کێیە؟ ئایینت چییە؟ پێغەمبەرەکەت کێیە؟».

٦٦٥. عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: تَلَتْ عَائِشَةُ ﵂ هَذِهِ الآيَةَ: {يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ} إبراهيم: ٤٨، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَأَيْنَ يَكُونُ النَّاسُ؟ قَالَ: «عَلَى الصِّرَاطِ».

مەسڕووق دەڵێت: عائیشە ﵂ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ}، واتە: ڕۆژێکە زەوی و ئاسمانەکان بە حاڵەتی جگە لە ئێستایان دەگۆڕێن، گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو کاتە خەڵک لەکوێن؟ فەرمووی: «لەسەر پردەکەن».

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الحِجْرِ

## باسێک: لە سووڕەتی حیجرەوە

٦٦٦. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: كَانَتْ امْرَأَةٌ تُصَلِّي خَلْفَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَسْنَاءَ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ، فَكَانَ بَعْضُ القَوْمِ يَتَقَدَّمُ حَتَّى يَكُونَ فِي الصَّفِّ الأَوَّلِ لِئَلَّا يَرَاهَا، وَيَسْتَأْخِرُ بَعْضُهُمْ حَتَّى يَكُونَ فِي الصَّفِّ المُؤَخَّرِ، فَإِذَا رَكَعَ نَظَرَ مِنْ تَحْتِ إِبْطَيْهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: {وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَأْخِرِينَ} الحجر: ٢٤.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: کاتی خۆی ئافرەتێک نوێژی لەدوای پێغەمبەری خوا ﷺ دەکرد، ئافرەتێکی وا جوان لە جوانترینی خەڵک بووە، بۆیە هەندێک کەس پەلەیان دەکرد تا لە ڕیزی یەکەم بن و ئەم ئافرەتە نەبینن (تووشی گوناهـ نەبن)، هەندێکیش خۆیان دوا دەخست تا لە دواوەی ڕیزەکان بن، کاتێک دەچوونە ڕکووع لەژێر باڵیانەوە سەیریان دەکرد، خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: {وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَأْخِرِينَ}، واتە: بێگومانیش پێشووەکانتانمان زانیوە، بە مسۆگەریش دواخراوەکانیشتانمان زانیوە.

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ بَنِي إِسْرَائِيلَ

### باسێک: لە سورەتی نەوەی ئیسرائیلەوە (سوورەتی ئیسراء)

٦٦٧. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَمَّا كَذَّبَتْنِي قُرَيْشٌ قُمْتُ فِي الحِجْرِ فَجَلَّى اللَّهُ لِي بَيْتَ المَقْدِسِ، فَطَفِقْتُ أُخْبِرُهُمْ عَنْ آيَاتِهِ وَأَنَا أَنْظُرُ إِلَيْهِ».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێک قورەیشییەکان منیان بەدرۆخستەوە (دەربارەی شەوڕۆیی پێغەمبەر ﷺ) لە شوێنی حیجر وەستام، خوا بەیتولمەقدیسی هێنایە پێش چاوم، دەستم کرد بە باسکردنی سیفەت و نیشانەکانی و لە کاتێکدا سەیرم دەکرد (وەك شاشە لەپێش چاوی بووە ﷺ)».

٦٦٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄: فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: {وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلَّا فِتْنَةً لِلنَّاسِ} الإسراء: ٦٠، قَالَ: هِيَ رُؤْيَا عَيْنٍ أُرِيهَا النَّبِيُّ ﷺ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِهِ إِلَى بَيْتِ المَقْدِسِ، قَالَ: {وَالشَّجَرَةَ المَلْعُونَةَ فِي القُرْآنِ} الإسراء: ٦٠، هِيَ شَجَرَةُ الزَّقُّومِ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەگێڕێتەوە: کە دەربارەی ئایەتی: {وَمَا جَعَلْنَا الرُّؤْيَا الَّتِي أَرَيْنَاكَ إِلَّا فِتْنَةً لِلنَّاسِ}، واتە: ئەو دیتنەی (لە شەوڕۆییدا) پێشانیشمان دایت، تەنیا بۆ تاقیکردنەوەی خەڵکی بوو. گوتوویەتی: ئەو بینینی چاوانەیە کە نیشانی پێغەمبەر ﷺ دراوە لەو شەوەی شەوڕۆیی پێ کرا بۆ بەیتولمەقدیس، دەربارەی ئەم ئایەتەش: {وَالشَّجَرَةَ المَلْعُونَةَ فِي القُرْآنِ}، واتە: درەختی نەفرینلێکراویش لە قورئاندا. گوتی: ئەمەش داری زەققوومە.

٦٦٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي قَوْلِهِ: {عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا} الإسراء: ٧٩، وَسُئِلَ عَنْهَا قَالَ: «هِيَ الشَّفَاعَةُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئایەتی: {عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا}، واتە: نزیکە پەروەردگارت دوای زیندووکردنەوەت، پێگەی

ستاییشکراوت پێ بدات. پرسیاری لێ کرا و فەرمووی: «ئەمە شەفاعەتە».

٦٧٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﭭ: فِي قَوْلِهِ: {وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا} الإسراء: ١١٠، قَالَ: نَزَلَتْ وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُخْتَفٍ بِمَكَّةَ، فَكَانَ إِذَا صَلَّى بِأَصْحَابِهِ رَفَعَ صَوْتَهُ بِالْقُرْآنِ، فَكَانَ الْمُشْرِكُونَ إِذَا سَمِعُوهُ شَتَمُوا الْقُرْآنَ وَمَنْ أَنْزَلَهُ وَمَنْ جَاءَ بِهِ، فَقَالَ اللَّهُ لِنَبِيِّهِ: {وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ} الإسراء: ١١٠، أَيْ بِقِرَاءَتِكَ، فَيَسْمَعَ الْمُشْرِكُونَ فَيَسُبَّ الْقُرْآنُ، {وَلَا تُخَافِتْ بِهَا} الإسراء: ١١٠، عَنْ أَصْحَابِكَ: {وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا} الإسراء: ١١٠.

ئیبن عەبباس ﭭ دەگێڕێتەوە: کە دەربارەی ئایەتی: {وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا}، واتە: هەروەها (دەنگ بە) نوێژ و پاڕانەوەت بەرز مەکەوە و پەنهانیشی مەکە، حاڵەتێکی میانڕەوانە لەو نێوانەدا ڕەچاو بکە. گوتوویەتی: ئەمە کاتێک دابەزی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە لە بانگەوازی نهێنیدا بوو، ئەگەر نوێژی بۆ هاوەڵانی کردبا، دەنگی بەرز دەکردەوە بۆ خوێندنی قورئان، هاوبەشدانەرانیش ئەگەر بیانبیستبا جوێنیان بە قورئان دەدا، بەوەشی دایبەزاندووە، بەوەشی هێناویەتی، بۆیە خوا بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو: {وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ}، واتە: بە خوێندنەوەت، هاوبەشدانەران گوێبیستی بن و جوێن بە قورئان بدەن: {وَلَا تُخَافِتْ بِهَا}، واتە: بۆ هاوەڵانت، {وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا}.

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ مَرْيَمَ

## باسێک: لە سووڕەتی مەریەمەوە

٦٧١. عَنْ قَتَادَةَ: فِي قَوْلِهِ: {وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا} مريم: ٥٧، قَالَ: حَدَّثَنَا أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَمَّا عُرِجَ بِي رَأَيْتُ إِدْرِيسَ فِي السَّمَاءِ الرَّابِعَةِ».

قەتادە ﵁ دەگێڕێتەوە: کە دەربارەی ئەو ئایەتە: {وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا}، واتە: بۆ پێگە و شوێنێکی بڵێندیش بەرزمان کردەوە. دەڵێت: ئەنەسی کوڕی مالیک بۆی باس کردین کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کاتێک بەرز کرامەوە بۆ ئاسمان، پێغەمبەری خوا ئیدریسم ﵇ بینی لە ئاسمانی چوارەم».

٦٧٢. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِجِبْرِيلَ: «مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَزُورَنَا أَكْثَرَ مِمَّا تَزُورُنَا؟»، قَالَ: فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: {وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا} مريم: ٦٤، إِلَى آخِرِ الآيَةَ.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە جیبریلی فەرمووە: «چ شتێک ڕێگرە زیاتر سەردانمان بکەیت لەوەی کە ئێستا سەردانمان دەکەیت؟»، گوتی: ئەم ئایەتە دابەزی: {وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ لَهُ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا}، واتە: (فریشتەکان دەڵێن): ئێمە تەنیا بە فەرمانی پەروەردگارت دادەبەزین، هەرچی لە پێشمانەوە و لە دوامانەوەن، تا کۆتایی ئایەتەکە.



٦٧٣. عَنِ السُّدِّيِّ قَالَ: سَأَلْتُ مُرَّةَ الهَمْدَانِيَّ، عَنْ قَوْلِ اللَّهِ ﷻ: {وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا} مريم: ٧١، فَحَدَّثَنِي أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ مَسْعُودٍ ﵁ حَدَّثَهُمْ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَرِدُ النَّاسُ النَّارَ ثُمَّ يَصْدُرُونَ مِنْهَا بِأَعْمَالِهِمْ، فَأَوَّلُهُمْ كَلَمْحِ البَرْقِ، ثُمَّ كَالرِّيحِ، ثُمَّ كَحُضْرِ الفَرَسِ، ثُمَّ كَالرَّاكِبِ فِي رَحْلِهِ، ثُمَّ كَشَدِّ الرَّجُلِ، ثُمَّ كَمَشْيِهِ».

سوددی دەڵێت: جارێکیان پرسیارم لە موڕڕەی ئەلهەمەدانی کرد دەربارەی ئەم ئایەتە: {وَإِنْ مِنْكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا}، واتە: هیچ کامێکیشتان نییە کە نەچێتە سوێی دۆزەخ. ئەویش بۆی باس کردم کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁ بۆی باس کردووە، گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «(لە ڕۆژی دوایی) خەڵکی بەسەر ئاگردا دەڕۆن، ئینجا لێی تێپەڕ دەبن بەهۆی کارە باشەکانیانەوە، یەکەمیان زوو دەپەڕێتەوە وەک تیشکی بروسکە، ئینجا هەیە وەک با دەپەڕێتەوە، هەیە وەک ڕاکردنی ئەسپە، ئینجا هەیە وەک سوارێک بە ڕۆیشتن بڕوات، ئینجا هەیە وەک

ڕاکردنی کەسێکە، ئینجا تێشیدایە وەک بەپیادە ڕۆیشتنی کەسێکە».

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الْمُؤْمِنُونَ

### باسێک: لە سوورەتی موئمینوونەوە

٦٧٤. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه: أَنَّ الرُّبَيِّعَ بِنْتَ النَّضْرِ أَتَتِ النَّبِيَّ ﷺ وَكَانَ ابْنُهَا حَارِثَةُ بْنُ سُرَاقَةَ أُصِيبَ يَوْمَ بَدْرٍ، أَصَابَهُ سَهْمٌ غَرْبٌ، فَأَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: أَخْبِرْنِي عَنْ حَارِثَةَ لَئِنْ كَانَ أَصَابَ خَيْرًا احْتَسَبْتُ وَصَبَرْتُ، وَإِنْ لَمْ يُصِبِ الْخَيْرَ اجْتَهَدْتُ فِي الدُّعَاءِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «يَا أُمَّ حَارِثَةَ إِنَّهَا جِنَانٌ فِي جَنَّةٍ، وَإِنَّ ابْنَكِ أَصَابَ الْفِرْدَوْسَ الْأَعْلَى وَالْفِرْدَوْسُ رَبْوَةُ الْجَنَّةِ وَأَوْسَطُهَا وَأَفْضَلُهَا».

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: ڕوبەیعی کچی نەزر هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، لە کاتێکدا کوڕەکەی حاریسی کوڕی سوڕاقە لە جەنگی بەدر پێکرابوو، تیرێکی بەرکەوتبوو سەرچاوەکەی نەزانراو بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: هەواڵم پێ بدە دەربارەی حاریس، ئەگەر سەرەنجامی چاک و باش بێت ئەمە بۆ خوای لێ دەگەڕێم و ئارام دەگرم، ئەگەر سەرەنجامیشی چاک نەبێت، خۆم زۆر ماندوو دەکەم بە پاڕانەوە بۆی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەی دایکی حاریسە سەرەنجامی باخەکانی نێو بەهەشتە، بەدڵنیایی کوڕەکەت فیردەوسی بەرزی دەست کەوتووە، شوێنی فیردەوس لە بەرزایی بەهەشتە کە نێوەندیەتی و لە چاکترینی شوێنی بەهەشتە».

٦٧٥. عَنْ عَائِشَةَ رضي الله عنها زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: {وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوْا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ} المؤمنون: ٦٠، قَالَتْ عَائِشَةُ: أَهُمُ الَّذِينَ يَشْرَبُونَ الْخَمْرَ وَيَسْرِقُونَ؟ قَالَ: «لَا يَا بِنْتَ الصِّدِّيقِ، وَلَكِنَّهُمُ الَّذِينَ يَصُومُونَ وَيُصَلُّونَ وَيَتَصَدَّقُونَ، وَهُمْ يَخَافُونَ أَنْ لَا تُقْبَلَ مِنْهُمْ: {أُولَئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ} المؤمنون: ٦١».

عائیشه ﵂ هاوسەری پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی ئەم ئایەتە: {وَالَّذِينَ يُؤْتُونَ مَا آتَوْا وَقُلُوبُهُمْ وَجِلَةٌ}، واتە: دیسان ئەوانەی هەرچی پێیان دەکرێت (لە کاری چاک، یان لە بەخشین) دەیکەن و ئەنجامی دەدەن، کەچی دڵیشیان هەر بە ترس و لەرزە. عائیشه گوتی: ئەوانەن کە مەی دەخۆنەوە و دزی دەکەن، فەرمووی: «نەخێر ئەی کچی صدديق، بەڵکوو ئەوانەن بەڕۆژوو دەبن و نوێژ دەکەن و ماڵ دەبەخشن، لەگەڵ ئەوەشدا دەترسێن لێیان وەرنەگیرێت: {أُولَئِكَ يُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَهُمْ لَهَا سَابِقُونَ}، واتە: ئا ئەوانە لە کردەوە چاکەکاندا خێرایی دەکەن و تێشیاندا پێشڕەون)».

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الفُرْقَانِ

### باسێک: لە سووڕەتی فوڕقانەوە

٦٧٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الذَّنْبِ أَعْظَمُ؟ قَالَ: «أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ»، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: «أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ خَشْيَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ»، قَالَ: قُلْتُ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: «أَنْ تَزْنِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ».

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا چ تاوانێک گەورەترینە؟ فەرمووی: «هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدەیت لە کاتێکدا دروستی کردوویت»، گوتم: لەدوای ئەو؟ فەرمووی: «منداڵەکەت بکوژی لە ترسی هەژاری کە بەشدار بێت لە خواردنت»، گوتم: لەدوای ئەو؟ فەرمووی: «زینا بکەیت لەگەڵ هاوسەری دراوسێیەکەت».

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ القَصَصِ

### باسێک: لە سووڕەتی قەصەصەوە

٦٧٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِعَمِّهِ: «قُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ أَشْهَدُ

لَكَ بِهَا يَوْمَ القِيَامَةِ»، فَقَالَ: لَوْلَا أَنْ تُعَيِّرَنِي بِهَا قُرَيْشٌ أَنَّ مَا يَحْمِلُهُ عَلَيْهِ الجَزَعُ، لَأَقْرَرْتُ بِهَا عَيْنَكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: {إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ} القصص: ٥٦.

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە مامی فەرموو: «بڵێ: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ) شایەتیت بۆ دەدەم لە ڕۆژی دوایی بەهۆی دەربڕینی»، ئەویش گوتی: ئەگەر بەهۆی تانە و توانجی قورەیش نەبووایە، دەمگوت و چاوەکانتم پێی دادەمرکاند، خوا ﷻ ئەو ئایەتەی دابەزاند: {إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَنْ يَشَاءُ}. واتە: بەدڵنیایی تۆ ئەو کەسەی خۆشت دەوێت (هەرچەندە سوور بیت) ڕاستەڕێی ناکەیت، (نایخەیە سەر ڕاستە شەقامی خوا)، بەڵام خوا هەر کەسێکی بوێت، ڕاستەڕێ و ڕێنمایی دەکات).



## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الأَحْزَابِ

### باسێک: لە سوورەتی ئەحزابەوە

٦٧٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: مَا كُنَّا نَدْعُو زَيْدَ بْنَ حَارِثَةَ إِلَّا زَيْدَ ابْنَ مُحَمَّدٍ حَتَّى نَزَلَ القُرْآنُ: {ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ} الأحزاب: ٥.

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: ئێمە بانگی زەیدی کوڕی حاریسەمان نەدەکرد، مەگەر بە ناوی زەیدی کوڕی موحەممەد، هەتا ئەم ئایەتەی قورئان دابەزی: {ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ}، واتە: (ئەوانەی بە کوڕتان گرتوون) بە ناوی بابەکانیانەوە بانگیان بکەن (پاڵیان بدەنە لای ئەوان)، ئەوە لەلای خوا دادگەرانەتر و ڕاستترە.

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ يس

### باسێک: له سوڕەتی یاسینەوە

٦٧٩. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: كَانَتْ بَنُو سَلِمَةَ فِي نَاحِيَةِ المَدِينَةِ فَأَرَادُوا النُّقْلَةَ إِلَى قُرْبِ المَسْجِدِ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةَ: {إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ} يس: ١٢، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ آثَارَكُمْ تُكْتَبُ فَلَا تَنْتَقِلُوا».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: بەنو سەلەمە شوێنیان لەلا تەنیشتێکی دووری شاری مەدینە بوو، ویستیان شوێنیان بگوازنەوە بۆ نزیکی مزگەوت، ئەم ئایەتە دابەزی: {إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ}، واتە: بێگومان ئێمە مردووان دەژیێنینەوە، هەرچی پێشیان خستووە (لە کردەوان) و شوێنەوارەکانیشیان دەنووسین. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «شوێنەواری هاتوچوونتان بۆتان (بە چاکە) دەنووسرێت، شوێنتان مەگوازنەوە».



## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ مُحَمَّدٍ ﷺ

### باسێک: له سووڕەتی موحەممەدەوە ﷺ

٦٨٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ: {وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ} محمد: ١٩، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللَّهَ فِي اليَوْمِ سَبْعِينَ مَرَّةً».

ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوە: دەربارەی ئەم ئایەتە: {وَاسْتَغْفِرْ لِذَنْبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ}، واتە: بۆ گوناهی خۆت و پیاوان و ئافرەتانی بڕوادار داوای لێبووردن بکە. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «من لە ڕۆژێکدا حەفتا جار داوای لێخۆشبوون لە خوا دەکەم».

## بَابُ: وَمِنْ سُورَةِ الفَتْحِ

### باسێک: لە سوورەتی فەتحەوە

٦٨١. عَنْ عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ ﵁ يَقُولُ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، فَكَلَّمْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَسَكَتَ، ثُمَّ كَلَّمْتُهُ فَسَكَتَ، فَحَرَّكْتُ رَاحِلَتِي فَتَنَحَّيْتُ وَقُلْتُ: ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا ابْنَ الخَطَّابِ، نَزَرْتَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ كُلَّ ذَلِكَ لَا يُكَلِّمُكَ، مَا أَخْلَقَكَ بِأَنْ يَنْزِلَ فِيكَ قُرْآنٌ قَالَ: فَمَا نَشِبْتُ أَنْ سَمِعْتُ صَارِخًا يَصْرُخُ بِي، قَالَ: فَجِئْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: «يَا ابْنَ الخَطَّابِ لَقَدْ أُنْزِلَ عَلَيَّ هَذِهِ اللَّيْلَةَ سُورَةٌ مَا أُحِبُّ أَنَّ لِي بِهَا مَا طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ: {إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا} الفتح: ١».

عومەری کوڕی خەتتاب ﵁ دەڵێت: کاتێک ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە یەکێک لە گەشتەکانی، جا قسەم لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و ئەویش بێدەنگ بوو، ئینجا قسەم لەگەڵی کردەوە و هەر بێدەنگ بوو، قسەم لەگەڵی کردەوە، بۆیە جووڵەم بە سوارییەکەم کرد و هەندێک دوورکەوتمەوە، بە خۆمم گوت: دایکت لەدەستت بدات ئەی کوڕی خەتتاب، سێ جار ئەم هەموو قسەیەت کرد بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، کەچی هەر وەڵامی نەدایەوە (ترسی هەبوو پێغەمبەری ﷺ بێزاری کردبێت)، چەند شیاوی (بەهۆی ئەو کارەتەوە) قورئانت لەسەر دابەزێت، گوتی: ئەوەندەی پێ نەچوو گوێم لێ بوو کەسێک هاواری کرد و بانگی کردم (کە پێغەمبەری خوا ﷺ بانگم دەکات)، گوتی: چوومە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: «ئەی کوڕی خەتتاب وا ئەمشەو سوورەتێکم بۆ دابەزیوە، پێمخۆش نییە بیگۆڕمەوە بەوەی خۆر بەسەریدا هەڵدێت: {إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُبِينًا}، واتە: ئێمە (بە هۆی ڕێککەوتنی حودەیبییەوە) سەرکەوتنێکی ئاشکرامان بۆ ڕەخساندیت».

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الحُجُرَاتِ

### باسێک: له سوڕەتی حوجوڕاتەوە

٦٨٢. عَنْ أَبِي نَضْرَةَ قَالَ: قَرَأَ أَبُو سَعِيدٍ الخُدْرِيُّ ﵁: {وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الأَمْرِ لَعَنِتُّمْ} الحجرات: ٧، قَالَ: هَذَا نَبِيُّكُمْ ﷺ يُوحَى إِلَيْهِ، وَخِيَارُ أَئِمَّتِكُمْ لَوْ أَطَاعَهُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الأَمْرِ لَعَنِتُوا، فَكَيْفَ بِكُمُ اليَوْمَ؟

ئەبو نەزرە ﵁ دەڵێت: ئەبو سەعیدی خودری ﵁ ئەو ئایەتەی خوێندەوە: {وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِنَ الأَمْرِ لَعَنِتُّمْ}، واتە: بشزانن کە پێغەمبەری خواتان ﷺ لەنێودایە، ئەگەر لە زۆر کاراندا بە قسەتان بکات، تووشی گرفت و ناڕەحەتی دەبن (چونکە بەهۆی ڕاوبۆچوونەکانتانەوە تووشی هەڵە دەبێت)، ئەبو سەعید گوتی: ئەوە باسی پێغەمبەرەکەتانە ﷺ خوا وەحی بۆ دەنارد، چاکترین پێشەوایانی ئێوە بوون (هاوەڵان)، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر لە زۆربەی کارەکان بەگوێی کردبان، ئەوە دووچاری ئەزیەت دەبوون، (ئەوە بۆ ئەوان وا بوو کە باشترینی ئوممەتن) ئەی دەبێت ئەمڕۆ بۆ ئێوە چۆن بووایە؟!



## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ النجم

### باسێک: له سووڕەتی نەجمەوە

٦٨٣. عَنِ الشَّيْبَانِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ، عَنْ قَوْلِهِ ﷻ: {فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى} النجم: ٩، فَقَالَ: أَخْبَرَنِي ابْنُ مَسْعُودٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى جِبْرِيلَ وَلَهُ سِتُّ مِائَةِ جَنَاحٍ.

شەیبانی دەڵێت: پرسیارم لە زەری کوڕی حوبەیش کرد دەربارەی ئەم ئایەتە:

{فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ}، واتە: ئەوەندە لێی نزیک بۆیەوە، نێوانیان هێندەی دوو کەوان یان کەمتریش بوو. گوتی: ئیبن مەسعوود ﷺ هەواڵی پێ دام کە پێغەمبەر ﷺ جیبریلی بینیوە کە شەش سەد باڵی هەبووە.

## بَابُ: وَمِنْ سُورَةِ القَمَرِ

### باسێک: لە سوورەتی قەمەڕەوە

٦٨٤. عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ ﷺ قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ بِمِنًى فَانْشَقَّ القَمَرُ فَلْقَتَيْنِ: فَلْقَةٌ مِنْ وَرَاءِ الجَبَلِ، وَفَلْقَةٌ دُونَهُ، فَقَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «اشْهَدُوا»، -يَعْنِي- {اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ القَمَرُ} القمر: ١.

ئیبن مەسعوود ﷺ دەڵێت: لە کاتێک ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بووین لە مینا مانگ دوولەت بوو: لەتێک لە دواوەی چیایەکە بوو، لەتێکیش لە نزیک چیایەکە بوو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: شایەتی بدەن (لەسەر ئەم ڕووداوە)، واتە: {اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ القَمَرُ}. واتە: ڕۆژی قیامەت نزیک بۆتەوە و مانگیش دوولەت بوو.

٦٨٥. عَنْ أَنَسٍ ﷺ قَالَ: سَأَلَ أَهْلُ مَكَّةَ النَّبِيَّ ﷺ آيَةً، فَانْشَقَّ القَمَرُ بِمَكَّةَ مَرَّتَيْنِ، فَنَزَلَتْ: {اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ القَمَرُ} القمر: ١ -إِلَى قَوْلِهِ- {سِحْرٌ مُسْتَمِرٌّ} القمر: ٢، يَقُولُ: ذَاهِبٌ.

ئەنەس ﷺ دەڵێت: خەڵکی مەککە داوای موعجیزە و نیشانەیەکیان کرد لە پێغەمبەر ﷺ (بۆ سەلماندنی ڕاستیی پێغەمبەرایەتی)، خوا دوو جار مانگی بۆ لەت کرد لە شاری مەککە، ئەم ئایەتە دابەزی: {اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانشَقَّ القَمَرُ}، هەتا دەگاتە: {سِحْرٌ مُسْتَمِرٌّ}، دەیگوت: دەڕوا و نامێنێت.

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الْجُمُعَةِ

### باسێک: له سووڕەتی جومعەوە

٦٨٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حِينَ أُنْزِلَتْ سُورَةُ الْجُمُعَةِ فَتَلَاهَا، فَلَمَّا بَلَغَ: {وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ} الجمعة: ٣، قَالَ لَهُ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ لَمْ يَلْحَقُوا بِنَا؟ فَلَمْ يُكَلِّمْهُ، قَالَ: وَسَلْمَانُ فِينَا قَالَ: فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ فَقَالَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ كَانَ الإِيمَانُ بِالثُّرَيَّا لَتَنَاوَلَهُ رِجَالٌ مِنْ هَؤُلَاءِ».

ئەبو هوڕەیرە ﵁ دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین کاتێک سووڕەتی جومعە دابەزی، بۆی خوێندینەوە، کاتێك گەیشتە: {وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ}، واتە: لە ئایندەدا خەڵکی دیکەش دێن و پەیوەست دەبن بە ئەوانەوە، پیاوێک پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا ئەم کەسانە کێن کە هێشتا بەدوای ئێمە نەکەوتوون؟ پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ قسەیەکی لەگەڵدا نەکرد، گوتی: سەلمانیش لە نێومان بوو، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لەسەر چۆکی سەلمان دانا و فەرمووی: «سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئیمان لەنێو ئەستێرەی سوڕەییا بووایە (کە بڵند و گەورە و پڕشنگدارە) ئەوە پیاوانێک لەوان هەر بەدەستیان دەهێنا (ئەوەندە خاوەن هیممەت و کۆششن)».

## بَاب وَمِنْ سُورَةِ الْمُدَّثِّرِ

### باسێک: له سووڕەتی موددەسیرەوە

٦٨٧. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ يُحَدِّثُ عَنْ فَتْرَةِ الْوَحْيِ، فَقَالَ فِي حَدِيثِهِ: «أَنَا أَمْشِي سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ فَرَفَعْتُ رَأْسِي، فَإِذَا

الْمَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءَ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ فَجُئِثْتُ مِنْهُ رُعْبًا، فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ: زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي، فَدَثَّرُونِي»، فَأَنْزَلَ اللَّهُ ﷻ: {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنْذِرْ} المدثر: ٢- إِلَى قَوْلِهِ - {وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ} المدثر: ٥، قَبْلَ أَنْ تُفْرَضَ الصَّلَاةُ.

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو کاتێك باسی ماوەی وەستانی وەحی دەکرد، جا لە درێژەی فەرموودەکەیدا فەرمووی: «لە کاتێکدا دەڕۆیشتم گوێم لە دەنگێک بوو لە ئاسمانەوە، سەرم بەرز کردەوە، جیبریلم بینی کە لە ئەشکەوتی حیراء هاتە لام، لەسەر کورسییەک دانیشتبوو لە نێوان ئاسمان و زەویدا، زۆر لێی ترسام، گەڕامەوە ماڵ و گوتم: دامبپۆشن، دامبپۆشن، دایانپۆشیم»، خواش ئەم ئایەتەی دابەزاند: {يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنْذِرْ}، هەتا: {وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ}، ئەمە پێش فەرزکردنی نوێژ بوو.



## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ

### باسێک: لە سوورەتی کوویرەتەوە

٦٨٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُ رَأْيُ عَيْنٍ، فَلْيَقْرَأْ: {إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ}، {وَإِذَا السَّمَاءُ انْفَطَرَتْ}، {وَإِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ}».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک پێیخۆشە سەیری دیمەنەکانی ڕۆژی دوایی بکات، وەک ئەوەی بە چاو ببینێت، با ئەم سوورەتانە بخوێنێتەوە: {إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ}، {وَإِذَا السَّمَاءُ انْفَطَرَتْ}، {وَإِذَا السَّمَاءُ انْشَقَّتْ}».

## بَاب وَمِنْ سُورَةِ وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ

### باسێک: لە سوورەتی موتەففیفینەوە

٦٨٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: {يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ العَالَمِينَ} المطففين: ٦، قَالَ: «يَقُومُونَ فِي الرَّشْحِ إِلَى أَنْصَافِ آذَانِهِمْ».

ئیبن عومەر ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ (دەربارەی ئایەتی): {يَوْمَ يَقُومُ النَّاسُ لِرَبِّ العَالَمِينَ}، واتە: ئەو ڕۆژەی کە خەڵک هەمووی ڕادەوەستن لەبەردەم پەروەردگاری جیهانییان. فەرمووی: «(هەندێکیان) لەنێو ئارەقەیان ڕاوەدەستن بە جۆرێک دەگاتە گوێچەکەکانیان».

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ وَالضُّحَى

### باسێک: لە سوورەتی زوحاوە

٦٩٠. عَنْ جُنْدَبِ البَجَلِيِّ ﷺ قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَارٍ، فَدَمِيَتْ إِصْبَعُهُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «هَلْ أَنْتِ إِلَّا إِصْبَعٌ دَمِيتِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ مَا لَقِيتِ»، قَالَ: وَأَبْطَأَ عَلَيْهِ جِبْرِيلُ، فَقَالَ المُشْرِكُونَ: قَدْ وُدِّعَ مُحَمَّدٌ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى: {مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى} الضحى: ٣.

جوندەبی بەجەلی ﷺ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووم لە ئەشکەوتێک، پەنجەیەکی بریندار بوو و خوێنی لێ هات، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «تۆ تەنیا پەنجەیەکی خوێنت لێ هاتووە، لەپێناو خوا وات بەسەر هاتووە»، گوتی: بۆ ماوەیەک جیبریل نەهاتە لای، هاوبەشدانەران گوتیان: موحەممەدیان ﷺ جێ هێشت، خوای بەرز ئەم ئایەتەی دابەزاند: {مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَى}، واتە: پەروەردگارت وازی لێ نەهێناویت و دەستبەرداری تۆ نەبووە.

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ

### باسێک: لە سوورەتی ئیقرەئەوە

٦٩١. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: {سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ} العلق: ١٨، قَالَ: قَالَ أَبُو جَهْلٍ، لَئِنْ رَأَيْتُ مُحَمَّدًا يُصَلِّي لَأَطَأَنَّ عَلَى عُنُقِهِ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «لَوْ فَعَلَ لَأَخَذَتْهُ المَلَائِكَةُ عِيَانًا».

لە ئیبن عەبباسەوە رضي الله عنهما دەگێڕنەوە: (دەربارەی ئایەتی:) {سَنَدْعُ الزَّبَانِيَةَ}، واتە: فریشتەکانی دۆزەخی بۆ بانگ دەکەین. گوتی: ئەبو جەهل گوتی: ئەگەر موحەممەد ﷺ ببینم نوێژ دەکات، قاچم لەسەر گەردنی دادەنێم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: «ئەگەر کارێکی وا بکات فریشتەکان بەئاشکرا و لەپێش چاوان سزای دەدەن».



## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ

### باسێک: لە سوورەتی تەکاسورەوە

٦٩٢. عَنْ مُطَرِّفِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الشِّخِّيرِ، عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه أَنَّهُ انْتَهَى إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَقْرَأُ: أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ قَالَ: «يَقُولُ ابْنُ آدَمَ: مَالِي مَالِي، وَهَلْ لَكَ مِنْ مَالِكَ إِلَّا مَا تَصَدَّقْتَ فَأَمْضَيْتَ، أَوْ أَكَلْتَ فَأَفْنَيْتَ، أَوْ لَبِسْتَ فَأَبْلَيْتَ؟».

موتەریفی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی شیخخیر، لە باوکیەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: کە ئەو گەیشتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ کاتێک سوورەتی تەکاسوری دەخوێندەوە، فەرمووی: «نەوەی ئادەم دەڵێت: ماڵ و سامانم، ماڵ و سامانم، ئایا چی لە ماڵ و سامان دەمێنێتەوە، مەگەر ئەوەی بەخشیوتە و بەڕێت کردووە، یان خواردووتە و تێدا چووە، یان خۆت پێ داپۆشیوە و کۆن بووە؟».

## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ الكَوْثَرِ

### باسێک: لە سوورەتی کەوسەرەوە

٦٩٣. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الكَوْثَرُ نَهْرٌ فِي الجَنَّةِ، حَافَّتَاهُ مِنْ ذَهَبٍ، وَمَجْرَاهُ عَلَى الدُّرِّ وَاليَاقُوتِ، تُرْبَتُهُ أَطْيَبُ مِنَ المِسْكِ، وَمَاؤُهُ أَحْلَى مِنَ العَسَلِ، وَأَبْيَضُ مِنَ الثَّلْجِ».

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «کەوسەر ڕووبارێکە لە بەهەشت، هەردوو لا لێواری لە زێڕە، شوێنی بەسەردا تێپەڕبوونی لە دوڕ و یاقووتە، گڵەکەی بۆنخۆشترە لە میسک، ئاوەکەی شیرینترە لە هەنگوین، سپیترە لە بەفر».



## بَابٌ: وَمِنْ سُورَةِ تَبَّتْ

### باسێک: لە سوورەتی تەببەت (لەهەب)

٦٩٤. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: صَعِدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ عَلَى الصَّفَا فَنَادَى: «يَا صَبَاحَاهُ»، فَاجْتَمَعَتْ إِلَيْهِ قُرَيْشٌ، فَقَالَ: «إِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ، أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَنِّي أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ العَدُوَّ مُمَسِّيكُمْ أَوْ مُصَبِّحُكُمْ أَكُنْتُمْ تُصَدِّقُونِي؟»، فَقَالَ أَبُو لَهَبٍ: أَلِهَذَا جَمَعْتَنَا؟ تَبًّا لَكَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ: {تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ}

المسند: ١.

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر کێوی صەفا و هاواریکرد: «یا صباحاه»، قورەیشییەکان بۆی کۆ بوونەوە، فەرمووی: «من کەسێکی ئاگادارکەرەوەم لەپێش هاتنی ئازارێکی بەئێش، ئایا چی دەڵێن ئەگەر هەواڵتان پێ بدەم کە دوژمن بە ئێوارە یان لە بەیانی هێرش دەکاتە سەرتان، ئایا ئەوکات بڕوام پێ

دەکەن؟»، ئەبو لەهەب گوتی: ئایا بۆ ئەمە ئێمەت کۆ کردۆتەوە؟ هەی پەکت کەوێت و تێدا بچیت، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند: {تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ}، واتە: دەستەکانی ئەبو لەهەب بشکێت و ڕیسوا بێت، ئاشکرایە کە هەر ڕیسواش دەبێت.



# أَبْوَابُ الدَّعَوَاتِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی پاڕانەوەکان لە پێغەمبەرەوە ﷺ

### بَاب مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الدُّعَاءِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گرینگی و گەورەیی پاڕانەوە



٦٩٥. عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «الدُّعَاءُ هُوَ العِبَادَةُ»، ثُمَّ قَرَأَ: «{وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ} غافر: ٦٠».

نوعمانی کوڕی بەشیر رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «پاڕانەوە بریتییە لە پەرستن»، ئینجا ئەو ئایەتەی خوێندەوە: «{وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ إِنَّ الَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِي سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ}، واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: پەنا بۆ من بهێنن و داوام لی بکەن، داواکانتان گیرا دەکەم، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن بەرانبەر بە پەرستنی من، لە ئایندەدا بەخەجاڵەتی و سەرشۆڕییەوە دەخرێنە نێو دۆزەخەوە».

## بَاب مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الذِّكْرِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی گەورەیی زیکر

٦٩٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ ﷺ: أَنَّ رَجُلاً قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ شَرَائِعَ الإِسْلَامِ قَدْ كَثُرَتْ عَلَيَّ، فَأَخْبِرْنِي بِشَيْءٍ أَتَشَبَّثُ بِهِ، قَالَ: «لَا يَزَالُ لِسَانُكَ رَطْبًا مِنْ ذِكْرِ اللَّهِ».

عەبدوڵڵای کوڕی بوسر ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێک گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بەڕاستی دروشم و شیعارەکانی ئیسلام لەسەر من زۆر بوون، جا ئەگەر شتێکم پێ بفەرموویت کە بەبەردەوامی دەستی پێوە بگرم، فەرمووی: «با هەمیشە زمانت پاراو بێت بە یادی خوا».

٦٩٧. عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ ﷺ قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «أَلَا أُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرِ أَعْمَالِكُمْ، وَأَزْكَاهَا عِنْدَ مَلِيكِكُمْ، وَأَرْفَعِهَا فِي دَرَجَاتِكُمْ وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ إِنْفَاقِ الذَّهَبِ وَالوَرِقِ، وَخَيْرٌ لَكُمْ مِنْ أَنْ تَلْقَوْا عَدُوَّكُمْ فَتَضْرِبُوا أَعْنَاقَهُمْ وَيَضْرِبُوا أَعْنَاقَكُمْ؟»، قَالُوا: بَلَى، قَالَ: «ذِكْرُ اللَّهِ تَعَالَى».

ئەبو دەرداء ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: «ئایا هەواڵتان بدەمێ دەربارەی چاکترینی کارەکانتان، پاک و بێگەردترینە لەلای پەروەردگاری پادشاتان، بەرزترینە لە پلەکانتان، بۆتان چاکترە لە بەخشینی زێڕ و زیو، بۆتان چاکترە (لە ڕێز و پاداشت) لە گەیشتن بە دوژمنتان، لە گەردنیان بدەن لە گەردنتان بدەن؟»، گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: «زیکر و یادی خوای بەرز».

## بَابٌ فِي الْقَوْمِ يَجْلِسُونَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ

### باسێک دەربارەی کەسانێک کە دانیشتوون و زیکر و یادی خوا ناکەن

٦٩٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِسًا لَمْ يَذْكُرُوا اللَّهَ فِيهِ، وَلَمْ يُصَلُّوا عَلَى نَبِيِّهِمْ، إِلَّا كَانَ عَلَيْهِمْ تِرَةً، فَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کۆمەڵە کەسێک دانیشبتن لە شوێنێک و یادی خوای تێدا نەکەن، سەڵاوات نەدەن لە پێغەمبەرەکەیان، مسۆگەر بۆیان دەبێتە مایەی لەدەستدان (یان پەشیمانبوونەوە)، ئەگەر خوا ویستی سزایان دەدات، ئەگەر ویستیشی لێیان خۆش دەبێت».

## بَاب مَا جَاءَ فِيمَنْ يَسْتَعْجِلُ فِي دُعَائِهِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی پەلە دەکات لە پاڕانەوەکەی



٦٩٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «يُسْتَجَابُ لِأَحَدِكُمْ مَا لَمْ يَعْجَلْ، يَقُولُ: دَعَوْتُ فَلَمْ يُسْتَجَبْ لِي».

ئەبو هورەیرە ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «وەڵامی پاڕانەوەی کەسێکتان دەدرێتەوە، بەو مەرجەی پەلە نەکات، بڵێت: پاڕامەوە، بەڵام وەڵام نەدرامەوە».

## بَاب مَا جَاءَ فِيمَنْ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ عِنْدَ الْمَنَامِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێت لە کاتی خەوتن

٧٠٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ، جَمَعَ كَفَّيْهِ

ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا، فَقَرَأَ فِيهِمَا: {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}، {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الفَلَقِ}، {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ}، ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ، يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ وَوَجْهِهِ، وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ.

عائیشە ﵂ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ هەموو شەوێک کاتێك چووبایە سەر جێگەی خەوتنی، هەردوو دەستەکانی کۆ دەکردەوە، ئینجا فووی تێ دەکردن، ئەو سووڕەتانەی بەسەردا دەخوێندنەوە: {قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ}، {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الفَلَقِ}، {قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ}، ئینجا دەستەکانی دەهێنا بە هەر شوێنێک دەستی پێ گەیشتبا لە لاشەی، لە سەرەتادا لە سەر و دەموچاوی دەستی پێ دەکرد، ئینجا بەشەکانی دیکەی لاشەی، سێ جاران ئەو کارەی دەکرد.

## بَاب مِنْهُ

### باسێکی دیکە هەر لەو بارەوە



٧٠١. عَنْ فَرْوَةَ بْنِ نَوْفَلٍ ﵁: أَنَّهُ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلِّمْنِي شَيْئًا أَقُولُهُ إِذَا أَوَيْتُ إِلَى فِرَاشِي، قَالَ: «اقْرَأْ: {قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ}، فَإِنَّهَا بَرَاءَةٌ مِنَ الشِّرْكِ».

فەڕوەی کوڕی نەوفەل ﵁ دەگێڕێتەوە: کە چووەتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم فێر بکە ئەگەر چوومە سەر جێگای خەوتن بیڵێم، فەرمووی: «ئەوە بخوێنە: {قُلْ يَا أَيُّهَا الكَافِرُونَ}، چونکە ئەمە خۆبەریکردنە لە هاوبەشدانان بۆ خوا».

## بَاب مَا جَاءَ مَا يَقُولُ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ إِلَى الصَّلَاةِ

### باسی ئەوەی هاتووە بەندە چی دەڵێت ئەگەر هەستایەوە بۆ شەونوێژ

٧٠٢. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا قَامَ إِلَى الصَّلَاةِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ، يَقُولُ: «اللَّهُمَّ لَكَ الحَمْدُ أَنْتَ نُورُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الحَمْدُ أَنْتَ قَيَّامُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، وَلَكَ الحَمْدُ أَنْتَ رَبُّ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَنْ فِيهِنَّ، أَنْتَ الحَقُّ، وَوَعْدُكَ الحَقُّ، وَلِقَاؤُكَ حَقٌّ، وَالجَنَّةُ حَقٌّ، وَالنَّارُ حَقٌّ، وَالسَّاعَةُ حَقٌّ، اللَّهُمَّ لَكَ أَسْلَمْتُ، وَبِكَ آمَنْتُ، وَعَلَيْكَ تَوَكَّلْتُ، وَإِلَيْكَ أَنَبْتُ، وَبِكَ خَاصَمْتُ، وَإِلَيْكَ حَاكَمْتُ، فَاغْفِرْ لِي مَا قَدَّمْتُ وَمَا أَخَّرْتُ، وَمَا أَسْرَرْتُ وَمَا أَعْلَنْتُ، إِنَّكَ إِلَهِي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر هەستابایەوە بۆ نوێژ لە نیوەشەو، دەیفەرموو: «ئەی خوای ستاییشی تەواو بۆ تۆیە، تۆی ڕووناککەرەوەی ئاسمانەکان و زەویت، ستاییشی تەواو بۆ تۆیە، تۆی ڕاگری ئاسمانەکان و زەویت، ستاییشی تەواو بۆ تۆیە، تۆی پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەشیت کە تێیاندایە، تۆ هەقی بەڵێنەکەت هەقە، دیدارت هەقە، بەهەشت هەقە، دۆزەخ هەقە، ڕۆژی دوایی هەقە، ئەی خوایە خۆم داوەتە دەست تۆ، بڕوای تەواوم هێناوە بە تۆ، پشتم بەستووە بە تۆ، بۆ لای تۆیە گەڕانەوەم و پەشیمانیم، بە یارمەتیی تۆ ناکۆکم (لەگەڵ ناحەزانی ئیسلام)، هەر بۆ لای تۆیە دادوەریم، دەسا تۆش لێم خۆش بە لەوەی لە ڕابردوو و داهاتوو و ئەوەی بەنهێنی و ئاشکرا کردوومە، تۆی پەروەردگاری ڕاستەقینەمی، هیچ پەرستراوێکی دیکە نییە بەهەق جگە لە تۆ».

## بَاب مَا جَاءَ فِي الدُّعَاءِ عِنْدَ افْتِتَاحِ الصَّلَاةِ بِاللَّيْلِ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پاڕانەوەی دەستپێکردنی نوێژ لە شەودا

٧٠٣. عَنْ أَبِي سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا بِأَيِّ شَيْءٍ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَفْتَتِحُ صَلَاتَهُ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ؟ قَالَتْ: كَانَ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ افْتَتَحَ صَلَاتَهُ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ رَبَّ جِبْرِيلَ، وَمِيكَائِيلَ، وَإِسْرَافِيلَ، فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضِ، عَالِمَ الغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ، أَنْتَ تَحْكُمُ بَيْنَ عِبَادِكَ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ، اهْدِنِي لِمَا اخْتُلِفَ فِيهِ مِنَ الحَقِّ بِإِذْنِكَ، إِنَّكَ عَلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ».

ئەبو سەلەمە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێت: پرسیارم کرد لە عائیشە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر لە شەو هەستابایەوە، نوێژەکانی بە چی دەست پێ دەکرد؟ گوتی: کاتێک پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵدەستایەوە لە شەودا، لە دەستپێکی نوێژدا دەیفەرموو: ئەی پەروەردگاری جیبریل و میکائیل و ئیسرافیل، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، زانا بە شاراوە و دیارەکان، تۆی دادوەریی ڕاستەقینە دەکەیت لە نێوان بەندەکانت لەوەی کە تێیدا جیاوازن، ڕێنموویم بکە لەوەی کە خەڵکی جیاوازییان بۆ دروست بووە لە ناسینی ڕاستی بە ڕێپێدانی خۆت، هەر تۆی لەسەر ڕێگای ڕاستی.

٧٠٤. عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ مِنْ بَيْتِهِ قَالَ: «بِسْمِ اللَّهِ، تَوَكَّلْتُ عَلَى اللَّهِ، اللَّهُمَّ إِنَّا نَعُوذُ بِكَ مِنْ أَنْ نَزِلَّ، أَوْ نَضِلَّ، أَوْ نَظْلِمَ، أَوْ نُظْلَمَ، أَوْ نَجْهَلَ، أَوْ يُجْهَلَ عَلَيْنَا».

ئوم سەلەمە رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك لە ماڵ دەردەچوو، دەیفەرموو: «بە ناوی خوا، پشتم بەستووە بە خوا، ئەی خوایە پەنا بە تۆ دەگرین لەوەی لەخشتە ببرێین، یان گومڕا ببین، یان ستەم بکەین، یان ستەممان لێ بکرێت، یان ڕەفتاری نەفامی بکەین، یان بەرانبەرمان نەفامی بکرێت».

## بَاب مَا يَقُولُ إِذَا رَأَى مُبْتَلًى

### باسی ئەوەی دەگوترێت لە کاتی بینینی کەسێکی گرفتار

٧٠٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ رَأَى مُبْتَلًى، فَقَالَ: الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلَاكَ بِهِ، وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلاً، لَمْ يُصِبْهُ ذَلِكَ البَلَاءُ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر یەکێک لە ئێوە خاوەن بەڵا و گرفتارییەکی بینی و گوتی: ستاییش بۆ ئەو خوایەی کە بێبەڵای کردووم لەوەی کە توشت هاتووە، فەزڵ و ڕێزی زیادەی پێ داوم بەسەر زۆرێک لە خەڵکی دیکە (بەبێدەنگی بیڵێت، نەک ئاڕاستەی کەسەکەی بکات)، ئەوە ئەو پارێزراو دەبێت لەو بەڵا و گرفتارییە».



## بَاب مَا يَقُولُ إِذَا قَامَ مِنْ مَجْلِسِهِ

### باسی ئەوەی دەگوترێت لە کاتی هەڵسان لە دانیشتنێك

٧٠٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ جَلَسَ فِي مَجْلِسٍ فَكَثُرَ فِيهِ لَغَطُهُ، فَقَالَ قَبْلَ أَنْ يَقُومَ مِنْ مَجْلِسِهِ ذَلِكَ: سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ، أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ، إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا كَانَ فِي مَجْلِسِهِ ذَلِكَ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە کۆڕێک دانیشتبێت، گفتوگۆی بێسوود و زێدەڕۆیی تێدا کرابێت، با پێش هەستانی لە کۆڕەکەی بڵێت: پاکی و پیرۆزی بۆ تۆ ئەی خوایە، ستاییشی تەواو بۆ تۆ، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە تۆ، داوای لێخۆشبوونیشت لێ دەکەم، مسۆگەر خوا لێی دەبوورێت دەربارەی ئەو کەموکوڕییانەی تووشی بووە لە دانیشتنەکەیدا».

## بَاب مَا جَاءَ مَا يَقُولُ إِذَا نَزَلَ مَنْزِلاً

### باسی ئەوەی هاتووە چ دەگوترێت لە کاتی بارگەوبنە دانان بۆ پشوودان

٧٠٧. عَنْ خَوْلَةَ بِنْتِ حَكِيمٍ السُّلَمِيَّةِ ﵂ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «مَنْ نَزَلَ مَنْزِلاً ثُمَّ قَالَ: أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ شَرِّ مَا خَلَقَ، لَمْ يَضُرَّهُ شَيْءٌ حَتَّى يَرْتَحِلَ مِنْ مَنْزِلِهِ ذَلِكَ».

خەولەی کچی حەکیمی سولەمییە ﵂ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە شوێنێک دابەزی ئینجا گوتی: پەنا دەگرم بە وشە تەواوەکانی خوا لە خراپەی هەرچییەک کە دروستی کردووە، ئەوە هیچ شتێک زیانی لێ نادات تا ئەو شوێنە جێ دەهێڵێت».



## بَاب مَا يَقُولُ إِذَا وَدَّعَ إِنْسَانًا

### باسی ئەوەی دەگوترێت لە کاتی بەڕێکردنی کەسێك بۆ گەشت

٧٠٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا وَدَّعَ رَجُلاً أَخَذَ بِيَدِهِ، فَلَا يَدَعُهَا حَتَّى يَكُونَ الرَّجُلُ هُوَ يَدَعُ يَدَ النَّبِيِّ ﷺ، وَيَقُولُ: «أَسْتَوْدِعُ اللَّهَ دِينَكَ وَأَمَانَتَكَ وَآخِرَ عَمَلِكَ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ماڵئاوایی لە کەسێک کردبایە (لە کاتی بەڕێکردنی) دەستی دەگرت، دەستی بەرنەدەدا هەتا پیاوەکە دەستی پێغەمبەری خوای ﷺ بەردەدا، دەیفەرموو: «ئایین و ئەمانەت و کۆتایی کارەکانت بە خوای گەورە دەسپێرم».

## بَاب مَا يَقُولُ إِذَا فَرَغَ مِنَ الطَّعَامِ

### باسی ئەوەی دەگوترێت لەدوای تەواوبوونی خواردن

٧٠٩. عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا رُفِعَتِ المَائِدَةُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ يَقُولُ: «الحَمْدُ لِلَّهِ حَمْدًا كَثِيرًا طَيِّبًا مُبَارَكًا فِيهِ غَيْرَ مُوَدَّعٍ وَلَا مُسْتَغْنًى عَنْهُ رَبُّنَا».

ئەبو ئومامە رضي الله عنه دەڵێت: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ خواردنی لەپێش دەست هەڵگیرابایەوە دەیفەرموو: «ستاییشی تەواو بۆ خوا، ستاییشێکی زۆر و پاک و پیرۆز، نەبڕاوە و کۆتایی نەبێت، بێباک نەبین بەرانبەر بە پەروەردگارمان».

## بَابٌ

### باسێک

٧١٠. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ قَالَ حِينَ يُصْبِحُ وَحِينَ يُمْسِي: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ مِائَةَ مَرَّةٍ لَمْ يَأْتِ أَحَدٌ يَوْمَ القِيَامَةِ بِأَفْضَلَ مِمَّا جَاءَ بِهِ إِلَّا أَحَدٌ قَالَ مِثْلَ مَا قَالَ أَوْ زَادَ عَلَيْهِ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «هەر کەسێک لە بەیانییان و ئێوارانددا سەد جاران بڵێت: (سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ)، هیچ کەسێک لە ڕۆژی دوایی نایەت بە چاکتر و باشتر لەوەی کە ئەو پێی هاتووە، مەگەر ئەو کەسەی کە وەک ئەو بڵێت یان لەو زیاتر بێت».

## بَابٌ

### باسێک

٧١١. عَنْ فَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ ﵁ قَالَ: بَيْنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَاعِدٌ إِذْ دَخَلَ رَجُلٌ فَصَلَّى فَقَالَ: اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «عَجِلْتَ أَيُّهَا الْمُصَلِّي، إِذَا صَلَّيْتَ فَقَعَدْتَ فَاحْمَدِ اللَّهَ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، وَصَلِّ عَلَيَّ ثُمَّ ادْعُهُ»، قَالَ: ثُمَّ صَلَّى رَجُلٌ آخَرُ بَعْدَ ذَلِكَ فَحَمِدَ اللَّهَ وَصَلَّى عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: «أَيُّهَا الْمُصَلِّي ادْعُ تُجَبْ».

فەزاڵەی کوڕی عوبەید ﵁ دەڵێت: جارێک پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، لەناکاو پیاوێک هاتە ژوورەوە و نوێژی کرد، گوتی: ئەی خوایە لێم خۆش بە و ڕەحمم پێ بکە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «بەڕاستی پەلەت کرد (لە پاڕانەوەت) ئەی نوێژخوێن، ئەگەر نوێژت کرد، دابنیشە و ستاییشی خوا بکە بەوەی شیاوی ئەوە، پاشان سەڵاوات بدە لەسەر من، ئینجا دوعا بکە»، گوتی: پیاوێکی دیکە نوێژی کرد لەدوای ئەو، ستاییشی خوای کرد، سەڵاواتی دا لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: «ئەی نوێژخوێن داوا بکە وەڵام دەدرێیتەوە».

٧١٢. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ عِنْدَ وَفَاتِهِ: «اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي وَارْحَمْنِي، وَأَلْحِقْنِي بِالرَّفِيقِ الأَعْلَى».

عائیشە ﵂ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە کاتی سەرەمەرگی دەیفەرموو: «ئەی خوایە لێم خۆش بە و ڕەحمم پێ بکە، بمگەیەنە بە هاوەڵە بەرزەکان».

## بَابٌ

### باسێک

٧١٣. عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ رضي الله عنه أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ عَلِّمْنِي دُعَاءً أَدْعُو بِهِ فِي صَلَاتِي. قَالَ: «قُلْ: اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا، وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ، فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ، وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الغَفُورُ الرَّحِيمُ».

له ئەبو بەكری صدديقەوە رضي الله عنه دەگێڕنەوە كە گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا، پاڕانەوەیەكم فێر بكە كە لەنێو نوێژەكانمدا پێی لە خوا بپاڕێمەوە، فەرمووی: «بڵێ: خوایە بەڕاستی من ستەمم لە خۆم كردووە، ستەمێكی زۆر، كەس لە گوناهەكان نابورێت جگە لە تۆ، دەسا لێم خۆش ببە، لێخۆشبوونێک لەلای تۆوە بێت، ڕەحمم پێ بكە، بەڕاستی تۆی لێبووردە و بەبەزەیی».

٧١٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «خَلَقَ اللَّهُ مِائَةَ رَحْمَةٍ فَوَضَعَ رَحْمَةً وَاحِدَةً بَيْنَ خَلْقِهِ يَتَرَاحَمُونَ بِهَا وَعِنْدَ اللَّهِ تِسْعٌ وَتِسْعُونَ رَحْمَةً».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خوای گەورە بەزەیی دروست كردووە، كردوویەتی بە سەد بەش، یەک بەشی داناوە لە نێوان دروستكراوەكانی كە بەهۆیەوە بەزەیی دەنوێنن لە نێوان یەكدیدا، خوا نەوەد و نۆ بەشیشی لەلای خۆی هێشتووەتەوە (بۆ دواڕۆژ)».

٧١٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «لَوْ يَعْلَمُ المُؤْمِنُ مَا عِنْدَ اللَّهِ مِنَ العُقُوبَةِ مَا طَمِعَ فِي الجَنَّةِ أَحَدٌ، وَلَوْ يَعْلَمُ الكَافِرُ مَا عِنْدَ اللَّهِ مِنَ الرَّحْمَةِ مَا قَنَطَ مِنَ الجَنَّةِ أَحَدٌ».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەگەر بڕوادار دەیزانی چ سزایەک هەیە لەلای خوا، هیچ یەكێكیان ئومێدی بە بەهەشت نەدەكرد

(بەڵکوو تەنها بیری لای ڕزگاربوون دەبوو لە سزاکان)، ئەگەر بێبڕواش دەیزانی چ بەزەییەك هەیە لەلای خوا، هیچ یەکێك لەوان لە چوونە بەهەشت بێئومێد نەدەبوو».

٧١٦. عَنْ حُسَيْنِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الْبَخِيلُ الَّذِي مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ».

حوسەینی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیب رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ڕەزیل ئەو کەسەیە کە باسی منی لەلا بکرێت و سەڵاواتم لەسەر لێ نەدات».

٧١٧. عَنْ جُوَيْرِيَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ رضي الله عنها: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ مَرَّ عَلَيْهَا وَهِيَ فِي مَسْجِدِهَا ثُمَّ مَرَّ النَّبِيُّ ﷺ بِهَا قَرِيباً مِنْ نِصْفِ النَّهَارِ، فَقَالَ لَهَا: «مَا زِلْتِ عَلَى حَالِكِ». فَقَالَتْ: نَعَمْ، قَالَ: «أَلَا أُعَلِّمُكِ كَلِمَاتٍ تَقُولِينَهَا: سُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ عَدَدَ خَلْقِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ رِضَا نَفْسِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ رِضَا نَفْسِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ رِضَا نَفْسِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ مِدَادَ كَلِمَاتِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ مِدَادَ كَلِمَاتِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ مِدَادَ كَلِمَاتِهِ».



جوەیریەی کچی حاریس رضي الله عنها دەگێڕێتەوە: جارێکیان پێغەمبەر ﷺ بەلایدا تێپەڕ بوو، لە کاتێکدا ئەو لە شوێنی نوێژکردنی خۆی بووە، پاشان (جارێکی دیکە) پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایدا تێپەڕ بوو، کە کاتەکەی نزیکی نیوەڕۆ بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: «هێشتا هەر لەسەر حاڵەتی خۆتی»، گوتی: بەڵێ، فەرمووی: «ئایا چەند وشەیەکت فێر بکەم بۆخۆت بیڵێیەوە: پاک و بێگەردی بۆ خوا بە ژمارەی دروستکراوەکانی، پاک و بێگەردی بۆ خوا بە ژمارەی دروستکراوەکانی، پاک و بێگەردی بۆ خوا بە ژمارەی دروستکراوەکانی، پاک و بێگەری بۆ خوا بەئەندازەی ڕازی بوونی خۆی، پاک و بێگەری بۆ خوا بەئەندازەی ڕازی بوونی خۆی، پاک و بێگەری بۆ خوا بەئەندازەی ڕازی بوونی خۆی، پاک و بێگەری بۆ خوا بە ئەندازەی کێشی عەڕشەکەی، پاک و بێگەری بۆ خوا بە ئەندازەی کێشی عەڕشەکەی، پاک و

بێگەری بۆ خوا بە ئەندازەی کێشی عەرشەکەی، پاک و بێگەری بۆ خوا بەئەندازەی مورەککەبی وشەکانی، پاک و بێگەری بۆ خوا بەئەندازەی مورەککەبی وشەکانی، پاک و بێگەری بۆ خوا بەئەندازەی مورەککەبی وشەکانی».

٧١٨. عَنْ سَلْمَانَ الفَارِسِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: «إِنَّ اللَّهَ حَيِيٌّ كَرِيمٌ يَسْتَحْيِي إِذَا رَفَعَ الرَّجُلُ إِلَيْهِ يَدَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْرًا خَائِبَتَيْنِ».

سەلمانی فارسی رَضِيَ اللهُ عَنْهُ لە پێغەمبەرەوە صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «بێگومان خوا بەشەرمە (وەك چۆن کەسێك شەرم بکات و نەتوانێت نەبەخشێت کاتێك داوای لێ دەکەن)، بەڕێزیشە (ڕێز لە بەندەی خۆی دەگرێت و پێی دەبەخشێت)، پێیناخۆشە (وەك کەسێك کە شەرم بکات و پێی ناخۆش بێت خەڵك ڕەت بکاتەوە) ئەگەر پیاوێك دەستەکانی بەرز بکاتەوە و لێی بپاڕێتەوە ڕەتی بکاتەوە بەبەتاڵی، (کەواتە: شتێکی پێ دەبەخشێت)».

٧١٩. عَنْ مُعَاذ بْن رِفَاعَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: قَامَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ عَلَى المِنْبَرِ ثُمَّ بَكَى فَقَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَامَ الأَوَّلِ عَلَى المِنْبَرِ ثُمَّ بَكَى فَقَالَ: «اسْأَلُوا اللَّهَ العَفْوَ وَالعَافِيَةَ، فَإِنَّ أَحَدًا لَمْ يُعْطَ بَعْدَ اليَقِينِ خَيْرًا مِنَ العَافِيَةِ».

موعازی کوڕی ڕیفاعە، لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە، گوتوویەتی: ئەبو بەکری صددیق رَضِيَ اللهُ عَنْهُ هەستا بۆ سەر مینبەر، ئینجا گریا و گوتی: کاتی خۆی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لەساڵی یەکەم هەستا لەسەر مینبەر، گریا و فەرمووی: «داوای لێخۆشبوون و ساغ و سەلامەتی لە خوا بکەن، بەڕاستی کەسێک لەدوای ئیمان شتێکی پێ نەدراوە چاکتر بێت لە ساغ و سەلامەتی».

## بَابُ فِي دُعَاءِ الوِتْرِ

### باسێک دەربارەی پاڕانەوەکانی نوێژی ویتر

٧٢٠. عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَقُولُ فِي وِتْرِهِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ، وَأَعُوذُ بِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی ویتردا دەیفەرموو: «خوایە پەنا دەبەمە بەر ڕەزامەندیت لە توڕەبوونت، پەنا دەبەمە بەر لێخۆشبوونت لە سزادانت، پەنا دەبەمە بەر تۆ لە (سزا و توڕەیی) خۆت، ناتوانم مافی (پڕ بەپێستی) ستاییش و سەنات بدەم، بەم شێوەیەی کە تۆ ستاییش و سەنای خۆتت کردووە».



## بَاب فِي دُعَاءِ الضَّيْفِ

### باسی دوعای میوان (بۆ خاوەن ماڵ)

٧٢١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ بُسْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: نَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَلَى أَبِي فَقَرَّبْنَا إِلَيْهِ طَعَامًا فَأَكَلَهُ، ثُمَّ أُتِيَ بِتَمْرٍ فَكَانَ يَأْكُلُ وَيُلْقِي النَّوَى بِإِصْبَعَيْهِ جَمَعَ السَّبَّابَةَ وَالوُسْطَى -قَالَ شُعْبَةُ: وَهُوَ ظَنِّي فِيهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ وَأَلْقَى النَّوَى بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ-، ثُمَّ أُتِيَ بِشَرَابٍ فَشَرِبَهُ، ثُمَّ نَاوَلَهُ الَّذِي عَنْ يَمِينِهِ، قَالَ: فَقَالَ أَبِي وَأَخَذَ بِلِجَامِ دَابَّتِهِ ادْعُ لَنَا، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ بَارِكْ لَهُمْ فِيمَا رَزَقْتَهُمْ، وَاغْفِرْ لَهُمْ وَارْحَمْهُمْ».

عەبدوڵڵای کوڕی بوسر رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەڵێت: جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بە میوانداری دابەزی لە لای باوکم، خواردنمان بردە خزمەتی و خواردی، ئینجا هەندێك خورمایان بۆ هێنا، ئەویش لێی خوارد و ناوکە خورمایەکەی بە پەنجەی شایەتمانی و نێوەند دەگرت و فڕێی دەدا، -شوعبە (ڕاوی) دەڵێت: بە پشتیوانی

خوا گومانم وایە کە ناوکە خورمایەکەی دەخستە نێوان هەردوو پەنجەی-، پاشان خواردنەوەکیان بۆ هێنا و لێی خواردەوە، ئینجا دایە دەست ئەو کەسەی کە لەلای ڕاستی بوو، عەبدوڵڵا گوتی: باوکم لغاوی سوارەکەی پێغەمبەری ﷺ گرتبوو، گوتی: دوعامان بۆ بکە، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: «ئەی خوایە بەرەکەت بخەیتە ئەو ڕزق و ڕۆزییەی کە پێت داون، لێیان خۆش بە و ڕەحمیان پێ بکە».

٧٢٢. عَنْ بِلَالِ بْنِ يَسَارِ بْنِ زَيْدٍ، حَدَّثَنِي أَبِي، عَنْ جَدِّي رضي الله عنه: أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ: «مَنْ قَالَ أَسْتَغْفِرُ اللهَ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الحَيَّ القَيُّومَ وَأَتُوبُ إِلَيْهِ، غُفِرَ لَهُ وَإِنْ كَانَ فَرَّ مِنْ الزَّحْفِ».

بیلالی کوڕی یەساری کوڕی زەید، لە باوکیەوە، ئەویش لە باپیریەوە رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: «هەر کەسێک بڵێت: داوای لێبووردن لە خوا دەکەم کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لەو، هەمیشە زیندووە و ڕاگری هەموو شتێکە، داوای پەشیمانی لەو دەکەم، خوا لێی دەبوورێت ئەگەر لە کاتی جەنگیش ڕایکردبێت (واتە: گوناهی گەورەشی کردبێت)».



## بَابٌ

### باسێک

٧٢٣. عَنْ عُثْمَانَ بْنِ حُنَيْفٍ رضي الله عنه: أَنَّ رَجُلًا ضَرِيرَ البَصَرِ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: ادْعُ اللَّهَ أَنْ يُعَافِيَنِي قَالَ: «إِنْ شِئْتَ دَعَوْتُ، وَإِنْ شِئْتَ صَبَرْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ»، قَالَ: فَادْعُهْ، قَالَ: فَأَمَرَهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ فَيُحْسِنَ وُضُوءَهُ وَيَدْعُوَ بِهَذَا الدُّعَاءِ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ، إِنِّي تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حَاجَتِي هَذِهِ لِتُقْضَى لِيَ، اللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ».

عوسمانی کوڕی حونەیف ﷺ دەگێڕێتەوە: پیاوێکی نابینا هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: داوام بۆ بکە لە خوا کە چاوەکانم چاک بکاتەوە، فەرمووی: «ئەگەر حەز بکەیت بۆت دەپاڕێمەوە، ئەگەر دەشتوانیت ئارام بگرە ئەوە بۆت چاکترە»، گوتی: بۆم بپاڕێوە و داوام بۆ بکە، عوسمان گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ کرد دەستنوێژێکی جوان بشوات، بپاڕێتەوە بەو پاڕانەوەیە: «خوایە من داوات لێ دەکەم و ڕوو دەکەمە تۆ بە پێغەمبەرەکەت موحەممەد، پێغەمبەری سۆز و بەزەیی، من بە تۆوە ئەی (پێغەمبەری خوا ﷺ) ڕووی داواکردنم کردە خوای پەروەردگارم بۆ بەجێهێنانی ئەم پێویستییەم تا بۆم جێبەجێ بکرێت، ئەی خوایە تکاکردنەکەی بۆم قبووڵ بکەیت».

# أَبْوَابُ الْمَنَاقِبِ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ

## کۆباسی ڕێز و پلەکان لە پێغەمبەری خواوە ﷺ

### بَابٌ فِي فَضْلِ النَّبِيِّ ﷺ

### باسێک دەربارەی پێگە و گەورەیی پێغەمبەری خوا ﷺ



٧٢٤. عَنْ وَاثِلَةَ بْنِ الأَسْقَعِ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَى كِنَانَةَ مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَاصْطَفَى قُرَيْشًا مِنْ كِنَانَةَ، وَاصْطَفَى هَاشِمًا مِنْ قُرَيْشٍ، وَاصْطَفَانِي مِنْ بَنِي هَاشِمٍ».

واسیلەی کوڕی ئەسقەع رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان خوا لە کوڕەکانی ئیسماعیل نەوەی کینانەی هەڵبژاردووە، لە نەوەی کینانەش قوڕەیشی هەڵبژاردووە، لە قوڕەیشیش نەوەی هاشیمی هەڵبژاردووە، منیشی لەنێو نەوەی هاشیم هەڵبژاردووە».

٧٢٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَتَى وَجَبَتْ لَكَ النُّبُوَّةُ؟ قَالَ: «وَآدَمُ بَيْنَ الرُّوحِ وَالجَسَدِ».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، لە چ کاتێک پێغەمبەرایەتیت بۆ

بڕیار دراوە؟ فەرمووی: «لەو ساتەی کە باوکە ئادەم لە نێوان ڕووح و جەستەدا بوو».

٧٢٦. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «سَلُوا اللَّهَ لِيَ الوَسِيلَةَ»، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الوَسِيلَةُ؟ قَالَ: «أَعْلَى دَرَجَةٍ فِي الجَنَّةِ لَا يَنَالُهَا إِلَّا رَجُلٌ وَاحِدٌ أَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ».

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «داوای وەسیلەتم بۆ بکەن لە خوا»، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا وەسیلەت چییە؟ فەرمووی: «بەرزترین پلەیە لە بەهەشت، تەنیا بە یەک کەس دەدرێت، ئومێدم وایە ئەو کەسە من بم».

٧٢٧. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ القِيَامَةِ وَلَا فَخْرَ، وَبِيَدِي لِوَاءُ الحَمْدِ وَلَا فَخْرَ، وَمَا مِنْ نَبِيٍّ يَوْمَئِذٍ آدَمُ فَمَنْ سِوَاهُ إِلَّا تَحْتَ لِوَائِي، وَأَنَا أَوَّلُ مَنْ تَنْشَقُّ عَنْهُ الأَرْضُ وَلَا فَخْرَ».



ئەبو سەعید رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «من گەورەی کوڕانی ئادەمم لە ڕۆژی دوایی بەبێ خۆهەڵکێشان، ئاڵای ستاییشی تەواو بەدەستی منەوەیە بەبێ خۆهەڵکێشان، هەرچی پێغەمبەرە لەو ڕۆژەدا لە ئادەم و جگە لە ئەویش هەمووی لەژێر ئاڵای مندان، من یەکەم کەس دەبم کە زەویم بۆ لەت دەکرێت (بۆ هاتنەدەر) بەبێ خۆهەڵکێشان».

٧٢٨. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا كَانَ اليَوْمُ الَّذِي دَخَلَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ المَدِينَةَ أَضَاءَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، فَلَمَّا كَانَ اليَوْمُ الَّذِي مَاتَ فِيهِ أَظْلَمَ مِنْهَا كُلُّ شَيْءٍ، وَمَا نَفَضْنَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الأَيْدِي وَإِنَّا لَفِي دَفْنِهِ حَتَّى أَنْكَرْنَا قُلُوبَنَا.

ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه دەڵێت: ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە نێو شاری مەدینە، هەموو شتێک درەوشایەوە و ڕووناك بوو، ئەو ڕۆژەش کە کۆچی دوایی کرد هەموو شتێک تاریک بوو، دەستمان لە ناشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ هەڵنەگرتبوو، خەریکی ناشتنی بووین، دڵەکانمان گۆڕانی بەسەردا هات.

## بَابُ فِي آيَاتِ نُبُوَّةِ النَّبِيِّ ﷺ وَمَا قَدْ خَصَّهُ اللَّهُ بِهِ

## باسێک دەربارەی نیشانەکانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ که خوا تایبەتی کردووە بە ئەوەوە ﷺ

٧٢٩. عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ بِمَكَّةَ حَجَرًا كَانَ يُسَلِّمُ عَلَيَّ لَيَالِيَ بُعِثْتُ، إِنِّي لَأَعْرِفُهُ الآنَ».

جابیری کوڕی سەمورە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە مەککە بەردێک هەبوو سڵاوی لێ دەکردم لەو شەوانەی کە بووم بە پێغەمبەر، بەدڵنیاییی من ئێستاش دەیناسمەوە».

٧٣٠. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَقَالَ بِمَ أَعْرِفُ أَنَّكَ نَبِيٌّ؟ قَالَ: «إِنْ دَعَوْتُ هَذَا العِذْقَ مِنْ هَذِهِ النَّخْلَةِ تَشْهَدُ أَنِّي رَسُولُ اللَّهِ؟»، فَدَعَاهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، فَجَعَلَ يَنْزِلُ مِنَ النَّخْلَةِ حَتَّى سَقَطَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، ثُمَّ قَالَ: «ارْجِعْ»، فَعَادَ، فَأَسْلَمَ الأَعْرَابِيُّ.

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: دەشتەکییەک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ، گوتی: بە چی بزانم تۆ پێغەمبەریت؟ فەرمووی: «ئەگەر بانگی ئەو دەنکە خورمایە بکەم لەو دارخورمایە (بۆم بێتە خوار)، ئایا تۆ ئەوکات شایەتیم بۆ دەدەیت کە من پێغەمبەری خوام؟»، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کرد، لە دارخورمایەکە هاتە خوار هەتا کەوتە پێش پێغەمبەری خوا ﷺ، ئینجا پێی فەرموو: «بگەڕێوە (شوێنی خۆت)»، جا گەڕایەوە، دەشتەکییەکە موسوڵمان بوو.

## بَابٌ

### باسێک

٧٣١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَحَانَتْ صَلَاةُ العَصْرِ وَالتَمَسَ النَّاسُ الوَضُوءَ فَلَمْ يَجِدُوا، فَأُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِوَضُوءٍ فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدَهُ فِي ذَلِكَ الإِنَاءِ وَأَمَرَ النَّاسَ أَنْ يَتَوَضَّئُوا مِنْهُ، قَالَ: فَرَأَيْتُ المَاءَ يَنْبُعُ مِنْ تَحْتِ أَصَابِعِهِ، فَتَوَضَّأَ النَّاسُ حَتَّى تَوَضَّئُوا مِنْ عِنْدِ آخِرِهِمْ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کاتی نوێژی عەسر بوو، خەڵکی بەدوای ئاوی دەستنوێژ دەگەڕان و دەستیان نەکەوت، ئاوی دەستنوێژ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هێنرا، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی پیرۆزی خستە نێو قاپەکە، فەرمانی کرد بە خەڵکی بێن و دەستنوێژی لێ بشۆرن، ئەنەس دەگێڕێتەوە و دەڵێت: دەمبینی ئاو لەژێر پەنجەکانی هەڵدەقوڵا، خەڵکی دەستنوێژیان لێی شوشت تا دوایین کەسیان.



## بَابُ مَا جَاءَ فِي صِفَةِ النَّبِيِّ ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ

٧٣٢. عَنِ البَرَاءِ ﵁ قَالَ: مَا رَأَيْتُ مِنْ ذِي لِمَّةٍ فِي حُلَّةٍ حَمْرَاءَ أَحْسَنَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، لَهُ شَعْرٌ يَضْرِبُ مَنْكِبَيْهِ، بَعِيدُ مَا بَيْنَ المَنْكِبَيْنِ، لَمْ يَكُنْ بِالقَصِيرِ وَلَا بِالطَّوِيلِ.

بەڕاء ﵁ دەڵێت: هیچ کەسێکم نەبینیوە کە خاوەن قژێکی درێژ بێت و پۆشاکێکی سووری لەبەر بێت و جوانتر بێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ، قژی لە نێوان هەر دوو لاشانی دەهاتە خوار، نێوان هەردوو لاشانی پان بوو، باڵای نە کورت بوو نە درێژ (مامناوەند بوو).

## بَابٌ فِي كَلَامِ النَّبِيِّ ﷺ

باسێک دەربارەی شێوەی ئاخاوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ

٧٣٣. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ؓ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُعِيدُ الكَلِمَةَ ثَلَاثًا لِتُعْقَلَ عَنْهُ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ؓ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ وشەیەکی سێ جار دووبارە دەکردەوە بۆئەوەی (ئامادەبووان) باش لێی تێبگەن.

## بَابٌ فِي بَشَاشَةِ النَّبِيِّ ﷺ

باسێک دەربارەی ڕووخۆشی پێغەمبەر ﷺ

٧٣٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الحَارِثِ بْنِ جَزْءٍ ؓ قَالَ: مَا رَأَيْتُ أَحَدًا أَكْثَرَ تَبَسُّمًا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ.

عەبدوڵڵای کوڕی حاریسی کوڕی جەزئی ؓ دەڵێت: کەسم نەبینیوە بەخەندەتر بێت لە پێغەمبەری خوا ﷺ.

## بَابٌ فِي سِنِّ النَّبِيِّ ﷺ وَابْنُ كَمْ كَانَ حِينَ مَاتَ

باسێک دەربارەی تەمەنی پێغەمبەری خوا ﷺ و
تەمەنی چەند بوو کاتێك کۆچی دوایی کرد

٧٣٥. عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، عَنْ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ؓ أَنَّهُ قَالَ: سَمِعْتُهُ يَخْطُبُ يَقُولُ: مَاتَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَهُوَ ابْنُ ثَلَاثٍ وَسِتِّينَ، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ، وَأَنَا ابْنُ ثَلَاثٍ وَسِتِّينَ.

جەریری کوڕی عەبدوڵڵا دەڵێت: گوێم لە موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﵄ بوو وتاری دەدا و دەیگوت: پێغەمبەری خوا ﷺ کە کۆچی دوایی کرد تەمەنی شەست و سێ ساڵ بووە، ئەبو بەکر و عومەریش بەهەمان شێوە، منیش کوڕی شەست و سێ ساڵیم.

## بَابُ مَنَاقِبِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ ﵁ وَاسْمُهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُثْمَانَ وَلَقَبُهُ عَتِيقٌ

### باسی پێگە و گەورەیی ئەبو بەکری صددیق ﵁ کە ناوی عەبدوڵڵای کوڕی عوسمانە و نازناوی عەتیقە

٧٣٦. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَبْرَأُ إِلَى كُلِّ خَلِيلٍ مِنْ خِلِّهِ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً لاَتَّخَذْتُ ابْنَ أَبِي قُحَافَةَ خَلِيلاً، وَإِنَّ صَاحِبَكُمْ لَخَلِيلُ اللَّهِ».

عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «من بەریم لە هەر خۆشەویستێک کە پێی وا بێت کردوومە بە خۆشەویستی خۆم (هاوڕێی گیانی بەگیانی خۆم)، خۆ ئەگەر ئەو کارەم کردبا ئەوە کوڕی ئەبو قوحافە (ئەبو بەکر)م دەکردە خۆشەویستی خۆم، چونکە بێگومان هاوڕێکەتان (واتە: خۆی) خۆشەویستی خوایە».

٧٣٧. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ سَيِّدَا كُهُولِ أَهْلِ الْجَنَّةِ مِنَ الأَوَّلِينَ وَالآخِرِينَ مَا خَلاَ النَّبِيِّينَ وَالْمُرْسَلِينَ، لَا تُخْبِرْهُمَا يَا عَلِيُّ».

عەلی ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ئەبو بەکر و عومەر گەورەی پیاوانی بەهەشتن لە کەسەکانی پێشوو لە کەسانی دواییش، جگە لە پێغەمبەران نەبێت، ئەی عەلی هەواڵیان پێ مەدە».

## بَابُ فِي مَنَاقِبِ أَبِي حَفْصٍ عُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ ﵁

### باسێک دەربارەی پێگە و گەورەیی ئەبو حەفصە عومەری کوڕی خەتتاب ﵁

٧٣٨. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اللَّهُمَّ أَعِزَّ الإِسْلَامَ بِأَحَبِّ هَذَيْنِ الرَّجُلَيْنِ إِلَيْكَ بِأَبِي جَهْلٍ أَوْ بِعُمَرَ بْنِ الخَطَّابِ»، قَالَ: وَكَانَ أَحَبَّهُمَا إِلَيْهِ عُمَرُ.

ئیبن عومەر ﵄ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەی خوایە ئایینی ئیسلام بەهێز بکەیت بە خۆشەویستترین پیاو لەلات لەو دوو کەسە، بە ئەبو جەهل، یان بە عومەری کوڕی خەتتاب»، گوتی: وا دەرکەوت کە خۆشەویسترینیان لەلای ئەو عومەر بوو.

٧٣٩. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَأَيْتُ كَأَنِّي أُتِيتُ بِقَدَحِ لَبَنٍ فَشَرِبْتُ مِنْهُ فَأَعْطَيْتُ فَضْلِي عُمَرَ بْنَ الخَطَّابِ»، قَالُوا: فَمَا أَوَّلْتَهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ «العِلْمَ».



ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «لە خەومدا وام بینی کە پەرداخێک لە شیرم بۆ هێنرا و لێم خوارەوە، بەرماوەکەم دا بە عومەری کوڕی خەتتاب»، گوتیان: خەونەکە چۆن لێک دەدەیتەوە ئەی پێغەمبەری خوا؟ ئەویش فەرمووی: «وەرگرتنی زانست».

٧٤٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ جَالِسًا فَسَمِعْنَا لَغَطًا وَصَوْتَ صِبْيَانٍ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَإِذَا حَبَشِيَّةٌ تَزْفِنُ وَالصِّبْيَانُ حَوْلَهَا، فَقَالَ: «يَا عَائِشَةُ تَعَالَيْ فَانْظُرِي»، فَجِئْتُ فَوَضَعْتُ لَحْيَيَّ عَلَى مَنْكِبِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ إِلَيْهَا مَا بَيْنَ المَنْكِبِ إِلَى رَأْسِهِ، فَقَالَ لِي: «أَمَا شَبِعْتِ، أَمَا شَبِعْتِ»، قَالَتْ: فَجَعَلْتُ أَقُولُ لَا لِأَنْظُرَ مَنْزِلَتِي عِنْدَهُ إِذْ طَلَعَ عُمَرُ، قَالَتْ: فَارْفَضَّ النَّاسُ عَنْهَا: قَالَتْ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنِّي لَأَنْظُرُ إِلَى شَيَاطِينِ الإِنْسِ وَالجِنِّ قَدْ فَرُّوا مِنْ

عُمَرَ». قَالَتْ: فَرَجَعْتُ.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتبوو، گوێمان کە هەڵڵا و دەنگی منداڵان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا، بینیی ئافرەتێکی حەبەشی سەما دەکات و منداڵان دەورەیان لێی داوە، فەرمووی: «ئەی عائیشە، وەرە سەیر بکە»، منیش چووم و چەناگەم لەسەر شانی پێغەمبەری خوا ﷺ دانا، سەیرم دەکرد، پێمی دەفەرموو: «ئایا تێر نەبوویت، ئایا تەواو ئاسوودە نەبوویت (بەس نییە)»، منیش دەمگوت: نا، مەبەستیشم بوو پلە و ڕێزم ببینم لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ، لەو کاتەدا عومەر دەرکەوت، عائیشە گوتی: خەڵکی لە دەورەی ئافرەتەکە ڕایانکرد و بڵاوەیان لێی کرد، گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «وا دەبینم شەیتانەکانی مرۆڤ و جنۆکە لە عومەر ڕادەکەن»، عائیشە گوتی: منیش گەڕامەوە ماڵەوە.



بَابُ فِي مَنَاقِبِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ ﵁ وَلَهُ كُنْيَتَانِ، يُقَالُ: أَبُو عَمْرٍو، وَأَبُو عَبْدِ اللهِ

## باسێک دەربارەی پێگە و گەورەیی عوسمانی کوڕی عەففان ﵁، کە دوو نازناوی هەیە: ئەبو عەمرۆ و ئەبو عەبدوڵڵا

٧٤١. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ عَلَى حِرَاءَ هُوَ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَعُثْمَانُ وَعَلِيٌّ وَطَلْحَةُ وَالزُّبَيْرُ فَتَحَرَّكَتِ الصَّخْرَةُ، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «اهْدَأْ، فَمَا عَلَيْكَ إِلَّا نَبِيٌّ أَوْ صِدِّيقٌ أَوْ شَهِيدٌ».

ئەبو هورەیرە ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەشکەوتی حیراء بوو، ئەو و ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و تەلحە و زوبەیر بوون، لەناکاو بەردە گەورەکە کەوتە جووڵە و هەژان، پێغەمبەری خوا ﷺ فەمووی: «هێور ببەوە، ئەوەی لەسەرتە پێغەمبەرێک و ڕاستگۆیەک و کەسانێکی شەهیدن».

## بَابُ مَنَاقِبِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁ يُقَالُ وَلَهُ كُنْيَتَانِ: أَبُو تُرَابٍ، وَأَبُو الْحَسَنِ

## باسی پێگە و گەورەیی عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁، کە دوو نازناوی هەیە: ئەبو توڕاب و ئەبو حەسەن

٧٤٢. عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﵁: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِعَلِيٍّ ﵁: «أَنْتَ مِنِّي بِمَنْزِلَةِ هَارُونَ مِنْ مُوسَى ﵉ إِلَّا أَنَّهُ لَا نَبِيَّ بَعْدِي».

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص ﵁ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بە عەلی فەرموو: «تۆ بۆ من وەک هاڕوونی بۆ موسا ﵉، تەنها ئەوە نەبێت کە هیچ پێغەمبەرێک نییە لەدوای من».



## بَابُ مَنَاقِبِ أَبِي مُحَمَّدٍ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ ﵁

## باسی پێگە و گەورەیی ئەبو موحەممەد تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا ﵁

٧٤٣. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵄: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَنْظُرَ إِلَى شَهِيدٍ يَمْشِي عَلَى وَجْهِ الأَرْضِ فَلْيَنْظُرْ إِلَى طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِ اللَّهِ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا ﵄ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «کێ پێیخۆشە سەیری کەسێکی شەهید بکات، کە لەسەر ڕووی زەوی بڕوات، با سەیری تەلحەی کوڕی عوبەیدوڵڵا بکات».

## بَابُ مَنَاقِبِ الزُّبَيْرِ بْنِ العَوَّامِ ﵁

## باسی پێگە و گەورەیی زوبەیری کوڕی عەووام ﵁

٧٤٤. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا وَإِنَّ حَوَارِيِّي

الزُّبَيْرُ بْنُ العَوَّامِ».

عەلی ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بێگومان هەموو پێغەمبەرێک هاوەڵ و پشتیوان و دڵسۆزی هەیە، بەڕاستی پشتیوان و دڵسۆزی منیش زوبەیری کوڕی عەووامە».

## بَابُ مَنَاقِبِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفِ بْنِ عَبْدِ عَوْفٍ الزُّهْرِيِّ ﷺ

### باسی پێگە و گەورەیی عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوفی کوڕی عەوفی زوهری ﷺ

٧٤٥. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَبُو بَكْرٍ فِي الجَنَّةِ، وَعُمَرُ فِي الجَنَّةِ، وَعُثْمَانُ فِي الجَنَّةِ، وَعَلِيٌّ فِي الجَنَّةِ، وَطَلْحَةُ فِي الجَنَّةِ، وَالزُّبَيْرُ فِي الجَنَّةِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَوْفٍ فِي الجَنَّةِ، وَسَعْدٌ فِي الجَنَّةِ، وَسَعِيدٌ فِي الجَنَّةِ، وَأَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ فِي الجَنَّةِ».



عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەبو بەکر لە بەهەشتە، عومەر لە بەهەشتە، عوسمان لە بەهەشتە، عەلی لە بەهەشتە، تەلحە لە بەهەشتە، زوبەیر لە بەهەشتە، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف لە بەهەشتە، سەعد لە بەهەشتە، سەعید لە بەهەشتە، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح لە بەهەشتە».

## بَابُ مَنَاقِبِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ وَاسْمُ أَبِي وَقَّاصٍ: مَالِكُ بْنُ وَهِيبٍ

### باسی پێگە و گەورەیی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص ﷺ، ناوی ئەبو وەققاصیش: مالیکی کوڕی وەهیبە

٧٤٦. عَنْ سَعْدٍ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: «اللَّهُمَّ اسْتَجِبْ لِسَعْدٍ إِذَا دَعَاكَ».

سەعد ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ئەی خوایە وەڵامی

سەعد بدەوە، ئەگەر داوای لێت کرد».

## بَابُ مَنَاقِبِ جَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ أَخِي عَلِيٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا

### باس پێگە و گەورەیی جەعفەری کوڕی ئەبو تالیبی برای عەلی رضي الله عنهما

٧٤٧. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «رَأَيْتُ جَعْفَرًا يَطِيرُ فِي الجَنَّةِ مَعَ المَلَائِكَةِ».

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جەعفەرم بینی لە بەهەشتدا لەگەڵ فریشتەکان دەفڕی».

٧٤٨. عَنِ البَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ لِجَعْفَرِ بْنِ أَبِي طَالِبٍ: «أَشْبَهْتَ خَلْقِي وَخُلُقِي».



بەرائی کوڕی عازیب رضي الله عنه دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ بە جەعفەری کوڕی ئەبو تالیبی فەرمووە: «وێکچووترین کەس بە من تۆی لە ڕووی شێوە و ڕەوشتەوە».

## بَابُ مَنَاقِبِ أَبِي مُحَمَّدٍ الحَسَنِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ وَالحُسَيْنِ بْنِ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا

### باسی پێگە و گەورەیی ئەبو موحەممەد حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب، حوسەین کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب رضي الله عنهما

٧٤٩. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «الحَسَنُ وَالحُسَيْنُ سَيِّدَا شَبَابِ أَهْلِ الجَنَّةِ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «حەسەن و حوسەین گەورەی لاوانی بەهەشتن».

٧٥٠. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي نُعْمٍ: أَنَّ رَجُلًا مِنْ أَهْلِ العِرَاقِ سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ ﷺ عَنْ دَمِ البَعُوضِ يُصِيبُ الثَّوْبَ، فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: انْظُرُوا إِلَى هَذَا يَسْأَلُ عَنْ دَمِ البَعُوضِ وَقَدْ قَتَلُوا ابْنَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ، وَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «إِنَّ الحَسَنَ وَالحُسَيْنَ هُمَا رَيْحَانَتَايَ مِنَ الدُّنْيَا».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو نوعم دەگێڕێتەوە: پیاوێکی عێراقی پرسیاری لە ئیبن عومەر ﷺ کرد دەربارەی خوێنی مێشوولە ئەگەر بەر پۆشاک بکەوێت، ئیبن عومەر گوتی: سەیری ئەوە بکەن، پرسیار لە خوێنی مێشوولە دەکات، لە کاتێکدا کوڕی پێغەمبەری خوایان ﷺ کوشتووە، گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: «حەسەن و حوسەین هەردووکیان دەستە ڕەیحانەی منن لە دونیا».



٧٥١. عَنْ أَبِي بَكْرَةَ ﷺ قَالَ: صَعِدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ المِنْبَرَ فَقَالَ: «إِنَّ ابْنِي هَذَا سَيِّدٌ يُصْلِحُ اللَّهُ عَلَى يَدَيْهِ فِئَتَيْنِ عَظِيمَتَيْنِ».

ئەبو بەکرە ﷺ دەڵێت: جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ سەر کەوت بۆ سەر مینبەر و فەرمووی: «بێگومان ئەم کوڕەم گەورە و پایەدارە، خوای گەورە لەسەر دەستی ئەو ئاشتەوایی دەخاتە نێوان دوو کۆمەڵی گەورە».

تێبینی:

مەبەستی لەو کوڕەم حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبو تالیبە ﷺ.

٧٥٢. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ قَالَ: لَمْ يَكُنْ أَحَدٌ مِنْهُمْ أَشْبَهَ بِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ مِنَ الحَسَنِ بْنِ عَلِيٍّ.

ئەنەسی کوڕی مالیک ﷺ دەڵێت: هیچ کەس نەبووە هێندەی حەسەنی کوڕی عەلی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بچێت.

٧٥٣. عَنِ البَرَاءِ ﷺ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَبْصَرَ حَسَنًا وَحُسَيْنًا فَقَالَ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أُحِبُّهُمَا فَأَحِبَّهُمَا».

بەڕاء ﷺ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەر ﷺ حەسەن و حوسەینی بینی، جا فەرمووی: «خوایە بەڕاستی هەردووکیانم خۆش دەوێت، ئەی خوایە تۆش خۆشیانت بوێت».

٧٥٤. عَن البَرَاء بْن عَازِبٍ ﷺ يَقُولُ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَاضِعًا الحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ عَلَى عَاتِقِهِ وَهُوَ يَقُولُ: «اللَّهُمَّ إِنِّي أُحِبُّهُ فَأَحِبَّهُ».

بەڕائی کوڕی عازیب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەرم ﷺ بینی حەسەنی کوڕی عەلی لەسەر لاملی خۆی دانابوو، دەیفەرموو: «خوایە بەڕاستی حەسەنم خۆش دەوێت، تۆش خۆشت بوێت».

## بَابُ مَنَاقِبِ أَهْلِ بَيْتِ النَّبِيِّ ﷺ

## باسی پێگە و گەورەیی خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ

٧٥٥. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي حَجَّتِهِ يَوْمَ عَرَفَةَ وَهُوَ عَلَى نَاقَتِهِ القَصْوَاءِ يَخْطُبُ، فَسَمِعْتُهُ يَقُولُ: «يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّي تَرَكْتُ فِيكُمْ مَا إِنْ أَخَذْتُمْ بِهِ لَنْ تَضِلُّوا: كِتَابَ اللَّهِ، وَعِتْرَتِي أَهْلَ بَيْتِي».

جابیری کوڕی عەبدوڵلا ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی لە حەجەکەیدا لە ڕۆژی عەرەفە، لەسەر پشتی وشترەکەی (ناوی) قەصواء بوو و وتاری دەدا، گوێم لێ بوو دەیفەرموو: «ئەی خەڵکینە من دوو شت لە نێوانتان بەجێ دێڵم، ئەگەر دەستی پێوەبگرن گومڕا و سەرگەردان نابن: کتێبی خوا و ڕێچکەی خانەوادەم (ئەهلی بەیتم)».

بَابُ مَنَاقِبِ مُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، وَزَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَأُبَيٍّ،وَأَبِي عُبَيْدَةَ بْنِ الجَرَّاحِ ﭫ

## باسی پێگە و گەورەیی موعازی کوڕی جەبەل، زەیدی کوڕی سابیت، ئوبەی، ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاح ﭫ

٧٥٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﭬ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَرْحَمُ أُمَّتِي بِأُمَّتِي أَبُو بَكْرٍ، وَأَشَدُّهُمْ فِي أَمْرِ اللَّهِ عُمَرُ، وَأَصْدَقُهُمْ حَيَاءً عُثْمَانُ بْنُ عَفَّانَ، وَأَعْلَمُهُمْ بِالحَلَالِ وَالحَرَامِ مُعَاذُ بْنُ جَبَلٍ، وَأَفْرَضُهُمْ زَيْدُ بْنُ ثَابِتٍ، وَأَقْرَؤُهُمْ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَمِينٌ وَأَمِينُ هَذِهِ الأُمَّةِ أَبُو عُبَيْدَةَ بْنُ الجَرَّاحِ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﭬ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «بەسۆزترین کەس بۆ ئوممەتم لەنێو ئوممەتمدا ئەبو بەکرە، توندترینیان بۆ (جێبەجێکردنی) فەرمانی خوا عومەرە، خاوەن ڕاستگۆترین شەرم و حەیایان عوسمانە، زاناترینیان بە حەڵاڵ و حەرام موعازی کوڕی جەبەلە، زاناترینیان بە میرات زەیدی کوڕی سابیتە، چاکترینیان لە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز ئوبەی کوڕی کەعبە، بۆ هەر ئوممەتێک کەسێکی دەستپاک هەیە، دەستپاکی ئەم ئوممەتەش ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحە».

٧٥٧. عَنْ حُذَيْفَةَ بْنِ اليَمَانِ ﭬ قَالَ: جَاءَ العَاقِبُ وَالسَّيِّدُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَا: ابْعَثْ مَعَنَا أَمِينَكَ، فَقَالَ: «فَإِنِّي سَأَبْعَثُ مَعَكُمْ أَمِينًا حَقَّ أَمِينٍ»، فَأَشْرَفَ لَهَا النَّاسُ، فَبَعَثَ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الجَرَّاحِ.

حوزەیفەی کوڕی یەمان ﭬ دەڵێت: عاقیب و سەید (کە خاوەنداری نەجرانن) هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، گوتیان: کەسە ئەمیندارەکەتمان لەگەڵ بنێرە، ئەویش فەرمووی: «بێگومان دەستپاکێکی تەواو دەستپاکتان لەگەڵ دەنێرم»، هەریەک لە هاوەڵان حەزیان دەکرد ئەو کەسە ئەو بێت، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕڕاحی ڕەوانە کرد لەگەڵیان.

## بَابُ مَنَاقِبِ عَمَّارِ بْنِ يَاسِرٍ ﵄ وَكُنْيَتُهُ أَبُو الْيَقْظَانِ

باسی پێگە و گەورەیی عەمماری کوڕی یاسیر ﵄ و نازناوەکەی: ئەبو یەقزانە

٧٥٨. عَنْ عَلِيٍّ ﵁ قَالَ: جَاءَ عَمَّارٌ يَسْتَأْذِنُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «ائْذَنُوا لَهُ، مَرْحَبًا بِالطَّيِّبِ الْمُطَيَّبِ».

عەلی ﵁ دەڵێت: عەممار هات داوای ڕێپێدانی کرد لە پێغەمبەر ﷺ (بۆ لای پێغەمبەر)، ئەویش فەرمووی: «ڕێی پێ بدەن، بەخێر بێت ئەو کەسەی لە خۆیدا پاکە و پاکیی پێ دراوە».

## بَابُ مَنَاقِبِ أَبِي ذَرٍّ الْغِفَارِيِّ ﵁

باسی پێگە و گەورەیی ئەبو زەڕری غیفاری ﵁



٧٥٩. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «مَا أَظَلَّتِ الخَضْرَاءُ وَلَا أَقَلَّتِ الغَبْرَاءُ أَصْدَقَ مِنْ أَبِي ذَرٍّ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «نەبووە کەسێکی وا ئاسمان سێبەری لێ کردبێت و زەویش هەڵیگرتبێت، کە ڕاستگۆتر بێت لە ئەبو زەڕ».

## بَابُ مَنَاقِبِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ ﵁

باسی پێگە و گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود ﵁

٧٦٠. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: أَتَيْنَا عَلَى حُذَيْفَةَ ﵁، فَقُلْنَا: حَدِّثْنَا بِأَقْرَبِ

النَّاسِ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ هَدْيًا وَدَلًّا، فَنَأْخُذَ عَنْهُ وَنَسْمَعَ مِنْهُ، قَالَ: كَانَ أَقْرَبَ النَّاسِ هَدْيًا وَدَلًّا وَسَمْتًا بِرَسُولِ اللهِ ﷺ ابْنُ مَسْعُودٍ، حَتَّى يَتَوَارَى مِنَّا فِي بَيْتِهِ، وَلَقَدْ عَلِمَ الْمَحْفُوظُونَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّ ابْنَ أُمِّ عَبْدٍ هُوَ مِنْ أَقْرَبِهِمْ إِلَى اللهِ زُلْفَى.

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی یەزید دەڵێت: هاتین بۆ لای حوزەیفە ﵁، گوتمان: باسی نزیکترین کەسمان بۆ بکە لە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕووی ڕێباز و ئاکاری، بۆئەوەی هەم لێی فێر ببین و هەم گوێی لێ بگرین؟ گوتی: نزیکترین کەس لە ڕووی ڕێباز و ئاکار و خەسڵەتی چاک لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئیبن مەسعوودە، هێندە بەشەرم و حەیا بوو (جۆرێک تا ئەو ئەندازەی) خۆی لێمان دەشاردەوە لە ماڵەکەیدا، بەدڵنیایی زانراوە لەلای کەسانێک کە پارێزراون لە لادان (لە کار و گوفتار) لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، کەوا کوڕی ئوم عەبد (واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود) لە بەندە نزیکەکانە لە خوای گەورە.



٧٦١. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ﵄ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خُذُوا الْقُرْآنَ مِنْ أَرْبَعَةٍ: مِنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، وَأُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، وَمُعَاذِ بْنِ جَبَلٍ، وَسَالِمٍ مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەمر ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: قورئان لە چوار کەس وەربگرن: لە ئیبن مەسعوود و ئوبەی کوڕی کەعب و موعازی کوڕی جەبەل و سالیمی مەولای ئەبو حوزەیفە ﵃.

## بَابُ مَنَاقِبِ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْبَجَلِيِّ ﵁

## باسی پێگە و گەورەیی جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی ﵁

٧٦٢. عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ﵁ قَالَ: مَا حَجَبَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مُنْذُ أَسْلَمْتُ وَلَا رَآنِي إِلَّا ضَحِكَ.

جەریری کوڕی عەبدوڵڵا ﵁ دەڵێت: لەو کاتەوەی موسوڵمان بووم پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز دەرگای ماڵی خۆی لێ نەگرتووم، هەر کاتێکیش بینیومە بەڕوومدا پێکەنیوە (و زەردەخەنەی کردووە).

## بَابُ مَنَاقِبِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ ﵄

### باسی پێگە و گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس ﵄

٧٦٣. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﵄ قَالَ: ضَمَّنِي إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ: «اللَّهُمَّ عَلِّمْهُ الْحِكْمَةَ».

ئیبن عەبباس ﵄ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ باوەشی لێ دام، فەرمووی: «ئەی خوایە حیکمەت و تێگەیشتنی فێر بکە».



## بَابُ مَنَاقِبِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ ﵄

### باسی پێگە و گەورەیی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر ﵄

٧٦٤. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﵄ قَالَ: رَأَيْتُ فِي المَنَامِ كَأَنَّمَا بِيَدِي قِطْعَةُ إِسْتَبْرَقٍ وَلَا أُشِيرُ بِهَا إِلَى مَوْضِعٍ مِنَ الجَنَّةِ إِلَّا طَارَتْ بِي إِلَيْهِ فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ، فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَقَالَ: «إِنَّ أَخَاكِ رَجُلٌ صَالِحٌ»، أَوْ: «إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ رَجُلٌ صَالِحٌ».

ئیبن عومەر ﵄ دەڵێت: لە خەونمدا بینیم وەک بڵێیت پارچە قوماشێکی ئاوریشمم بەدەستەوە بوو، ئاماژەم بۆ هەر شوێنێک لە بەهەشت پێ کردبا بۆ ئەوێی دەفڕاندم، خەوەکەم بۆ حەفصەی خوشکم گێڕایەوە، حەفصەش بۆ پێغەمبەری خوای ﷺ گێڕایەوە، فەرمووی: «بەڕاستی براکەت پیاوێکی چاکەکارە»، یان فەرمووی: «بەڕاستی عەبدوڵڵا پیاوێکی چاکەکارە».

## بَابُ مَنَاقِبِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه

### باسی پێگە و گەورەیی ئەنەسی کوڕی مالیک رضي الله عنه

عَنْ أُمِّ سُلَيْمٍ رضي الله عنها: أَنَّهَا قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنَسٌ خَادِمُكَ ادْعُ اللَّهَ لَهُ. قَالَ: «اللَّهُمَّ أَكْثِرْ مَالَهُ وَوَلَدَهُ، وَبَارِكْ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتَهُ».

ئوم سولەیم رضي الله عنها دەگێڕێتەوە: ئەو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەنەس خزمەتکارتە، لە خوا بۆی داوا بۆ بکە، ئەویش فەرمووی: «خوایە ماڵ و منداڵی زۆر بکەیت، خێر و بەرەکەت بخەیتە ئەوەی پێت بەخشیوە».

## بَابُ مَنَاقِبِ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه

### باسی پێگە و گەورەیی ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه

٧٦٥. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَسْمَعُ مِنْكَ أَشْيَاءَ فَلَا أَحْفَظُهَا، قَالَ: «ابْسُطْ رِدَاءَكَ»، فَبَسَطْتُ، فَحَدَّثَ حَدِيثًا كَثِيرًا، فَمَا نَسِيتُ شَيْئًا حَدَّثَنِي بِهِ.

ئەبو هوڕەیرە رضي الله عنه دەڵێت: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا هەندێک شتت لێ دەبیستم بەڵام بۆم لەبەر ناکرێت، فەرمووی: «پۆشاکەکەت ڕابخە و بیکەوە»، منیش ڕامخست، فەرموودەیەکی زۆری بۆ فەرمووم، ئیدی هیچ شتێکم لەیاد نەکرد لەوەی کە بۆی باس کردم.

٧٦٦. عَنِ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنهما قَالَ: لِأَبِي هُرَيْرَةَ: يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَنْتَ كُنْتَ أَلْزَمَنَا لِرَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَأَحْفَظَنَا لِحَدِيثِهِ.

ئیبن عومەر رضي الله عنهما دەگێڕێتەوە: کە ئەو بە ئەبو هوڕەیرەی گوت: ئەی ئەبو هوڕەیرە تۆ لە هەمووومان زیاتر لە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بوویت، لە هەمووومان زیاتر

فەرمووده‌كانيت لەبەرە.

## بَابُ مَنَاقِبِ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ ﭭ

## باسی پێگە و گەورەیی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان ﭭ

٧٦٧. عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عُمَيْرَةَ ﭬ وَكَانَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: أَنَّهُ قَالَ لِمُعَاوِيَةَ: «اللَّهُمَّ اجْعَلْهُ هَادِيًا مَهْدِيًّا وَاهْدِ بِهِ».

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی ئەبو عومەیرە ﭬ کە لە هاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ بووە لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە بە موعاویەی فەرموو: «ئەی خوایە بیکەیتە کەسێکی ڕێنماییکار و ڕێنماییکراو، بیکە بە هۆکاری ڕێنماییکردن بۆ خەڵکی».



## بَابُ مَنَاقِبِ خَالِدِ بْنِ الوَلِيدِ ﭬ

## باسی پێگە و گەورەیی خالیدی کوڕی وەلید ﭬ

٧٦٨. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ قَالَ: نَزَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ مَنْزِلًا، فَجَعَلَ النَّاسُ يَمُرُّونَ، فَيَقُولُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنْ هَذَا يَا أَبَا هُرَيْرَةَ؟»، فَأَقُولُ: فُلَانٌ، فَيَقُولُ: «نِعْمَ عَبْدُ اللَّهِ هَذَا»، وَيَقُولُ: «مَنْ هَذَا؟»، فَأَقُولُ: فُلَانٌ، فَيَقُولُ: «بِئْسَ عَبْدُ اللَّهِ هَذَا»، حَتَّى مَرَّ خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ، فَقَالَ: «مَنْ هَذَا؟»، فَقُلْتُ: هَذَا خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ، فَقَالَ: «نِعْمَ عَبْدُ اللَّهِ خَالِدُ بْنُ الوَلِيدِ، سَيْفٌ مِنْ سُيُوفِ اللَّهِ».

ئەبو هوڕەیرە ﭬ دەڵێت: لە شوێنێک لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دابەزین، خەڵکی دەهاتن و تێپەڕ دەبوون، پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: «ئەوە کێیە ئەی ئەبو هوڕەیرە؟»، منیش دەمگوت: ئەوە فڵان کەسە، دەیفەرموو: «باشترین بەندەی خوایە»، دەیفەرموو: «ئەوە کێیە؟»، دەمگوت: ئەوە فڵانە، دەیفەرموو: «ئەوە خراپترین بەندەی

خوایە»، هەتا کاتێک خالیدی کوڕی وەلید تێپەڕ بوو، فەرمووی: «ئەوە کێیە؟»، گوتم: ئەوە خالیدی کوڕی وەلیدە، فەرمووی: «باشترین بەندەی خوا خالیدی کوڕی وەلید، شمشێرێکە لە شمشێرەکانی خوا».

## بَابُ مَنَاقِبِ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ رضي الله عنه

### باسی پێگە و گەورەیی سەعدی کوڕی موعاز رضي الله عنه

٧٦٩. عَنِ البَرَاءِ رضي الله عنه قَالَ: أُهْدِيَ لِرَسُولِ اللَّهِ ﷺ ثَوْبُ حَرِيرٍ فَجَعَلُوا يَعْجَبُونَ مِنْ لِينِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَعْجَبُونَ مِنْ هَذَا؟ لَمَنَادِيلُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ فِي الجَنَّةِ أَحْسَنُ مِنْ هَذَا».

بەڕاء رضي الله عنه دەڵێت: پۆشاکێکی ئاوریشم بە دیاری هێنرا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، خەڵکی بە نەرمییەکەی تووشی سەرسوڕمان بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەمەتان لەلا سەیرە؟ بەدڵنیایی دەستەسڕی سەعدی کوڕی موعاز لە بەهەشتدا زۆر چاکترە لەو ئاوریشمە».

٧٧٠. عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنه يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ، وَجِنَازَةُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ: «اهْتَزَّ لَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ».

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا رضي الله عنه دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لە کاتێکدا کە تەرمی سەعدی کوڕی موعاز لەژێر دەستیان بوو، دەیفەرموو: «عەرشی خوا بۆی هاتە هەژان».

٧٧١. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه قَالَ: لَمَّا حُمِلَتْ جَنَازَةُ سَعْدِ بْنِ مُعَاذٍ قَالَ المُنَافِقُونَ: مَا أَخَفَّ جَنَازَتَهُ، وَذَلِكَ لِحُكْمِهِ فِي بَنِي قُرَيْظَةَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّ المَلَائِكَةَ كَانَتْ تَحْمِلُهُ».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: کاتێک جەنازەی سەعدی کوڕی موعاز هەڵگیرا، دووڕووەکان دەیانگوت: جەنازەکەی چەند سووکە؟ دیارە بەهۆی بڕیارەکەی بوو سەبارەت بە نەوەی قوڕەیزە (دووڕووەکان بڕیارەکەیان پێناخۆش بوو)، ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: «سووکی جەنازەکەی بەهۆی ئەوەیە فریشتەکان بەشداری هەڵگرتنی دەکەن».

## بَابُ مَنَاقِبِ الْبَرَاءِ بْنِ مَالِكٍ ﵁

### باسی پێگە و گەورەیی بەڕائی کوڕی مالیک ﵁

٧٧٢. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﵁ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « كَمْ مِنْ أَشْعَثَ أَغْبَرَ ذِي طِمْرَيْنِ لَا يُؤْبَهُ لَهُ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لَأَبَرَّهُ مِنْهُمُ الْبَرَاءُ بْنُ مَالِكٍ».



ئەنەسی کوڕی مالیک ﵁ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «چەند کەسی وا هەیە قژی قژن و تۆزاوییە، خاوەن دوو پارچە پۆشاکی کۆنە، هیچ بایەخی پێ نادرێت لەلای خەڵک، بەڵام ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات ئەوە خوا بۆی دەهێنێتە جێ، لەوانەش بەڕائی کوڕی مالیکە».

## بَابُ مَنَاقِبِ أَبِي مُوسَى الْأَشْعَرِيِّ ﵁

### باسی پێگە و گەورەیی ئەبو مووسای ئەشعەری ﵁

٧٧٣. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: «يَا أَبَا مُوسَى لَقَدْ أُعْطِيتَ مِزْمَارًا مِنْ مَزَامِيرِ آلِ دَاوُدَ».

ئەبو مووسا ﵁ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «ئەی ئەبو مووسا بەڕاستی دەنگ و سەدایەک لە دەنگ و سەدا خۆشەکانی بنەماڵەی داودت پێ دراوە».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ مَنْ رَأَى النَّبِيَّ ﷺ وَصَحِبَهُ

### باسی پێگە و گەورەیی ئەو کەسەی پێغەمبەری ﷺ بینیوە و هاوەڵیی کردووە

٧٧٤. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ، ثُمَّ يَأْتِي قَوْمٌ بَعْدَ ذَلِكَ تَسْبِقُ أَيْمَانُهُمْ شَهَادَاتِهِمْ أَوْ شَهَادَاتُهُمْ أَيْمَانَهُمْ».

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «چاکترین خەڵک خەڵکی ڕۆژگاری منە، پاشان ئەوانەی لەدوای ئەوان دێن، پاشان ئەوانەی لەدوای ئەوان دێن، ئینجا جۆرە خەڵکێک لەدوای ئەوانەوە دێت، سوێندخواردنیان پێش شایەتیدانیان دەکەوێت، یان شایەتیدانیان پێش سوێندیان دەکەوێت (واتە: سوێند و شایەتیدانیان بەیەکەوەیە بەهۆی لەدەستدانی متمانە و بایەخینەدان پێی)».



## بَابٌ فِي فَضْلِ مَنْ بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ

### باسێك دەربارەی پێگە و گەورەیی ئەوانەی لەژێر دارەکە بەڵێنیان دا

٧٧٥. عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «لَا يَدْخُلُ النَّارَ أَحَدٌ مِمَّنْ بَايَعَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ».

جابیر رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «ناچنە نێو ئاگر هیچ کەسێک لەوانەی لەژێر دارەکە بەڵێنیان دا (بە پێغەمبەر خوا ﷺ)».

## بَابُ فِيمَنْ سَبَّ أَصْحَابَ النَّبِيِّ ﷺ

### باسێک دەربارەی ئەو کەسەی جوێن دەدات بە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ

٧٧٦. عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الخُدْرِيِّ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا أَدْرَكَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ».

ئەبو سەعیدی خودری ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «جوێن مەدەن بە هاوەڵانم، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر یەکێکتان بەئەندازەی چیای ئوحود زێڕ ببەخشێت، لە ڕێز و پاداشت ناگاتە پلەی بەخشینی مشتێکی ئەوان، بەڵکوو ناگاتە نیوەشی».

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ فَاطِمَةَ ﷺ

### باسی ئەوەی هاتووە دەربارەی پێگە و گەورەیی خاتوو فاتیمە ﷺ

٧٧٧. عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ ﷺ: أَنَّ عَلِيًّا ﷺ ذَكَرَ بِنْتَ أَبِي جَهْلٍ، فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: «إِنَّمَا فَاطِمَةُ بِضْعَةٌ مِنِّي يُؤْذِينِي مَا آذَاهَا وَيُنْصِبُنِي مَا أَنْصَبَهَا».

عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر ﷺ دەگێڕێتەوە: عەلی ﷺ باسی کچی ئەبو جەهلی کردووە (بۆ هاوسەرگیری)، ئەو باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر ﷺ، فەرمووی: «بەڕاستی فاتیمە بەشێکە لە من، ئەوەی ئەو ئەزیەتی پێوە دەبینێت منیش ئەزیەت دەدات، ماندووم دەکات ئەوەی ئەو پێوەی ماندوو دەبێت».

## بَابُ فَضْلِ خَدِيجَةَ ﵂

### باسی پێگە و گەورەیی خاتوو خەدیجە ﵂

٧٧٨. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: مَا حَسَدْتُ امْرَأَةً مَا حَسَدْتُ خَدِيجَةَ، وَمَا تَزَوَّجَنِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِلَّا بَعْدَ مَا مَاتَتْ، وَذَلِكَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بَشَّرَهَا بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لَا صَخَبَ فِيهِ وَلَا نَصَبَ.

عائیشه ﵂ دەڵێت: حەسوودیم بە هیچ ئافرەتێک نەبردووە هێندەی حەسوودیم بە خەدیجە بردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ هاوسەرگیری لەگەڵدا نەکردم هەتا ئەو کۆچی دوایی کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ مژدەی پێ دابوو بە خانوویەک لە بەهەشتدا کە لە مرواریییە، هاوار و دەنگە دەنگ و ئەزیەت و ماندووبوونیشی تێدا نییە.

٧٧٩. عن عَلِيّ بْن أَبِي طَالِبٍ ﵁ يَقُولُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: «خَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ وَخَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ بْنَتُ عِمْرَانَ».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ دەڵێت: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: «چاکترین ئافرەتی بەهەشت خەدیجەی کچی خوەیلیدە، چاکترین ئافرەتی بەهەشت مەریەمی کچی عیمرانە».

## بَابُ مِنْ فَضْلِ عَائِشَةَ ﵂

### باسی پێگە و گەورەیی عائیشە ﵂

٧٨٠. عَنْ عَائِشَةَ ﵂ قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «يَا عَائِشَةُ هَذَا جِبْرِيلُ وَهُوَ يَقْرَأُ عَلَيْكِ السَّلَامَ»، قَالَتْ: قُلْتُ: وَعَلَيْهِ السَّلَامُ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، تَرَى مَا لَا نَرَى.

عائیشە ﵂ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئەی عائیشە ئەوە جیبریلە

سڵاوت لێ دەکات»، عائیشە دەڵێت: گوتم: سڵاو و سۆز و بەرەکەتی خوا لەویش بێت، تۆ شتێک دەبینیت کە ئێمە نایبینین.

٧٨١. عَنْ أَبِي مُوسَى ﵁ قَالَ: مَا أَشْكَلَ عَلَيْنَا أَصْحَابَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَدِيثٌ قَطُّ فَسَأَلْنَا عَائِشَةَ إِلَّا وَجَدْنَا عِنْدَهَا مِنْهُ عِلْمًا.

ئەبو مووسا ﵁ دەڵێت: هەر کاتێک تێکەڵبوونێک (ناڕوونییەك)مان هەبووبێت دەربارەی فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ و پرسیارمان لە عائیشە کردبێت، بە دڵنیایی لای ئەو دەربارەی فەرموودەکە شتێکمان دەست کەوتووە.

## بَابُ مَا جَاءَ فِي فَضْلِ الْمَدِينَةِ

## باسی پێگە و گەورەیی شاری مەدینەی پیرۆز



٧٨٢. عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ ﵁ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ حَتَّى إِذَا كَانَ بِحَرَّةِ السُّقْيَا الَّتِي كَانَتْ لِسَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «ائْتُونِي بِوَضُوءٍ»، فَتَوَضَّأَ ثُمَّ قَامَ فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَقَالَ: «اللَّهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ كَانَ عَبْدَكَ وَخَلِيلَكَ وَدَعَا لِأَهْلِ مَكَّةَ بِالْبَرَكَةِ، وَأَنَا عَبْدُكَ وَرَسُولُكَ أَدْعُوكَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ أَنْ تُبَارِكَ لَهُمْ فِي مُدِّهِمْ وَصَاعِهِمْ مِثْلَيْ مَا بَارَكْتَ لِأَهْلِ مَكَّةَ مَعَ الْبَرَكَةِ بَرَكَتَيْنِ».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﵁ دەڵێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەرچووین تا گەیشتینە حەڕەتی سوقیا، کە موڵکی سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «ئاوی دەستنوێژم بۆ بێنن»، دەستنوێژی شوشت، هەستا و ڕووی کردە قیبلە، فەرمووی: «خوایە ئیبراهیم بەندە و خۆشەویستت بوو، دوعای کرد بۆ مەککە کە پیرۆز و پڕ خێر بێت، منیش بەندە و نێردراوی تۆم، داوات لێ دەکەم بۆ خەڵکی مەدینە، کە بەرەکەت بخەیتە نێو مشت و پێوانەیان، دوو ئەوەندەی کە خێر و بێرت داوە بە خەڵکی مەککە، لەگەڵ هەر خێر و بێرێک دوو خێر و بێری دیکەی لەگەڵ بێت».

٧٨٣. عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَأَبِي هُرَيْرَةَ ﭫ قَالَا: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ».

عەلی کوڕی ئەبو تالیب و ئەبو هوڕەیرە ﭫ دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «نێوان ماڵی من و مینبەرەکەم مێرگێکە لە مێرگەکانی بەهەشت».

٧٨٤. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﭬ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «صَلَاةٌ فِي مَسْجِدِي هَذَا خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ صَلَاةٍ فِيمَا سِوَاهُ مِنَ الْمَسَاجِدِ إِلَّا الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ».

ئەبو هوڕەیرە ﭬ لە پێغەمبەرەوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: «نوێژێك لەو مزگەوتەی من باشترە لە هەزار نوێژ لە مزگەوتەکانی دیکە جگە لە مزگەوتی حەڕام (کە نوێژێك لەوێدا بەرانبەرە بە سەد هەزار نوێژ)».

٧٨٥. عَنِ ابْنِ عُمَرَ ﭭ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «مَنِ اسْتَطَاعَ أَنْ يَمُوتَ بِالْمَدِينَةِ فَلْيَمُتْ بِهَا، فَإِنِّي أَشْفَعُ لِمَنْ يَمُوتُ بِهَا».



ئیبن عومەر ﭭ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «هەر کەسێک دەتوانێت لە مەدینە بمرێت، با هەر لەوێ بمرێت (لەوێ بمێنێتەوە هەتا دەمرێت)، چونکە بەڕاستی من شەفاعەت دەکەم بۆ هەر کەسێک کە لە مەدینە بمرێت».

٧٨٦. عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﭬ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ طَلَعَ لَهُ أُحُدٌ، فَقَالَ: «هَذَا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ، اللَّهُمَّ إِنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ وَإِنِّي أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا».

ئەنەسی کوڕی مالیک ﭬ دەگێڕێتەوە: پێغەمبەری خوا ﷺ چیای ئوحودی بۆ دەرکەوت و بینیی، فەرمووی: «ئەمە چیایەکە ئێمەی خۆش دەوێت و ئێمەش ئەومان خۆش دەوێت، خوایە بێگومان ئیبڕاهیم سنووری قەدەغەکراوی مەککەی داناوە، منیش سنووری قەدەغەکراوی مەدینە دادەنێم، کە لە نێوان هەردوو لای زەوی بەردە ڕەشەکانە (کە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای مەدینەیە)».

## بَابٌ فِي فَضْلِ مَكَّةَ

### باسێک دەربارەی پێگە و گەورەیی مەککەی پیرۆز

٧٨٧. عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَدِيِّ بْنِ حَمْرَاءَ رضي الله عنه قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ وَاقِفًا عَلَى الحَزْوَرَةِ فَقَالَ: «وَاللَّهِ إِنَّكِ لَخَيْرُ أَرْضِ اللَّهِ، وَأَحَبُّ أَرْضِ اللَّهِ إِلَى اللَّهِ، وَلَوْلَا أَنِّي أُخْرِجْتُ مِنْكِ مَا خَرَجْتُ».

عەبدوڵڵای کوڕی عەدی کوڕی حەمڕاء رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی وەستابوو لەسەر گردی حەزوڕە (گردێکی بچووکە لە مەککە)، فەرمووی: «سوێند بە خوا چاکترین زەوی خوایت، خۆشەویستترین زەوی خوایت لەلای خوا، ئەگەر منیان دەرنەکردبا، ئەوە دەرنەدەچووم».

٧٨٨. عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنهما قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِمَكَّةَ: «مَا أَطْيَبَكِ مِنْ بَلَدٍ، وَأَحَبَّكِ إِلَيَّ، وَلَوْلَا أَنَّ قَوْمِي أَخْرَجُونِي مِنْكِ مَا سَكَنْتُ غَيْرَكِ».

ئیبن عەبباس رضي الله عنهما دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ (کاتێك لە مەککە دەرکرا و ناچار بە کۆچکردن کرا) بە مەککەی فەرموو: «چەند وڵاتێکی پاکی، خۆشەویسترینی لەلام، ئەگەر خەڵکەکەم منیان دەرنەکردبایە، لە هیچ شوێنێکی دیکە جگە لە تۆ نیشتەجێ نەدەبووم».

## بَابٌ فِي فَضْلِ اليَمَنِ

### باسێک دەربارەی پێگە و گەورەیی شام (و پێگەی خەڵکی) یەمەن

٧٨٩. عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «أَتَاكُمْ أَهْلُ اليَمَنِ، هُمْ أَضْعَفُ قُلُوبًا، وَأَرَقُّ أَفْئِدَةً، الإِيمَانُ يَمَانٍ، وَالحِكْمَةُ يَمَانِيَةٌ».

ئەبو هوڕەیرە ﷺ دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: «خەڵکی یەمەن هاتوونە لاتان، ئەوان کەسانێکی دڵنەرم و بەسۆزن، ئیمانی تەواو ئیمانی خەڵکی یەمەنە، تێگەیشتنی تەواو تێگەیشتنی خەڵکی یەمەنە».

٧٩٠. عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ ﷺ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ نُؤَلِّفُ الْقُرْآنَ مِنَ الرِّقَا ع، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: «طُوبَى لِلشَّامِ»، فَقُلْنَا: لِأَيٍّ ذَلِكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: «لِأَنَّ مَلَائِكَةَ الرَّحْمَنِ بَاسِطَةٌ أَجْنِحَتَهَا عَلَيْهَا».

زەیدی کوڕی سابیت ﷺ دەڵێت: لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووین، قوڕئانمان دەنووسیەوە لەسەر پارچە پێستێک، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: «موژدە لە شام بێت»، گوتمان: لەبەرچی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: «چونکە فریشتەکانی خوا باڵی خۆیان کێشاوە بەسەریدا».



الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات

# نێوەڕۆك